زنجیرەی کەڵەپیاوانی ئیسلام
4

إبراهيم محمد العلي

# شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە



## سوارچاکی مەیدانی بانگەوازو چاکسازی

چاپی دووەم




وەرگێڕانی
حەسەن بابەکر

التفسير



شەیخی ئیسلام

# ئیبنو تەیمییە

سوارچاکی مەیدانی بانگەواز و چاکسازیی


**نووسینی**

إبراهيم محمد العلي

**وەرگێڕانی**

حەسەن بابەکر

**مامۆستا عەلی باپیر**

پێیداچۆتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە






# شەیخی ئیسلام
# ئیبنو تەیمییە
## سوارچاکی مەیدانی بانگەواز و چاکسازیی

**نووسـینـی**
إبراهيم محمد العلي

**وەرگێڕانی**
حەسەن بابەکر

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بـەرگ**
نەوەی شەهکاوانی

**خـــەت**
نـەوزاد کۆیـی

**قەبارەی کتێب**
٢٤×١٧- ( ٣٠٧ ) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
دووەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز

**تـــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی (٢٩١٨) ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

## پێشکەش بۆ



**١ـ بەهەموو ئەوانەی (دین)، تەنیا لەقورئان و سوننەتدا دەبینن و ڕاو بۆچوونی زانایان، بەتێگەیشتن لە (دین) دەزانن.**

**٢ـ بەوانەی دەمارگیرییان بۆهیچ زاناو مەزهەبێك نیەو، کەسەکان بەهۆی هەقەوە دەناسن، نەك هەق بەهۆی کەسەکانەوە.**

**٣ـ بەوانەی بەهیچ پاساوێك خۆیان بێ بەش ناکەن لە زانیاری فراوانی(شیخ الاسلام) و زانایانی دیکەی بەرجەستەو، تفەنگ بە تاریکی یەوە نانێن.**



# ئـەم کتێبـە

ئەم کتێبە کە لەلایەن (ابراهیم محمد العلي) بە زمانی عەرەبی و بەناونیشانی (شیخ الاسلام احمد بن تیمیة، رجل الاصلاح والدعوة) نووسراوە، باس لە ژیان و بەسەرهات و ئاستی شارەزایی و پلەی بەرزی زانستی ناوبراو دەکات و، روونی دەکاتەوە کە (ابن تیمیة)ی حەڕڕانی چ دەور و کاریگەرییەکی گرنگی هەبووە لە کۆمەڵگادا و چۆن بە تێڕوانینێکی فراوانەوە فەرمانی بە چاکە و رێگریی لە خراپە کردوە و لە مەیدانی جیهاد و بەرەنگاربوونەوەدا لە دژی تەتار جەنگاوە و خاوەنی ئازایەتی و نەبەردی بووە.

وە باس لەوە دەکات کە (شیخ الاسلام) هەرچەندە لە سەرەتای تەمەنیەوە لە چوارچێوەی مەزهەبی حەنبەلیدا بووە بەڵام دواتر وەك موجتەهیدێکی رەها دەرکەوتووە و بە داکۆکیکار لە قورئان و سوننەت لەقەڵەمدراوە و دژی لاسایی کردنەوەی کوێرانە و دەمارگیریی مەزهەبی بووە، وێڕای ئەوە کەسێکی هەقگۆ و پارێزکار بووە و هەرشتێك بەراستی زانیبێ گوتویەتی و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساوە و لەبەرانبەر پیڕ و تاقم و مەزهەبە لادەرەکانیش کە مایەی زیان بوون بۆ ئیسلام قسەی خۆی کردوە و لە ژێر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا بەرەنگاریان بۆتەوە.

ئەم کتێبە روونی دەکاتەوە کەناوبراو لەزۆر بواری وەك: (تەفسیر، حەدیس، فیقهو ئوصول و.....) زۆرشارەزابووە و زانایانی سەردەمی خۆی ئەمەیان سەلماندوەو سوودیان لێ بینیوە و پێی سەرسام بوون. دوای خۆشی دەیان بەرهەمی بەپێزی



جێهێشتووە، کەمایەی بەهرەمەندبوونی مسوڵمانانن بە درێژایی زەمان و بە پانتایی زەمین.

هەربۆیە بە مەبەستی ناسینی زیاتر و سوود وەرگرتن لەبەرهەمەکانیی لە لایەن مامۆستایان و خوێندەوارانی دیکەی کوردزمانەوە، ئەم کتێبەم بە دەستکاریەکی کەمەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بۆجارێکی دیکە بەدەستکاریەوە چاپی دەکەینەوە.

حسن بابکر

هەولێر

٢٠١٥/٨/١٠



# پێشەکی

الحمدلله والصلاة والسلام والبركات على رسول الله محمد
وآله المهتدين بهداه.

**خوێنەری سەنگین و خۆشەویست:**

ئیبنوتەیمییەی حەڕڕانی کە لەلایەن زانایانی ڕۆژگاری خۆیەوە نازناوی (شيخ الإسلام)ی پێدراوە، کەوا پێدەچێ ئەوکات چەمك و واتای (مَرجِع)ی گەیاندبێ و، لە واقیعیشدا ئەو کەڵە زانایە لە ڕۆژگای خۆیدا و ئیستاش لەگەڵ دابێ، یەکێکە لەو کەمە زانا و پێشەوایانەی ئیسلام و مسوڵمانان، کە مسوڵمانان بۆ کردنەوەی زۆر گرێ کوێرەی بوار و لایەنی دینداری یان، بۆ لایان گەڕاونەوە و لە فتوا و بیر و بۆچون و ڕێنماییەکانیان بەهرە مەند بوون.

**پێشم وایە هۆکاری کۆن نەبوون و بەتەڕ و تازەیی و زیندوێتیی مانەوەی بەرهەمە فکریی یەکانی ئیبنوتەیمییە، سێ هۆکاری سەرەکیین:**

**یەکەم:** پشت بەستنی بە بەڵگەی قورئان و سوننەت.

**دووەم:** شارەزایی ورد بە واقیعی کۆمەڵگا و تەوژمە فکریی یەکانی.

**سێیەم:** یەکلایی بوونەوەی بۆ ناسینی هەق و ڕاستیی و دووریی لە دەمارگیریی مەزهەبیی (التعصب المذهبي).



دیارە هەرکام لەو سێ هۆکارەش ئەگەر بمانەوێ ڕوونیان بکەینەوە لە دووتوێی بەرهەمەکانی ئەو زانا ڕەند و ناوازەیەدا، دەتوانین چەندان نموونەیان وەك بەڵگە لەسەر بێنینەوە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێم وانیە هیچکەس مشت و مڕی لەوبارەوە هەبێ، بەپێویستی نازانم و ئەوەندە دەڵێم کە:

هەرکەسێك بیەوێ بیر و بۆچوونەکانی بڕشت و هێز و پێزیان هەبێ و، وەك تیغی مەعدەن خراپ ژەنگ نەهێنن و لەکار نەکەون، دەبێ هەرکام لەو سێ مەرجانەی تێدا ڕەچاو بکات.

١- هیچ قسە و بیر و ڕایەك وەك شتێکی ئایینی نەخاتە ڕوو کە پشت ئەستوور نەبێ بە ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت.

٢- وەهەرشتێك دەڵێ پاش سەرنجلێدانی واقیع و ناسینی و پێ ئاشنابوونی بێ، نەك بەبێ شارەزایی لە واقیع و لێتێگەیشتنی، قسەی لەبارەوە بکات و تفەنگ بە تاریکایی یەوە بنێ!

٣- وە هەتا دەتوانێ خۆی لە قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوە و، بڕیاردانی پێش وەخت و، دەمارگیریی و لایەنگیریی بۆ ئەم و ئەو، بەدووربگرێ.

بەڵێ کاتێك سەرنجی کتێب و فتواکانی ئیبنوتەیمییە دەدەین دەبینین:

مەگەر چۆن دەنا هەرکاتێك قسەی کردبێ، چەندان ئایەت و دەقی سوننەتی ڕیزکردوون و بەبەڵگەی هێناونەوە و، بەزمانێکی گشتی ئاسانی وا کە هەموو کەس لێ ی تێبگات، چەمك و واتایەکانیان و چۆنیەتی دەلالەتیانی ڕوون کردۆتەوە.

هەروەها بەبێ شارەزایی قوڵ و فراوان لە بارەی واقیعی ئەو بیرۆکە و بۆچوونانەوە، کە ویستوویەتی قسەیان لەسەر بکات، قسەی لەبارەوە نەکردوون، وەك لە کتێبی: (مناهج السنة النبوية) و کتێبی: (الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح) و کتێبی: (الرد على المنطقيين) دا وەك ڕۆژی ڕوون دیارە.

وەهەتا ڕاددەیەکی زۆر خۆی لە دەمارگیریی مەزهەبیی دوورگرتوە و، هەرچەندە حەنبەلی مەزهەب بووە- بەتایبەت لە سەرەتای تەمەنییەوە-، بەڵام

هەرکات بەڵگەی پێچەوانەی مەزهەبی ئەحمەد بوویێ، شوێن بەڵگە کەوتوە. هەڵبەتە ئیبنوتەیمییە وێڕای زانایەتیی، پیاوێکی زۆر خوا پەرست و پارێزکار و ڕەوشت بەرزیش بووە و، بە پێچەوانەی حاڵی بوونی کەسانێکی ناحاڵی لە ئەهلی تەصەووفەوە، بەرهەمەکانی بەڵگە و شاهێدی ئەوەن کە لەبواری تەزکییەی نەفس دا خاوەنی پشك و بەشێکی گەورە بووە!

ئنجا وێڕای ئەوەش ئەو کەڵە زانایە هەتا بڵێی بوێر و ئازا و هەق بێژ بووە، چی بە هەق و ڕاست زانیبێ، لە گوتنی نەسڵەمیوەتەوە، لەسەر ئەوەش باجی زۆری داوە، چونکە بەداخەوە لە ڕۆژگاری ویدا، ئۆممەتی ئیسلام نوقمی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی (التقلید الأعمی) و، دەمارگیریی (التعصب) جۆراوجۆر و، بە پیرۆزگرتنی قسە و بیروڕای پێشووان (تقدیس أقوال و آراء الأسلاف) و، دەیان دەردی دیکەی کوشندە بوو بوو، بۆیە قسە و بیر و ڕاکانی ئەو پێشەوایە کە پێیان زۆر پێش خەڵکی ڕۆژگاری خۆی کەوتبۆوە، بە زۆربەی زانایانی قسەڕۆیشتووی نزیك حوکمڕانانی ئەو ڕۆژگارە هەزم نەدەکران و، نەدەگەیشتنە ئاستی بەرزی ئەو زانا پایە بەرزە. ئنجا ئەوەشمان بیر نەچێ کە ئیبنوتەیمییە لەبواری جەنگ و جیهاد و بەرەنگارییش دا، شۆڕە سوارێکی دیار بووە و جەنگاوەرێکی کارا و ئازا بووە و، ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە لە جەنگ دژی تەتەر و مەغۆلە دڕندەکان دا، کە سەرەنجام تێ شکاون و هاندان و موژدە پێدانی ئەو زانا موجاهیدەش بە سەرکەوتنی مسوڵمانان، پارسەنگێکی قورس و یەکلاکەرەوەی جەنگ و بەرنگاربوونەوەکە بووە.

هەڵبەتە من نامەوێ لەو چەند دێڕەدا کە وەك پێشەکی دەیاننووسم، باسی ئیبنوتەیمییە و ئاکار و هەڵوێستەکانی بکەم، کە ئەم کتێبەی بەردەستت کە برای زێدە بەڕێز و دڵسۆزم مامۆستا (حەسەن بابەکر) لە عەرەبییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، بۆ ئەوە تەرخانکراوە، بەڵکو تەنیا مەبەستم ئاماژە کردن بوو بەچەند لایەنێکی گرنگی کەسایەتی ئیبنوتەیمییەی حەڕڕانی خوا لێ ی خۆش بێ، کە زۆر کەس لافی خۆشەویستی و شوێنکەوتنی لێ دەدات و، هەیە هەر دەیەوێ لەسەر خۆی و هاومەشرەبەکانی یان هاو ناوونیشانەکانی قۆرخی



بکات! بەڵام بێگومان عیبرەت بە هەڵوێست و کردارە، نەك لاف لێدان و شیعار! ئەم کتێبەش کە لە ئەسڵدا بەزمانی عەرەبی نووسراوە و مامۆستا حەسەن بابەکر بە دەستکارییەکی کەمەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و منیش لەقەدەر حاڵ و بۆ لوانی خۆم پێیدا چوومەتەوە، کتێبێکی بەنرخە بۆ ناساندنی ئیبنوتەیمییە بە خوێنەری کورد زمان و ئاشنابوونی بەو کەسایەتییە گەورەی ئیسلام، کە زۆر لە مێژوونووسان ڕەچەڵەکی دەبەنەوە سەر گەلە بێ قەوارە و ناوونیشانەکەی خۆمان (کورد)، هیچ گومانیشی تێدا نیە کە هەرچی چاکە و خێرێك کە لە ئیبنوتەیمییە و هەر زانا و پێشەوایەکی دیکەی ئیسلام دا هەیە، دڵۆپێکە لە دەریای بێ سنووری ئیمان و ئیسلام. وەك شاعیرێکی فارس گوتوویەتی:

بلبل أز فیض گل آموخت سخن ورنه نبود　　　إین همه قول وغزل تعبیه درمنقارش

واتە: بولبول لە بەخششی گوڵەوە فێری قسە کردن بوو، ئەگەرنا ئەو هەموو قسە و شیعرە لە دەنووکیدا کۆنەبوو بۆوە!

دەستخۆشی لە مامۆستا (حەسەن بابەکر) دەکەم و خوای بەخشندە بەرەکەت و پێزی زیاتر بخاتە عەقل و دڵ و قەڵەمییەوە.

شەوی (١٠)ی محرم (١٤٣٤)ی کۆچی
(٢٤)ی تشرینی دووەم (٢٠١٢)ی زاینی هەولیر
عەلی باپیر

# پێشەکی نووسەر

ان الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، وبعد:

زانیاری وەك ئاو وایە بۆ ژیان، ئەو كەسە سوودی لێ دەبینێ كە كاری پێدەكات و، ئەو كەسەش بەهیلاك دەچێ كە كاری پێ ناكا. خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا مەدحی ئەهلی عیلم و زانایانی كردوە، بۆ نموونە: دەفەرموێ:

﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ﴾ المجادلة (١١)

واتە: خوا پلەو پایەی ئیمانداران لە ئێوە بەرز دەكاتەوە، بەڵام ئەوانەی خاوەن عیلم و زانستن بە چەند پلەیەك زیاتر.

وە بەرزیی پلەوپایەی زانایانی باس كردوە، كاتێك ناوی ئەوانی لەگەڵ ناوی خۆی و فریشتەكانی هێناوە، كە دەفەرموێ:

﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ال عمران (١٨).

وە لە خەڵكی دیكە جیای كردوونەوە كە دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ الزمر(٩).

واتە: بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن وەك یەكن؟ وە باسی ئەوەی كردوە كە زۆربەی ئەوانەی بە شێوەیەكی ڕاست لە نیشانە و بەڵگە كەونی و سروشتییەكان و ئەو ئایەتانەی نێردراونەتە سەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)



دەگەن و دەفامن، زانایانن، وەك دەفەرموێ:

﴿وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ﴾ العنكبوت (٤٣).

سەبارەت بە مەدحی زانایان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە زۆر شوێن لە سوننەتی صەحیحی خۆی دا باسی کردوە، بۆ نموونە:

(عن ابي الدرداء (رضى الله عنه) قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ((من سلك طريقاً يطلبُ فيه علماً، سلك الله به طريقاً الي الجنة، وان الملائكة لتضع أجنحتها رضاءً لطالب العلم، وان العالم يستغفر له من في السموات ومن في الأرض حتى الحيتان في البحر وان فضل العالم على العابد كفضل القمر ليلة البدر على سائر الكواكب)). رواه الترمذى و صححه الالبانى.

- ((إنما العلماء هم ورثة الانبياء، وإن الانبياء لم يورثوا ديناراً ولا درهماً وإنما ورثوا العلم، فمن أخذه أخذ بحظ وافر)). اخرجه الترمذي ٢٦٨٢ وابن ماجه ٢٢٣ وصححه الالبانى..

واتە: زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە بێگومان پێغەمبەران دینار و درهەمیان نەکردۆتە میراتی خۆیان، بەڵکو زانیاریان بەمیرات بەجێ هێشتوە، هەرکەسێك زانیاری بە میرات بگرێ، بەش و پشکی زۆری گرتوە.

وە (أبو مسلم الخولاني) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: زانایان لە زەوی دا وەکو ئەستێرەکانی ئاسمان وان، ئەگەر دەرکەون بۆ خەڵکی بەوان ڕێنمایی دەکرێن، وە ئەگەر لێیان ون بوون سەرگەردان دەبن.

وە (سفيان بن عيينة) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (أرفع الناس عند الله منزلة من كان بين الله وبين عباده، وهم الأنبياء والعلماء)[1]. واتە: بەرزترین کەس لە پلەو پایەدا لای خوا ئەوانەن کە لە نێوان خواو بەندەکانی دان، کە پێغەمبەران (عليهم السلام) و زانایانن.

---

(١) تذكرة السامع والمتكلم ٣٤- ٣٥.

قسەکردن لەسەر گەورەیی عیلم و زانست و ئەو پلەو پایەی قوتابی و داواکارانی زانست لەلای خوا هەیانە، شتێکی زانراوو ئاشکراو ڕوونە، بەڵام باسکردنی لێرەدا تەنیا بۆ بیرخستنەوەیە.

زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) لەپێناو وەدەستخستنی زانیاری دا شەوو ڕۆژیان بەیەکەوە گرێ داون، لە پێناو لێکۆڵینەوە لە وشەی حەدیسێك چەندین ڕێی دووریان بڕیون و ماندوو بوونیان چەشتوە، بە پشت بەستن بەخوا ڕێی سەختیان بڕیوە، ئەوان بەمەبەستی کار پێ کردن و ڕەزامەندیی خوا، هەوڵی بەدەستهێنانی زانیارییان داوە، وەك (الخطیب البغدادي) لە ئامۆژگارییەکی دا بۆ قوتابیانی زانستەکان دەیگوت: (ئەی شەیدای زانست و زانیاری، ئامۆژگارییت دەکەم کە نیەتت یەکلاو ساغ بکەیەوە بۆ وەدەستهێنانی و هەوڵ بدە کار بەزانستەکەت بکەی، زانیاری درەختەو کردەوەش بەروبوومیەتی، ئەوەی کار بە زانیاریەکەی نەکات، بە زانا ناژمێردرێ)[1].

وە دەزانن کە زانیاری بە خۆزگەو بێ ماندوو بوون بەدەست نایەت، بەڵکو بە هەوڵ و تێکۆشان و بەدوادا گەڕانی بەردەوام و خۆ خەریك کردن دێتە دی، بەجۆرێك هیچ شتێك هەرچەندە گرینگیش بێ لە هەوڵدان بۆ بەدەستخستنی زانیاری بێ ئاگای ناکا، چونکە دەزانن کە زانیاری ئەگەر هەموو خۆتی نەدەیتێ ئەو کەمێکیت ناداتێ، وە دەزانن کە زانیاری ناکرێتە ئامرازی کارو کەسابەت لە دەرگای حوکمڕانان، یان بۆ ئەوەی شتێکیان دەستکەوێ، لەبەردەرگای ئەوان زانست زەلیل ناکەن، و ئەو شتە بەنرخەی پێیانە بێ نموودی ناکەن، هەر بۆیە کاربەدەست و حوکمڕانان خۆشیانویستوون و شەرمیان لێ کردوون و بەڕێزو حورمەتەوە لێیان ڕوانیون و، قسەی زانایان قورسایی تایبەتی هەبووە لەدڵی خەڵکی داو تەختی دەسەڵاتدارانیان لەرزاندوە و، ئەرزیان لەبن پێیاندا هەژاندووە، لەگوتنی قسەی هەقدا گوێیان نەداوەتە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك و هەڕەشەی هیچ دەسەڵاتدارێك، هەربۆیە زانایان ئەو پلەو مەقامە گەورەو بەرزەیان هەبووە، ئەوان ئەستێرەی ڕێنمایی وچاکسازیی گەلانیان بوون، ئەوان بە قسەو کردەوە

---

(١) مجمع الشیوخ/ الذهبي ٥٠٥.



مایەی بەگەڕخستنی تواناو هیمەتییان بوون و مێژوویان گۆڕیوە، بەوانەوە ئومێدەکان سەوز بوون، بە جیهادو تێکۆشانیان سەروەریی و عیززەت هاتۆتە دی و، نائومێدیی و بەزینی لە دەروونی تاکەکانی ئەم ئوممەتە لابردوە و هیواو ئومێد بە داهاتوویان لەجێیدا داناوە. (شیخ الإسلام) (إبن تیمیة)ش لە پێشەوەی ئەو کاروانە پڕخێرو بەرەکەتەی سەدەکانی حەوت و هەشتی کۆچی یە، کە کەسێکی گەورە بوو لە بواری زانست و کردەوەو زوهدو پارێزکاریی و جیهادو ئازایەتیی و هتد دا.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە (شیخ الإسلام) موجتەهیدو زانایەکی لێهاتووی شارەزا بەقورئان و سوننەت و فیقهو زانستەکانی دیکەی ئیسلامی بووە، خاوەنی سیفەتی بەرزو جوان و هەڵوێستی جوامێرانەو، خەمخۆری خەڵك و دژی زوڵم و ستەم بووە، فەرمانی بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە دەکردو گوڕو تینێکی زانستی دروست کرد، کە ئاڵا هەڵگری چاکسازیی و داهێنان و نوێبوونەوە بووە، خەڵکی لەسەر بیروباوەری ساغ و ڕاست و دروست پەروەردە دەکردو بە گشتگیریی ئیسلامی ڕادەنواندو لەبیرو بۆچونە هەڵەو خوارو خێچەکان ئاگاداری دەکردنەوە، کەسێك بوو لە بەرانبەر گرفت و ناخۆشییەکانی ژیان دا پشت ئەستوور بەخوای باڵادەست بەسەبرو ئارام بوو، لەبەر ئەوەو چەندان خەسڵەتی دیکەی کەسایەتیی ناوبراو شیاوی ئەوەیە گرنگیی زۆری پێ بدرێ و توێژینەوەی لەسەر بکرێ و لەبارەیەوە بنووسرێ.

إبراهیم محمد العلي

## سەردەمی (إبن تيمية)

بێگومان ئەو ژینگەیەی ئینسانی بانگخواز تێیدا دەژی، لە گرنگترین ئەو هۆکارانە دەژمێردرێ کە کاریگەریی هەیە لەسەر دروست بوون و پێکهاتەی کەسایەتییەکەی، دیارە هۆکاری نەسەب و خێزانییش کاریگەرییەکی دیکەی لەوبارەوە هەیە، بەو پێیە زۆرجار ژینگە و دەوروبەر، بڕیاری لەسەر ژیانی زۆر کەس داوە و کاریگەریی باڵای هەبووە لە دیاریکردنی هەڵسوکەوتی زانایان و کەسانی دیکە و، شێوازی مامەڵە کردنیان لەگەڵ ئەو هەلومەرجەدا کە تێیدا ژیاون.

ئەو چاخ و سەردەمەی (شيخ الإسلام) تێیدا دەژیا، پڕبوو لە ڕووداوی ترسناك و دڵەراوکێ، ئەمەش لە ئەنجامی داگیرکرانی وڵاتانی ئیسلامیی لەلایەن (تەتار) و ڕووخانی خیلافەتی ئیسلامیی لە بەغدا لە ساڵی(٦٥٦)ی کۆچی دا و، کوژرانی خەلیفەی ئیسلام بە خراپترین شێوە. ئەوکات شڵەژان و سەرگەردانیی و لادان، هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیانی گرتبۆوە، (شيخ الإسلام) لە سەردەمێکی ئەنگوستە چاوی نێو بەحرێکی شەپۆلاویی لە لاوازیی و فەساد و دڵەڕاوکێ و لادان لە بوارەکانی زانست و سیاسەت و کۆمەڵایەتیی دا ژیاوە.

ئەو سەردەمەی ئەو تێیدا دەژیا پێویستی بە چاکەکارێکی بانگخواز هەبوو، کە نیشانەو قوچکەکانی دین نوێ بکاتەوە، لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا و، ئارامیی و ئۆخژن بگێڕێتەوە بۆ دڵ و نەفسە تێکچووەکان، بەشێوەیەك هەوڵەکانی بەتەنیا چڕ نەکاتەوە لەسەر یەك لایەنی ژیان و لایەنەکانی دیکەش فەرامۆش بکات.

(شيخ الإسلام) ئەو کەسە بوو خوای کاربەجێ ئامادەی کرد بەو دەورە هەڵبستێ، لەو بارەوە ئەسپی خۆی تاویدا، کە بێگومان ئەوە کار و دەورێکی گەورە و بە رەحمەت بوو، کە بریتی بوو لە گێڕانەوەی خەڵکی سەردەمی خۆی بۆ ڕێبازی هەق و دەستگرتن بە کتێبی خوا و سووننەتی پێغەمبەرەکەیەوە (صلى الله عله وسلم).



## مەلیکە کۆیلەکانی مصر

سێزدە ساڵ پێش لەدایك بوونی (ابن تیمیة) مەمالیك[1] حوکمڕانی (مصر و شام)یان گرتە دەست، کەزۆربەیان تورك بوون و کۆتا مەلیکی بنەماڵەی صلاح الدین الایوبی (ملك صالح نجم الدين أيوب) کە لەساڵی (٦٤٧)ی کۆچی، وەفاتی کردوە، وەك دانهێنان بە ئازایەتییان و وەفایەك بۆیان نیشتەجێی کردن و هێزێکی لێ پێکهێنان و بەناوی (البحرية)[2] ناسێنرا، دوای مردنی (مەلیك صالح)، (توران شاه)جێی گرتەوە، هەر ئەوساڵە یەکێك لەو هێزەی مەمالیك بەناوی ( عزالدين أيبك) کە تورکمان بوو (توران شاه)ی کوشت و دەستی بەسەر دەسەڵاتداگرت و نازناوی (الملك المعز)ی درایە، بەو شێوەیە مەمالیك حوکمیان گرتە دەست، ئەویش لە ساڵی (٦٥٥)دا کوژرا و کورەکەی بە ناوی (نورالدين على) جێی گرتەوە. دواتر لەساڵی (٦٥٧) (سيف الدين قطز)حوکمی گرتە دەست، کە بۆیەکەمجار (تەتار) لەسەر دەستی ئەو تووشی تێشکانی گەورە هات، دوای ساڵێك لە حوکمڕانیی، یەکێك بەناوی (ركن الدين بيبرس) ناوبراوی کوشت و خۆی جێگای گرتەوە و نازناوی (مەلك ظاهر)ی بۆخۆی دیاری کرد. ناوبراو ماوەی (١٨) ساڵ لەسەر حوکم مایەوە و لەوپەڕی دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویی دابوو، چەند جارێکیش بەسەر تەتار و صلیبی یەکاندا سەرکەوت.

(ابن تيمية) لەسەردەمی (مەلك ظاهر) دا کە حوکمی (شام و مصر)ی کردوە لەدایك بووە و کاتێك مەلك ظاهر مردوە تەمەنی ناوبراو پازدە ساڵ بووە.

---

(١) مماليك: كۆی (مملوك)ە واتە: كۆیلە، كە لەسەرەتادا كۆیلە بوون، دواتر راپەڕیون و شۆڕشیان كردوە و بوونە دەسەڵاتدار لە وڵاتدا.

(٢) لە مصر شوێنیان لە لێواری (نيل) بوو، بۆیە بەو ناوەوە ناوزەد كراون، خەڵكی مصر وەك عادەتی خۆیان بە (نيل) دەڵێن (بحر).

(ظاهر بیبرس) یەکەم مەلیکی بەهێزی مسوڵمان بوو دوای (صلاح الدین الأیوبی) کە گرنگی بە جیهاد داوەو بەردەوام دوژمنانی ئیسلامی تێکشکاندوون، وەك (ابن کثیر) باس دەکات[1] دەسەڵات و حوکمڕانی ناوبراو فراوان بوو، کە لە رۆژهەڵاتەوە دەگەیشتە (فورات) و لە خوارووش تا ئەوپەڕی (سودان) پەلی هاویشتبوو.

مصر چەقی دەسەڵات و حکومەت و قاهیرەش بارەگای سەرەکی بوو، کە دواتر گۆڕا بۆ ناوەندێکی سیاسیی، زانستیی، ژیاریی بۆ هەموو جیهانی ئیسلامی، ئەوەش بەهۆی نیشتەجێ بوونی (مەلك ظاهر) و یەکێك لە خەلیفەکانی عەبباسی لەوێ بەناوی (المستنصر بالله) کە مەلیك ظاهر لە ساڵی (٦٥٩)ی کۆچی بە خەلیفە داینا و بەیعەتی پێ دا، بەڵام خەلیفە هەر بەناوو بۆ مویارەکی بوو، ئەگەرنا مەلك ظاهر دەسەڵاتداری تەواو و هەمەکارە بوو[2] مەلیك ظاهر ژمارەیەکی زۆر خوێندنگای ئیسلامی دامەزراندن، ناوبراو وێڕای ئەوەی کەسێکی ئازا و بەهێز و دڵسۆز بوو، حەماسەتی جیهاد و بەرەنگاربوونەوەی هەبوو، بەڵام کەسێکی خۆپەسند و سەرسام بە رای خۆی بوو، هەر بۆیە لەگەڵ ئیمام (نووی) تێکگیراوە و ناچار ئیمام دیمەشقی جێهێشتووە، حوکمڕانیی مەلیك ظاهر لە ساڵی (٦٥٨ تا ٦٧٦) بووە کە وەفاتی کرد تا ساڵی (٧٠٩) واتە لەماوەی (٣٣) ساڵدا، نۆ مەلیکی دیکەیان لە مصر و شام حوکمرانیان کردووە، لە ساڵی (٦٧٨ تا ٦٨٩) ملك (منصور سیف الدولة قلاوون) کە ئینسانێکی مجاهد و بەهێز و لێزان بوو، حوکمڕانی دەوڵەتی ئیسلامی بوولە مصر و شام و حجاز و توانی لە ساڵی - ٦٧٨) هێرش بکاتە سەر تەتار و شکستی گەورەیان بەسەر بێنێ. بەهەمان شێوە طرابلسی شامی لەدەست صلیبی یەکان رزگارکرد کەماوەی (١٨٥) ساڵ لەژێر دەستیاندا بوو،

---

(١) البدایة والنهایة ج١٣ ص٢٧٦

(٢) دوای کوژرانی (المستعصم بالله) خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا بە دەستی تەتار لە ساڵی ٦٥٦)ی کۆچی، مسوڵمانان سێ ساڵان بێ خەلیفە مانەوە، تا ملیك ظاهر لە ساڵی (٦٥٩) (المستنصر بالله) ی لە عەبباسییەکان وەك خەلیفە لە مصر دانا و بەیعەتی پێ دا.



دوای مردنی ئەو لە ساڵی (٦٨٩) مصر بوو بە یاریگای چەند مەلیکێك تا لە ساڵی (٧٠٩) کوڕی مەلیك منصور کە ناوی (ناصر) بوو بۆ جاری سێیەم جڵەوی حوکمی گرتەوە دەست و حوکمڕانییەکەی ماوەی (٣٢) ساڵی خایاند.

مەلیك ناصر هاوچەرخی شیخ الاسلام بوو، تا ئەندازەیەکی زۆر جێنشینی ملیك ظاهر بیبرس بوو، بەوەی زۆر سیفەت و هەڵسوکەوتی وەك ئەو بوون، وەك باییشی (ملك منصور) بەهێز و توانا و لێزان بوو، بەسەر تەتار دا سەرکەوت و شکستی پێ هێنان و مایەی بەرەوپێش چوون و گەشەکردنی دەوڵەت و دەرکەوتنی سومعەی پاکی بوو. ئەوکات (خراسان و عیراق و فارس) لە ژێر دەسەڵاتی تەتار بوون و (مصر و شام و سودان و حجاز)یش لەژێر دەسەڵاتی مەمالیك دا بوون[1].

---

(١) ئەم باسە لە کتێبی رجال الفکر والدعوة / ابوالحسن الندوی بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٤٣٦ - ٤٣٩ وەرگیراوە، چاپی چوارەم (دار ابن کثیر للطباعة و النشر و التوزیع).



# بارودۆخی گشتی پێش لەدایك بوونی

## ١- بارودۆخی سیاسی:

بارودۆخی سیاسی لەسەردەمی (شیخ الإسلام) دا نارێك و لێك هەڵوەشاو بوو، وڵاتی مسوڵمانان بۆ چەند ویلایەتێك پارچە پارچە بووبوو، كە هەریەكەیان بەچاوی دوژمنكارانە سەیری ئەوی دیكەی دەكرد و، كاربەدەستان بە زوڵم و خۆسەپاندن هەڵسوكەوتیان لەگەڵ خەڵكەكەیاندا دەكرد، بەسووكیی و بێڕێزیی تەماشایان دەكردن، ئەوە بوو بەهۆی لاوازیی مسوڵمانان و متمانە بەخۆ نەمانیان، سەرەنجام دوژمنان تەماعیان تێكردن و، ئەوانیش لەوە لاوازتر بوون كە بتوانن بەرگریی لەخۆیان بكەن و مەترسییەكان دوور بخەنەوە، (ابن الأثیر) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئاماژەی بەو مەترسییانە كردوە كە ئەوكات هەڕەشەیان لە مسوڵمانان دەكرد و دەڵێ: (لقد بلي الإسلام والمسلمون في هذه المدة بمصائب لم يبتل بها احد من الأمم...) واتە لەوماوەیەدا ئیسلام و مسوڵمانان تووشی چەندان گرفتاریی و ناڕەحەتیی بوون، كە تووشی هیچ میللەتێك نەبووبوون، لەوانە:

* پەیدابوونی (تەتار) - خوا ڕیسوایان بكات - كە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتن و بەشێوەیەك ڕەفتاریان كرد كە هەركەسێك بیبیستێ بەكارەساتی ناودەبات.

* هاتنی (فەرەنج) - خوا بیانگرێ - لە ڕۆژئاواوە بەرەو شام، كە ئەگەر بەزەیی و یارمەتی خوا نەبووایە مەبەستیان داگیركردنی میسر و شام و چەند شوێنێكی دیكە بوو.



* هەبوونی فیتنە و ئاشووبی نێوخۆ، کە لە بەرانبەر یەکدی دا شیریان هەڵکێشابوو[١].

(شیخ الإسلام ابن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئاماژە بە دەرکەوتنی (صەلیبییەکان) و ئەو هۆیانەی مایەی بەرپابوونی ئەو شەڕانە بوون کە لە وڵاتی مسوڵمانان هەڵیانگیرساندن، کردوە و دەڵێ: (کاتێك لە نێو مسوڵماناندا دەغەڵیی و بیدعە و خراپەکاریی پێچەوانەی دینی خوا، پەیدابوون، دوژمنان بەسەریاندا زاڵ بوون، ڕۆمەکان و نەصرانییەکان جار لەدوای جار بەرەو شام و جەزیرە دەهاتن و، وردە وردە سەنگەرەکانی شامیان دەگرتن تا گەیشتنە (بیت المقدس).. دوای ئەوە بەماوەیەك دەوری دیمەشقیان دا، کە ئەوکات خەڵکی شام لەخراپترین حاڵدا بوون لە نێوان کافرەکانی نەصرانی و مونافیقە بێدینەکاندا)[٢].

مەترسیی (خاچپەرستەکان) لە گیانەڵا و هەناسەی کۆتاییدا بوو کە (إبن تیمیة) لەدایك بوو، ئەو لە تەمەنی گەنجیدا بوو کەلەسەر دەستی مەلیك (خەلیل کوڕی مەنسوور) کۆتایی بە دەسەڵاتی صەلیبییەکان هات. دوای گرتنی هەموو قەڵاکانیان و (عەککا) و سەنگەر و شوێنە گرنگەکانیان لەساڵی (٦٩٠)ی کۆچییدا[٣].

(شیخ الإسلام) و بنەماڵەکەی و خەڵکی (حەڕڕان)، دوو شتی یەك لەیەك تاڵتریان لە (تەتار) بینی، بەوەی لەسەرێکەوە ناچارکران بەهۆی هێرشی تەتارەوە کۆچ بکەن و مەملەکەتی خۆیان جێ بهێڵن، لەلایەکی دیکەشەوە شار و ئاوەدانییەکانیان وێران و خاپوور کران، (تەتار) کە لە ڕۆژ هەڵاتەوە هاتبوون بە هەر شار و ئاوەدانییەك دا ڕەت بوونایە وێرانیان دەکرد و، هیچ نیشانەیەکی شارستانیەتییان تێدا نەدەهێشت و شوێنەواریان ڕەشدەکردەوە.

---

(١) الکامل في التاریخ ٣٣/٩.

(٢) مجموعة الرسائل الکبرى ١٣٣/١ - ١٣٤.

(٣) البدایة والنهایة ٣٣٨/١٣.

(ابن الأثیر) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، بەو شێوەیە باسی ئەو بەڵایەی کردوە کە وڵاتی مسوڵمانانی گرتبۆوە و دەڵێ:
(لقد بقيت عدة سنين معرضا عن ذكر هذه الحادثة استعظاما لها، كارها لذكرها، فأنا أقدم رجلا وأؤخر أخرى، فمن يسهل عليه ان يكتب نعي الإسلام والمسلمين؟ ومن الذي يهون عليه ذكر ذلك؟ فيا ليت أمي لم تلدني، ويا ليتني مت قبل هذا وكنت نسيا منسيا....).

واتە: لەبەر گەورەیی کارەساتەکە و پێ ناخۆشبوونم بەوەی باسی بکەم، ماوەی چەند ساڵێك بوو باسکردنی ئەو بەسەرهاتەم پشتگوێ خستبوو، چونکە کارەساتێکی زۆر گەورە بوو،پێم خۆشنەبوو باسی بکەم، لاقێکم دەبردە پێشێ و یەکێکم دەهێنایە دوایە، ئاخر کێ پێی خۆشە بەڵا و کارەساتی مسوڵمانان بنووسێ؟ کێ باسکردنی هەواڵی مردنی ئیسلام و مسوڵمانانی لەلائاسایی و ئاسانە؟ خۆزگە دایکم منی نەبوومایە !خۆزگە پێش ئەو ڕووداوە مردبام و شتێکی لە بیرکراویام و شتی وام نەبینیبایە، بەڵام کە هەندێك لە هاوەڵەکانم داکۆکییان لێ کردم کە شتێکی لەسەر بنووسم هەڵوەستەیەکم کرد، ڕامام، دوایی بینیم کە نەنووسینی ئەوشتە هیچ سوودێك ناگەیەنێ، بەڵکو ئەوە باسکردنی ڕووداوو کارەساتێکی گەورەیە، کە شەو و ڕۆژەکان شتی وایان تێدا ڕوونەداوە، کە بەگشتی هەموو شتێکی گرتەوە بەتایبەتی مسوڵمانان، ئەگەر یەکێك بڵێ: لەو کاتەوە کە خوا ئادەمی دروست کردوە تائیستا، مرۆڤایەتیی تووشی بەڵای ئاوا گەورە و ناخۆش نەبووە، شتێکی ڕاستیی گوتوە).

ئەوانە بەسەر کەسدا بازیان نەدەدا. ژن و پیاو و منداڵیان دەکوشتن، زگی ئافرەتی دووگیانیان دەدڕی و کۆرپەکانیان دەکوشت، چ کارەساتێکی گەورەبوو، کە پڕیشکەکەی هەموو لایەکی گرتبۆوە!!

قەومێك لە دەوروبەری (چین) بەدەرکەوتن، بەمەبەستی وڵاتی (تورکستان) لەوێشەوە بۆ وڵاتی ئەودیو ڕووبار و گرتیان، دوایی بەشێکیان پەڕینەوە بۆ (خۆراسان) و دەستیان کرد بە کوشتن وبڕینی خەڵکی و وێران و تاڵان کردن، ئنجا لەوێوە چوون بۆ (ڕەی و هەمەذان) هەتا گەیشتنە (عێراق) دوایی



(ئازەربایجان)، وێرانیان کردن و خەڵکەکەیان کوشت، لەماوەی کەمتر لە ساڵێك ژمارەیەکی کەم نەبێ لێیان دەرنەچوو، ئەوە کارەساتێك بوو کەس شتی وای نەدیبوو، دوایی بەرەو وڵاتی (قەفجان) ڕۆشتن کە زۆربەیان تورك بوون، هەرکەسێك لەبەرانبەریان وەستابایە دەیانکوشت و ئەوانی دیکەشیان هەڵدەهاتن بۆ چیاکان و نیشتمانیان بەجێ دەهێشت، ئەو تەتارانە دەستیان بەسەر ئەوێشدا گرت، ئەوەیان لەماوەیەکی کەمدا ئەنجامدا، بەشێکی دیکەیان جیا لەوانە بەرەو (غەزنە) و وڵاتانی دراوسێ ی ڕۆیشتن لە (هیند، سجستان، کرمان) ئەوانی دیکە چیانکرد لە کوشتن و بڕین، ئەمانیش بەهەمان شێوە بەکاری خراپ هەستان، بەشێوەیەك کەس شتی وای نەبیستوە، ئەوانە لەماوەی ساڵێکدا چەند شوێنێکی زۆر و ئاوەدان لەخەڵك و بیناسازییان داگیر کرد، کە باشترین خەڵك بوون لە ڕووی رەوشت و ئاکارەوە، ئەوان پێویستییان بە هاوکاریی نەبوو، وڵاخی سواری و مەڕ و ماڵاتێکی زۆریان پێ بوو، کە گۆشتیان دەخواردن، ئەو وڵاخانەشیان کەسواری دەبوون، بە سمەکانیان ئەرزیان دەدڕی و رەگی ڕووەکیان دەردێنا و دەیانخوارد و (جۆ) یان نەدەناسی، بۆیە لەهەر شوێنێك بنەیان بخستبایە پێویستییان بەهیچ نەبووا.

(سەبارەت بەدین و عەقیدەشیان، لەکاتی هەڵاتنی دا سوجدەیان بۆ خۆر دەبرد و، هیچ شتێکیشیان لەلا حەرام نەبوو، هەتا سەگ و بەرازیشیان دەخوارد، مارەکردنی ئافرەتیان نەبوو، بەڵکو چەند پیاوێك دەچوونە لای یەك ئافرەت و ئەگەر منداڵیشی ببوایە، کەس نەیدەزانی هی کێیە)[1].

ترسی (تەتار) وردە وردە زۆر و کەڵەکەبوو، تاگەیشتە ئەوەی پایتەختی حوکمڕانیی ئیسلامیی- بەغدا - کەوتە ژێر دەستیان و - لەساڵی ٦٥٦ ی کۆچی - خیلافەتیان رووخاند و شتی سەیریان لێ ئەنجامدا، بۆماوەی چل ڕۆژ کوشتن و بڕین و دزیی و تاڵانیان درێژە پێدا و، خەڵکێکی زۆریان کوشت و ئەو شارەیان خاپوور کرد، کوژراوەکان لەڕێگا و کۆڵانەکاندا بۆگەنیو بووبوون، کەلەئەنجامدا نەخۆشیی و دەردێکی کوشندە بڵاو بۆوە، ئەو نەخۆشییانە بەهۆی

---

(١) الکامل فی التاریخ ٩/ ٣٢٩ - ٣٣٠.

هەواوە گواسترانەوە بۆ وڵاتانی دەوروبەریش و خەڵکێکی زۆر بەوە مردن، گرانیی و ناخۆشیی و نەخۆشیی و لەناوچوون و طاعوون لەسەر خەڵکی کۆبوونەوە، وەك (ابن کثیر) باسی دەکات[١].

(شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو واقعە خراپە لەلایەك بەزمان و، لەلایەك بەهێز و کردەوە بەشدارییەکی کارای کرد لەشەڕکردن دژی تەتار، لە (دیمەشق)یش کۆڕە زانستییەکانی لە مزگەوت دا دەبەستن و، تێیاندا خەڵکی هاندەدا لەسەر بەرگریی کردن لە دین و وڵات و جیهاد کردن و بەخشینی ماڵ لەڕێی خوادا .

کاتێك (تەتار) دەوری شاری دیمەشقی دابوو، سوپای مسوڵمانان شکابوو، خەڵکی لە دڵەڕاوکێ دابوون، (شیخ الإسلام) لەگەڵ چەند زانا و ناودارێکی شارەکە لە مانگی (ربیع الثاني) ساڵی (٦٩٩)ی کۆچیی دا، چوونەلای مەلیکەکەیان (قازان)و لەوێ بەتووندی قسەی لەگەڵدا کرد و بەرگریی کرد لە بەرژەوەندیی مسوڵمانان، وە بۆ دیمەشق و خەڵکەکەی، بەڵێنی سەلامەتیی لێ وەرگرت کە زیان بە خەڵکەکەی نەگەیەنێ، (قازان) کە دڵسۆزیی و ئیمانێکی بەهێزی لە (شیخ الإسلام) دا بەدی کرد، ڕێزی لێگرت و گوێی بۆگرت و ئەوەی داوای لێکرد، بەقسەی کرد، زانا و قازییەکان کە لەگەڵ (إبن تیمیة) دا بوون، ترسان کە سوڵتان لەسەر ئەو قسانە بیکوژێ، بەڵام خوا پاراستیی[٢].

یەکێکی دیکە لەهەڵوێستە بەرزەکانی (شیخ الإسلام) ئەوە بوولە ساڵی (٧٠٢)ی کۆچی کە (تەتار)دەوری دیمەشقی دابوو، خۆی چوو بۆ مصر و هانی سوڵتان (ناصر)ی دا لەسەر هاتن بۆ بەرەنگاربوونەوەی (تەتار) لە دیمەشق و، لەوبارەیەوە زۆر بەتوندی قسەی لەگەڵدا کرد، دوای هاتنی سوڵتان بۆ جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی (تەتار)، ئەم جارەیان سەرکەوتنی سوپای مسوڵمانان بەسەر تەتاردا هاتە دی[٣].

---

(١) البداية والنهاية ١٣/٥١٦.

(٢) البداية والنهاية ١٤/٨.

(٣) البداية والنهاية ١٤/١٧



هەڵوێستێکی دیکەی ئەوەبوو کە خۆی بەشێوەیەکی کردەیی، بەشداریی کرد لە ڕوویەڕووبوونەوەی (تەتار)دا، کاتێك کە بەشداریی جەنگی (شقحب)ی کرد، کەبوو بە مایەی لابردنی مەترسیی تەتار لەسەر شام[1].

وەبەشداریی لە جەنگدا کرد لە دژی (أهل الجبل) لە (نوصەیرییەکان و باطینییەکان و ئیسماعیلییەکان)، کە هاوپەیمانی تەتار و خاچپەرستەکان بوون و داوای تۆبەی لێکردن[2].

لەوەوە کە رابرد، بۆمان دەردەکەوێ کە بارودۆخی سیاسی لەو سەردەمیدا پڕبووە لە بەڵاو نارەحەتیی و گرفت و کێشەی گەورە و، حاڵەتی مسوڵمانانیش بەگشتی بریتی بوو لە پەرتەوازەیی و پارچە پارچەیی و دووریی لە دەستگرتن بە کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەوە (صلی الله علی وسلم).

## ٢- بارودۆخی کۆمەڵایەتی:

وەك ڕەنگ دانەوەیەك بۆ بارودۆخی سیاسی، بارودۆخی کۆمەڵایەتییش نالەبار و نا جێگیر بوو، هێرش و تەراتێنی تەتار و خاچپەرستەکان و ئەو مەترسییانەی دەوری وڵاتانی مسوڵمانانیان دابوو، بووبوونە مایەی نەمانی هێمنی و ئاسایش و تێکچوونی یاسا و بڵاوبوونەوەی ترس و دڵە ڕاوکێ لە دەروونی خەڵکی دا، بەجۆرێك هیچ کەس لە نەفس و ماڵی خۆی دڵنیا نەبوو، کە ئەوە وایکرد بەروبووم و ماڵ و سامانیش کەم بێتەوە، بەهۆی گرنگیی نەدانی خەڵکی بەکار و کەسابەت و کشتوکاڵەوە، کە ئەوەش بوو بەمایەی خراپ بوونی باری ئابووریی و بڵاو بوونەوەی گرانیی و هەژاریی و ئیحتکاری خواردەمەنی و، دواتر فرۆشتنی بە نرخێکی گران. هەروەها هاتنی کوللە و لەنێوچواندنی ئەوەی مابۆوە لە کشتوکاڵ و بەروبووم، بەڵایەکی گەورەی دیکە بوو.

---

(١) البداية والنهاية ١٤/٢٤ - ٢٨.

(٢) العقود الدرية ص١٧٩/ البداية والنهاية ١٤/١٣.

ئنجا تێکەڵ بوونی خەڵکی شوێنەکان، هێندێکیان لەگەڵ هێندێکیان، بوو بەمایەی لێك هەڵوەشانەوەی پەیوەندییە خێزانیی و کۆمەڵایەتییەکان و، بڵاوبوونەوەی خو و نەریت و بیر و بۆچوونی تازەی خراپ لەنێو خەڵکدا، کە لەو بارودۆخەدا خەڵکی پەنایان دەبردە بەر غەش و فرِوفێڵ لە کرِین و فرۆشتن و کێشان و پێواندا، ئەوە (شیخ الإسلام) ی ناچارکرد کە کتێبی (الحسبة في الإسلام) دابنێ، کە تێیدا هانی کاربەدەستانی مسوڵمانان و (محتسبین)[1]ی دەدا کە بەدواداچوون بۆ کاروبار و بەرژەوەندیی تێکرِای خەڵکی بکەن و، سزای توند و کاریگەر بەسەر خراپەکاراندا بسەپێنن، وە ئەوەی پێویست بێ نرخی بۆدیاری بکرێ، بەمەبەستی پاراستنی ژیان و رزق و بژێوی خەڵکی.

بەشێوەیەکی گشتی ئەوکات ژیانی کۆمەڵایەتیی مسوڵمانان پرِبوبوو لە خراپەکاریی و پێویستیی بە چاکسازییەکی گشتی هەبوو، کە چاکەخوازێکی ئازای دڵسۆز پێ ی هەستێ و ئەوەی خراپ بووە، چاکی بکاتەوە و خەڵکی خوار راست بکاتەوە و، شتەکان بگەرِێنێتەوە سەر رەورِەوەی خۆیان.

(شیخ الإسلام) لەو پێناوەدا ئەوپەرِی هەوڵ و کۆششی خۆی خستە کار و، بارودۆخی ئەمنیی رێکخست و نرخی لەسەر شتەکان دانا و، دەستی کرد بەلابردنی کار و کردەوەی خراپ و، بەدرِەوشتی و نەهێشتنی شەرِاب و داخستنی شوێنی خراپ و مەیخانەکان، کەبەهۆی هاتنی (تەتار)ەوە بارودۆخەکە خراپ و لە گرێژەنە چووبوو، تاوای لێهات لە دیمەشق (نائب السلطنة) و کاربەدەستان و کەسانی دیاری ئەوێ، ئەو پەیرِەوە چاکسازییەی ئەویان پیادەکرد، کە لە قورئان وسوننەت و رێرەوی پێشینەی چاك وەری گرتبوو.

---

(١) محتسبین، جمع محتسب: کە بریتیە لەو کەسەی لەلایەن دەوڵەتەوە ئەرکی فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپەی پێ دەسپێردرێ.



## ٣- بارودۆخی زانستی:

ئەو چاخ و سەردەمەی (شیخ الإسلام) ی تێدا دەژیا، وێڕای ئەو گرفت و بەڵاو ناڕەحەتییانەش کە ئەوکات بەسەر خەڵکی دا هاتبوون، بووژانەوە و هەستانەوەیەکی گەورەی زانستی هەبوو، ئەوکات کەئیمان و کوفر، پارێزکاریی و بێدینیی، ئاسایش و نائارامیی، شەڕ و ئاشتیی هەبوون، پێشەوایانی گەورە ببوونە سەرچاوە بۆ دوای خۆیان بەوەی کتێبی زۆریان نوسیبوو و لە تێکڕای زانستەکان دا بەرهەمیان پێشکەش کردبوو، بۆ نموونە: (عزالدین بن عبدالسلام و ابن دقیق العید و محي الدین النووي و ابو حجاج المزي) بەڵام لەگەڵ هەبوونی ئەو زانا بلیمەت و هەڵکەوتووانەشدا، لەلایەکی دیکەوە چەقبەستوویی و لاساییکردنەوە و تەقلید و دەمارگیریی مەزهەبیی بەسەر بزووتنەوەی زانستییدا زاڵ بوو، کە هەموو هەوڵ و تێکۆشانی زانا ئەوەبوو ئەوەی گوتراوە تێیبگات و، بەبێ لێکۆڵینەوە و مناقەشەکردن بەدوای بکەوێ، زانایان ویستوویانە دەربارەی هەموو زانستەکان زانیاری کۆبکەنەوە و هەریەکەیانیان لەشوێنی خۆی ڕێکخستبوو، وە هێندێك جار کتێبی گەورە و هێندێك جاریش کتێبی بچووکیان لەوبارەوە دانابوو، بەرنامەیەکی باشیان لەدانان و نووسینی کتێباندا هەبوو، بەڵام شوێنەواری داهێنان و نوێ گەراییان پێوە دیار نەبووە.

ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا کە چەقبەستوویی و تەقلیدی ڕەهاو دەمارگیریی مەزهەبی زاڵ بوو بەسەر زۆر لەزانایانی ئەو سەردەمەدا، بەڵام وەك باسمان کرد بڵاوبوونەوە و فراوانبوونی زانست، بەردەوام و لە پێشکەوتندا بوو، نیشانەی خێری پێوە دیاربوو، پادشا و کاربەدەستان و کەسانی دیار کە دەوڵەمەند بوون، ئەوپەڕی توانای خۆیان بە خەرج دەدا بۆ بنیات نانی ئەو خوێندنگایانەی کە گرنگییان بە زانستە ئیسلامییەکان دەدا، لە تەفسیر و حەدیس و فیقهو...، وە قوتابیانی زۆربەی شوێنەکانی دنیا پێشبڕکێیان دەکرد کە بێن لەوێ بخوێنن، کتێبخانەی گەورە و شوێنی حەوانەوەی قوتابیانیان مەیسەر کردبوو، وە لەکاتی خوێندندا خەرجییان دەکێشان.

وڵات لە سەردەمی (إبن تيمية) دا (رەحمەتی خوای لێ بێ) پڕبوو لە کتێبخانە و قوتابخانە و سوودی زۆری لێ بینین، جگە لەو مزگەوتانەی کە تانەوکات نێوەندی زانست و ئامۆژگاریی و چاکسازیی بوون لەنێو خەڵکی دا.

بەڵام ئەوەی (شيخ الإسلام) و کەسانی دیکەی چاکسازییکاری لەهەموو شتێك زیاتر دڵتەنگ کرد بوو، زۆریی پێڕە ئیسلامییەکان و چالاکی شوێنکەوتوانیان بوو، دژی ئیسلام و ئەهلی ئیسلام.

کە باشترینیان ئەوانە بوون کە بەبێلایەنیی و وەك تەماشاکار مابوونەوە، وەك (سۆفییەکان)، بەڵام ئەوەی دەستی یارمەتی بۆ تەتار و فەرەنجییەکان و صەلیبییەکان درێژ دەکرد لە دژی مسوڵمانان چەند کۆمەڵێك بوون، وەکو (الإسماعلية و الباطنية والرافضة النصيرية) کە ئەو تاقمانە بە ئاشکرا بە قسە و هێز جەنگیان بەرپاکردبوو دژی ئیسلام و مسوڵمانان و هەندێکیشیان لەوکاتە ناهەموارەدا بیر و باوەڕی خەڵکیان تێك دەدا، بە پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی فیکری موعتەزیلە و فەیلەسووفەکان.



# چەند زانایەکی سەردەمی شیخ الإسلام:

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لەسەردەمی کۆمەڵە زانا و پێشەوایەکی گەورە لە فەرمووده ناسان و توێژەرەوانی قورئان و شەرعزانان و ئەدیب و زمانەوانان و مێژوونووسان و.. هتد ژیاوە، کە ئەمانە هێندێکیانن:

١- ابوعبدالله القرطبي، خاوەنی تەفسیر، لەساڵی (٦٧١)ی کۆچی دا. کۆچی دوایی کردوە.

٢- محی الدین النووی، کە لە ساڵی (٦٧٦)ی، کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٣- ابن دقیق العید، کە لە ساڵی (٧٠٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٤- ابوحیان الغرناطی الاندلسی، کە لەساڵی (٧٥٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٥- ابن رشد الفهري الأندلسي، کە لەساڵی (٧٢١)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٦- ابن سید الناس الیعمری، کە لەساڵی (٧٣٢)، کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٧- شمس الدین الحنبلي، کە لەساڵی (٧٠٩ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٨- ابو البرکات النسفي، کە لەساڵی (٧١٠ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٩- ابن کثیر الدمشقي، کە لەساڵی (٧٧٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

١٠- ابن قیم الجوزیة، کە لەساڵی (٧٥١ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

١١- تقي الدین السبکي الشافعي، کە لەساڵی (٧٥٦)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

١٢- جمال الدین ابن المنظور خاوەنی لسان العرب، کە لەساڵی (٧١١ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

١٣- ابن اجروم الصنهاجي خاوەنى (الإجرومية) لە نەحودا، كە لەساڵى (٧٢٣)ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٤- (إبن هشام) ى ئەحوازيى، كە لەساڵى (٧٦١)ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٥- علم الدين البرزالي ديمەشقيى، كە لەساڵى (٧٣٩ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٦- شمس الدين الذهبي، كە لەساڵى (٧٤٨) ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٧- الصفدي، كە لەساڵى (٧٣٤ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٨- قطب الدين الشيرازي، كە لەساڵى (٧١٠) ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

١٩- صدرالدين الوكيل المرحل، كە لەساڵى (٧١٦ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

٢٠- ابن الفركاح الفزاري الدمشقي، كە لەساڵى (٧٢٩) ى كۆچى دا وەفاتى كردوە.

بەپێى ئەوەى رابرد دەتوانين بڵێين: كە ئەو چاخە، جووڵەيەكى زانستى تێدابووە لە زۆربەى زانستە دينييەكان، زمان، مێژوو هتد، بەڵام قووڵبوونەوە لە فكر و نوێ بوونەوە و، داهێنان لە ڕاو سەرنجەكان دا بۆ مەسەلە جۆراوجۆرەكان، لەئاستى پێويستدا نەبووە، بەجۆرێك لەگەڵ ئەو زانست و زانيارييە زۆرەدا بێتەوە.

ئا لەوكات و قۆناغ و هەلومەرجەدا (شيخ الإسلام) ژياوە وبەيداغى چاكسازى و نوێبوونەوەى هەڵگرتوە و كاريگەريى لەسەر ژيانى زانستى ئەوكات و دواتريش داناوە، كە ئەوەش لە كتێب و نووسراوەكانى دا ڕەنگى داوەتەوە.





بەشی یەکەم

## ناو و نەسەبیی

پێشەوای شەرعزان (فقیە) و موجتەهید و فەرمووددەناس(محدث) و توێژەرەوەی قورئان(مفسر) و لەبەربووی قورئان و سوننەت(حافظ) و دنیا بەکەمگر(زاهد) و شارەزا لە (اصول الفقه) و زانای هەڵکەوتوو (تقي الدين ابو العباس، احمد کوڕی عبدالحليم کوڕی عبدالسلام کوڕی عبدالله کوڕی أبی القاسم الخضر کوڕی محمد، إبن تیمیەی نەمیریی، حەڕڕانیی، دیمەشقیی، حەنبەلیی یە[1].

### هۆی ناونرانی بە (إبن تيمية):

**هۆی ناونرانی بەوناوە وە، چەند قسەیەکی لەسەرە:**

**یەکەم:** کە باپیرە گەورەی (محمد کوڕی خضر) بۆ حەج چووە و خێزانەکەی دووگیان بووە، لە (تیماء) کچۆڵەیەکی بینیوە کە لە چادرێکی بچووك هاتۆتە دەرێ، پاش ماوەیەك کە گەڕاوەتەوە بۆ (حەڕڕان) خێزانەکەی کچێکی بووە، کاتێك کچەکەی دەبەنە لای، وەری دەگرێ و دەڵێ: (ئەی تەیمیە! ئەی تەیمیە!) واتە: ئەوە وەك ئەو کچەیە کەلە (تیماء) بینیویەتی، بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە.

---

(١) العقود الدرية٢، الذيل على طبقات الحنابلة ٢ / ٣٨٧.

**دووەم:** دایکی باپیری (شیخ الإسلام) (محمد) ناوی (تیمیة) بووە، کە ئافرەتێکی زیرەك بووە و ئامۆژگاریی خەڵکی کردوە، پاڵدراوەتە لای ئەو و بەوەوە ناسراوە[1].

لەلایەکی دیکەوە پاڵ دراوەتە لای تیرەی (نمیری) کە بە ئەسڵ عەرەبە، بە پێچەوانەی قسەی (شیخ محمد أبو زهره)وە کەدەڵێ: (شیخ الإسلام) عەرەب نەبووە و کورد بووە و، لەکوردستانی تورکیا لەدایك بووە.[2]

## کات و شوێنی لەدایك بوونی:

پێشەوا (إبن تیمیة) لە (حەڕڕان) لەدایك بووە، کە ئاوەدانییەکی کۆنە و یەکێك بووە لە گرنگترین نێوەندە ئایینیە کۆنەکان و دەکەوێتە سەرووی رۆژهەڵاتی کۆماری تورکیا، لە نزیك (ئۆرفە) ی ئێستا . کە ئاوەدانە، کاتی خۆی لەسەر دەستی (تەتار) کاول و وێران کراوە، بەو هۆیەوە بنەماڵەی (تیمیة) و ئەو خەڵکەی دیکەش کە لەوێ بووە چۆڵیان کردوە[3].

هەموو ئەوانەی باسیان لە بەرواری لەدایك بوونی(إبن تیمیة)کردوە، لەسەر ساڵ و مانگەکەی یەك دەنگن، بەڵام راجیاییان لە رۆژەکەیدا هەیە.

ناوبراو لە رۆژی (١٠) ی (ربیع الأول)ی ساڵی (٦٦١) ی کۆچیدا لەدایك بووە[4]. گوتراویشە لە رۆژی دووشەممە (١٠ یان ١٢) ی (ربیع الاول)ی ساڵی (٦٦١) ی کۆچی لەدایك بووە[5] بەڵام راستیی ئەوەیە کە لە (١٠) ی (ربیع الاول)ی هەمان ساڵ لەدایك بوویێ.

---

(١) الشهادة الزكية ص٢٤ العقود الدرية ص ٢.

(٢) ابن تيمية لمحمد ابو زهرة ص١٨

(٣) الاعلام العليه ص١٦.

(٤) الاعلام العليه ص١٦ تأريخ إبن الوردى ٢/ ٤٠٧. البداية والنهاية ١٣/ ٢٤١.

(٥) العقود الدرية ص٢.

## دیمەن و خووڕەوشتەکانی (ابن تیمیة):

ئەوانەی لەگەڵی ژیاون و قسەیان لەبارەوە کردوە، وێنەیەکی ڕۆشنیان لەسەر شێوە و دیمەن و رەوشت و ئاکاری ناوبراو داوینێ، کەبەم شێوەیە هاتوە:

سەر و ڕیشی ڕەش و کەمێك موی سپی تێ کەوتبوو، پیری کەم پێوە دیار بوو، مووی سەری تا نەرمایی گوێی هاتبوو، پیاوێکی دامەزراو، نێو شانەکانی پان بوو، زمانی پاراو و دەنگی بەهێز بوو، رەنگی سپی، چاو گەورە، دووچاوەکانی دەتگوت دوو زمانن قسەدەکەن، خوێندنەوەی خێرابوو، چاو پۆشیی و لێبووردنی بەدوای تورەبووندا دێنا، جل و بەرگی وەك زانایانی دیکە بوو، کراسی درێژ و عەبا و مێزەر، کە نرخەکەی دەگەیشتە سی درهەم، جاروبار هەستاوە لەبەر یەکێك کە لەسەفەر گەراوەتەوە یان ماوەیەك لێی دوور بووە، جاروباریش کەچووە بۆ شوێنێك لەبەری هەستاون، هەموو لای ئەو یەکسان بوون، قەت لەبەر کەس نەچەماوەتەوە، بەڵکو سەلام و تۆقەی دەکردو زەردەخەنەی هاتۆتێ، زۆر زیرەك و تێگەیشتوو بووە، زوو شتی لەبەر دەکرد و هەر شتێکی خوێندبایەوە لەبیری نەدەچۆوە، زۆر ڕوو لەخوا بوو، زۆر لە خوا دەپاڕایەوە، داوای یارمەتی هەر لەو دەکرد، لەوەدا کەس وەك ئەو نەبینراوە[1].

ئەوە چەند سیفەتێکی جەستەیی و نەفسیی بوون، جیا لەو سیفەتە عەقڵییانەی کە کردوویانن بەو زانا گەورە و کەسایەتییە ناودارە، خاوەن هەیبەتێکی تایبەت و هێزێکی کاریگەر بوو، دەچۆ نێو دڵی هەرکەسێك کە قسەی بۆ دەکرد، هەر کەسێك گوێی بۆ بگرتبایە زۆری نەدەبرد دڵ و مێشکی دەخستە بەر دەستانی، (إبن تیمیة) بەو سیفەتە شەخسی و بەهرە و توانا و ئەو دەرس گوتنەوە و شارەزاییە زۆرەی هەیبوو، دەرکەوت و بەزمانێکی پاراوی عەرەبی دەرسەکانی لە مزگەوتی گەورەی دیمەشق دەگوتنەوە، خەڵکی چاویان تێ بڕی، دڵە بێدار و

---

(١) تأريخ إبن الوردي٤١٣/٢. العلماء العزاب ص ١٧١

زیندووەکان بەلایدا کشان و گوێیان بۆ کردەوە، زۆر لەوانەی گوێیان بۆ دەگرت، بوونە قوتابی دڵسۆزی ناوبراو و سەرسام بوون بەزانیاری و هەڵسوکەوتەکانی[1].

## نازناوی (شیخ الإسلام):

ژمارەیەکی زۆر لە زانایانی ئیسلام کە لەسەردەمی ئەودا ژیاون، یان دوای ئەو هاتوون، مەدحی (إبن تیمیة) یان کردوە و رێزیان لێ ناوە و ئاماژەیان بە زانیاری و جیهاد و پێشەوایەتیی ئەو زانا هەڵکەوتوە کردوە، وە نازناوی (شیخ الإسلام) یان لێ هەڵداوە دەربارەی ماناکەشی:

١- زانای بەناوبانگ (ابن ناصر الدین الدمشقي الشافعي) لە ژێر ناوی مانای (شیخ الإسلام) دا دەڵێ:

* مانای ئەوەیە: لە ئیسلامدا پیر بووە و مووی تێدا سپی کردوە و گەیشتۆتە ئەو بەڵێنە موژدە بەخشەی، کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(من شاب شیبة في الإسلام، فهي له نور یوم القیامة)[2].

واتە: هەرکەسێك مووی لە ئیسلام دا سپی کردبێ ئەوە بۆی دەبێتە ڕۆشنایی لە ڕۆژی قیامەت دا.

* مانای زانراو لای زانایانی بەرجەستە ئەوەیە کە ئەو کەسانەی بە (شیخ الإسلام) یان (پێشەوا) ناودەبرێن، ئەوانەن کە دوای کتێبی خوا دەکەون و شوێنپێ ی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەڵدەگرن، ئەوانەی کە بەزانینی زانستەکانی قورئان و سوننەت و شەریعەت بەگشتی پێش کەوتوون و، لەهەموو ڕوونێکەوە شارەزایی تەواویان پێیان هەیە و ملکەچن بۆ خوای باڵادەست و لە

---

(١) إبن تیمیة لأبي زهرة ص ٢٩.

(٢) رواه احمد وابو داود والترمذي وصححه الالباني..



هەڵەی زەمان دەترسن و بە پێهەڵاگوتران (مدح) دڵخۆش نابن و لافی بێ هەڵەیی لێ نادەن و چاك دەزانن ئەوەندە زانیارییەی پێیان دراوە زۆر کەمە. جا هەرکەسێك ئاوابێ ئەوە پێشەوایە و هەقە پێی بگوترێ: (شیخ الإسلام)[1]، دوایی چەند زانایەکی باسکردوون کە شایستەی ئەوەن ئەو لەقەبەیان لێ بنرێ و وایان پێ بگوترێ، هەر لەسەردەمی تابعینەوە تا دەگاتە (شیخ الإسلام إبن تیمیة) رەحمەتی خوای لێ بێ.

٢- دەربارەی مانای (شیخ الإسلام) زانای بەناوبانگ و پێشەوای حەنەفییەکان لەسەر دەمی خۆیدا (بدرالدین العینی) دەڵێ: "وا زانراوە کە وشەی (شیخ) دوو مانای هەن: زمانەوانی و زاراوەیی (اللغوي و اصطلاحي)" .

* مانا زمانەوانییەکەی واتە: کەسێك کە بەتەمەندا چووبێ .

* مانای زاراوەیی یەکەش ئەوەیە کەئەو زانایەیە دەشێ قوتابی هەبن.

کە هەردوو ماناکە لە (إبن تیمیة) دا (رەحمەتی خوای لێبێت)، هاتوونەدی.

ئەو مامۆستا بووە بۆ کۆمەڵێك لە زانایانی ئیسلام و، بۆ قوتابییەکانی لە فەقیهو شارەزایان، جامادام بەو شێوەیە بووبێ، چۆن وشەی (شیخ الإسلام)ی بۆ بەکار ناهێنرێ؟هەرکەسێك مامۆستابێ بۆ مسوڵمانان، مامۆستاشە لە ئیسلامدا، کە قازی و زانا پایە بەرزەکان بەو ناوە ناویان بردوە[2].

٣- ئیمام (ابن ناصرالدین) لە کتێبی (الرد الوافر)دا ناوی هەشتاو حەوت زانای گەورە و ناوداری سەردەمی (إبن تیمیة) و دوای ئەوی باسکردوە، کە نازناوی (شیخ الإسلام)یان بۆ (إبن تیمیة) بەکار هێناوە و پێیان وەصف کردوە، وە مامۆستا و زانا و ئەدیب و شەرعزان (عبدالفتاح ابو غدة) لە کتێبە بەسوودەکەی (العلماء العزاب) دا دەڵێ:

---

(١) الرد الوافر ص ٥١ - ٥٢.

(٢) الشهادة الزکیة ص ٧٧ - ٧٨ / الرد الوافر ٢٦٤.

وشەی (شیخ الإسلام) نازناوێکە کەلەسەردەمی خیلافەتی عوسمانیی دا بەوکەسانە گوتراوە کە بەکاری ئیمامەت و پێشەوایەتیی لە دیندا هەستاوە و، گەورەترین زانای خاوەن پلە و پایە بووە لای سوڵتانی مسوڵمانان، بەو مانایەبێ ئەو وشەیە نازناوێکی وەزیفییە.

وە زانایانی پێشین ئەو وشەیان بۆ یەکێك بەکار هێناوە کە پلەیەکی گەورەی بەرزی لە زانیاری بە قورئان و سوننەت و چاکە و بەخشین و پێشەنگییدا بەدەست هێنابێ و، مسوڵمانان لە زانیاری و کاروباری دیندا بۆ لای ئەو گەڕابنەوە، لە کتێبی فەرمووده ناسان و مێژوو نووساندا بەو مانایە هاتوە)[١].

٤- زانای گەورە (ابن حجر العسقلاني) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: گەورەی قازییەکان (تاج الدین السبکی) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، شانازیی بەوەوە کردوە کە لە مەدحکردنی زانا و پێشەوایان دا بۆ بابی(الشیخ تقي الدین السبکی)، (الحافظ المزی) بەخەتی خۆی وشەی (شیخ الإسلام) ی بۆ کەس بەکار نەهێناوە جگە لەبابی و (تقي الدین - ابن تیمیة) و (شمس الدین ابن ابی عمر)[٢].

جا ئەگەر (ابن تیمیة) لەبواری زانست و کردەوەدا لەو پەڕی پلە و پایە بەرزیی دا نەبووایە، (ابن السبکي) بابی و ئەوی لەو خەسڵەتەدا بەیەکەوە باسنەدەکردن و، ئەگەر (إبن تیمیة) وەك ناحەزانی دەڵێن بیدعەچیی و زەندیق بوایە، ڕازی نەدەبوو بابی لەگەڵ ئەودا باسکرایە[٣].

---

(١) العلماء العزاب ص ٤٦.

(٢) طبقات الشافعیة الکبری ٦ / ١٦٨.

(٣) الرد الوافر ٢٥٠.



# بنەماڵەکەی و ئەوانەی لەنێویدا بەزانیاریی ناویان دەرکردوە

شارەزایی هەبوون لەسەر خێزانی هەر زانایەك تیشكێك دەخاتە سەر كەسایەتی و ژیانی ئەو زانایە، ئەوەش چونكە خێزان و بنەماڵە كاریگەریی زۆری هەیە لە دروستكردنی كەسایەتی هەر زانایەكدا، (إبن تیمیة)ئەڵقەیەكی زنجیرەی خێزانێكی رەسەن و بنەماڵەیەكی ناودار بە شارەزایی و زانست و ڕەوشت بەرزی و چاكە خوازیی بووە، كە زانست و گەورەیی و رەوشتی بەرزیی، نەوە لەدوای نەوەو پشتا و پشت بۆ نەوەكانی جێ هێشتوە. رۆڵەكانی ئەو خێزانە ئاڵا هەڵگری زانست و زانیاری بوون، كە جێ پەنجەیان لەوبارەیەوە ئاشكرا و دیارە.

(ابن تیمیة) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە گەورەیی و رەسەنایەتیی و زانست و زانیاری زۆردا چاوی هەڵێناوە، بابی كە زانایەكی شارەزا و هەڵكەوتووبوو لە سەردەمی خۆیدا، ناوی دەركردوە و پایەیەكی تایبەتی هەبووە لەنێو زانایاندا، (شیخ الإسلام) ئەو ئاڵایەی هەڵگرت و درێژەی بەو ئەركە گەورەیە داوە و لەڕووی زانست و چاكەوە گەورەیی و پێگەیەكی ناوازەی بۆ بنەماڵەی (تیمیة) تۆمار كردوە، سروشتی ئەو بنەماڵە رەسەنە لە بواری زانیاری دا كە لەژیان و كاتی ناخۆشیی و هیجرەتیشدا، جگە لەكتێب هیچ زەخیرە و پاشەكەوتێكی نەبووە، یارمەتی دەربووە لە دروست كردنی كەسایەتی ئیمام(ابن تیمیة)دا، وێڕای هەبوونی چەند هۆكارێكی دیكەی سروشتی كە لە خۆیدا هەبوون و بوونە هۆی پەیداكردنی شارەزاییەكی زۆر، سەرەنجام لەسەرەتای گەنجێتییەوە لەنێو هاوشێوەكانی دا دەركەوت و، شایستەیی دەرس گوتنەوە و فتوادانی لەو تەمەنە دا بەدەست هێنا.

## بــابی (ابن تيمية):

به (شهاب الدين، ابو المحاسن، عبد الحليم کوڕی عبد السلام کوڕی عبدالله کوڕی ابوالقاسم کوڕی تیمیتی حەڕڕانی، ئیمام و زانای پایە بڵند و موفتی) ناسراوە.

ساڵی (٦٢٧) ی کۆچی لە (حەڕڕان) لەدایك بووە، زانستەکانی لە بابی و چەند زانایەکی دیکە وەرگرتوون، لەتەمەنی منداڵیی دا چۆتە (حەلەب) و لەسەر دەستی زانا و شارەزایانی ئەوێ فێری زانستەکان بووە.، تا وای لێهات بوو بە موفتی و زانا و خەتیبی (حەڕڕان).

**ئیمام (الذهبي) دەڵێ:** لەسەر دەستی بابی مەزهەبی حەنبەلیی خوێندوە و لێی شارەزا بووە، دەرسی گوتۆتەوە و فتوای داوە و کتێبی داناون، لەدوای بابی بۆتە مامۆستا و خەتیب و حاکمی ئەو شوێنە . پێشەوا و توێژەر بووە، شارەزایی زۆری لە عیلمەکان دا هەبوو، دەستێکی باڵای هەبووە لە (الفرائض والحساب) دا، دیندارێکی خۆ بەکەمگر و جوان رەفتار و سەخی بووە، یەکێك بووە لەچاکەکارانی رۆژگاری خۆی، لەساڵی (٦٦٧)ی کۆچی دا، خۆی وماڵ و منداڵ و خزمانی هیجرەتیان کردوە بۆ دیمەشق، ئەو لە (دار الحديث السكرية) لە (قصاعين) دادەنیشت لە زۆربەی زانستەکاندا نووسراو و کتێب و قسەی هەبووە، شەوی یەکشەممەی کۆتایی مانگی (ذی الحجة)ی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە و لە قەبرەستانی (الصوفية)دا لە دیمەشق نێژراوە[١].

---

(١) البداية والنهاية ١٣ / ٣٠٣ / الذيل على طبقات الحنابله ٣ / ١٦٧.



## دایکــی (ابن تیمـیة):

دایکی ئافرەتێکی باش و خواناس بووە بەناوی (ست النعم کچی عبدالرحمن کوڕی علی کوڕی عبدوسی حەڕڕانی) یە، ئەوتەنیا کوڕی هەبوون و کچی نەبوون، لەتەمەنی سەرووی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردوە.

دایکی لە دڵی (شیخ الإسلام) دا پلە و پایەیەکی بەرزی هەبووە، ئەو نامەیەی (شیخ الإسلام) لە بەندیخانەی قاهیرەوە بۆ دایکی ناردوە، ئەو راستییە دەسەلمێنێ کە پڕبوو لە ڕێز و سۆز و خۆشەویستی و دڵدانەوە بۆی. دایکی لەژیاندا بوو کە (شیخ الإسلام) لەساڵی (٧١٢)ی کۆچی لە میسر گەڕایەوە . ڕۆژی چوارشەممە ٢٠ شوالی (٧١٦)ی کۆچی وەفاتی کردوە و لە گۆڕستانی (الصوفیة) نێژراوە و خەڵکێکی زۆر ئامادەی جەنازەکەی و ناشتنی بوون[١].

## بــاپیـرى (ابن تیمیة):

شەرعزان و شارەزای قورئان و سوننەت و (شیخ الإسلام) و یەکێك لەزانا ناودارەکانی سەردەمی خۆی (مجدالدین ابوالبرکات عبدالسلام ی کوری عبدالله ی کوری ابوالقاسم الخضر کوری محمد کوری تیمیة ی حەڕڕانیی حەنبەلیی لە ساڵی (٥٩٠) ی کۆچی لە (حەڕڕان) لەدایك بووە، لەوێ قورئانی لەبەر کردوە و لەمامی کەناوی (فخرالدین) و زانایانی دیکەی ئەوێ، زانستەکانی وەرگرتوە، لە پێناوی بەدەست هێنانی زانیاری دا چۆتە (بەغدا) و شەش ساڵان لەوێ ماوەتەوە بە خوێندنی فیقهو زانیارییەکانی دیکەوە خەرك بووە، دوای ئەوەی چۆتەوە (حەڕڕان)، جارێکی دیکەش گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و زیاتر لە (١٠)

---

(١) البدایة والنهایة ١٤ / ٧٩ / الدرر الکامنة ١ / ١٥٩.

سالآن لەویێ ماوەتەوە و لەو ماوەیەدا شارەزایی و زانیاری زیادی کردوە و (الحافظ الذهبي) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لەبارەی ئەوەوە دەڵێ: مامۆستا و گەورەمان ابوالعباس پێی راگەیاندم کە (جمال الدینی کوڕی مالك) دەڵێ: فیقهو زانیاری بۆ (مجدالدین) نەرم بووبوو، وەك چۆن ئاسن بۆ (داود) نەرم بووبوو، دیسان ذەهەبی دەڵێ: شیخ (مجد الدین) لەزەمانی خۆیدا وێنەی نەبوو لە فیقهو ئوصوولْ و حەدیس و ماناکەی دا، دەستێکی باڵای هەبوو لە زانینی قورئان و تەفسیر دا، چەندین کتێبی داناون و بەچاکە ناوی رۆیشتوە، زۆر دیندار و زیرەك و خاوەن رێز و پلە و پایە بووە .

**(الحافظ الشریف عزالدین) دەڵێ:** لە حیجاز و شام وعیراق و مەملەکەتی خۆی (حەڕڕان) پێگەیی و کتێبی دەنووسین و دەرسی دەگوتەوە. ئەو یەکێك بوو لە ناوداران و گەورە زانایانی وڵاتەکەی، کە بنەماڵەکەی بە زانست و حەدیس و دینداریی ناوی دەرکردبوو، زۆر لە زانایان لای ئەو شت فێر بوون، بەناوبانگ ترینیان کوڕی خۆی بوو بەناوی (شهاب الدین عبدالحلیم) و الحافظ (عبدالمؤمن الدمیاطي) و چەند کەسێکی دیکەش، یەکێك لە نوسراوەکانی (الأحکام الکبری) وە کتێبی (المنتقی)یە لە حەدیسی ئەحکام دا کە بەبناغە و ئەسڵی کتێبی (نیل الاوطار) ی شەوکانی دادەنرێ، کە شەرحی کتێبی (المنتقی) ی کردوە، وە نوسراوێکیشی لە (اصول) دا هەیە کە (شهاب الدین)ی کوری لێی زیاد کردوە و دوای ئەو نەوەکەی - ابن تیمیة- لێی زیاد کردوە، ناوبراو لەدوای نوێژی جومعەی رۆژی جەژنی رەمەزان لەساڵی (٦٥٢) ی کۆچی لە (حەڕڕان) کۆچی دوایی کردوە و لەوێ نێژراوە[1].

---

(١) شذرات الذهب ٢٥٧/٥/ سیر أعلام النبلاء ٢٩١/٢٣ البدایة والنهایة ١٨٥/١٣.



## مامی باپیری شیخ الإسلام:

شەرعزان و خەتیب و واعظ (فخرالدین ابوعبدالله محمد کوڕی ابی القاسم الخضر کوڕی محمد کوڕی خضر کوڕی علی کوڕی عبدالله ناسراو بە (إبن تیمیەی حەڕڕانیی حەنبەلیی) . زانایەکی ناودار بووە، لە شوێنی خۆی ناوی دەرکردبوو، چۆتە (بەغدا) و لەوێ لەسەر دەستی (ابوالفتح ابن المنی) شارەزایی زیاتری لە حەدیس دا پەیدا کردوە، لە مەزهەبی ئیمام (احمد) دا بە کورتی کتێبێکی نووسیوە و گرنگی زۆری پێداوە، کە گەڕایەوە بۆ (حەڕڕان) رۆژانە لەوێ دەرسی تەفسیری قورئانی دەگوتەوە، لە مزگەوتی گەورەی (حەڕڕان) پێنج جار تەفسیری هەموو قورئانی کردوە، جاری یەکەم لە ساڵی (٥٥٨) ی کۆچی و جاری کۆتاییش لەساڵی (٦١٠)ی کۆچی.

کەسێکی دیندار و پارێزکار بووە، بە ئیمام و خەتیب لە مزگەوتی گەورەی (حەڕڕان) دیاری کرابوو، ناوبراو لەکۆتایی مانگی شەعبانی ساڵی (٥٤٢) ی کۆچی لە (حەڕڕان) لە دایك بووە و هەر لەوی لە (١١)ی صفری ساڵی (٦٢١) ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[١].

## براکانی شیخ الإسلام:

١- زانا و شەرعزان و موفتی و دنیا بە کەمگر (شرف الدین عبدالله کوڕی عبدالحلیم کوڕی عبدالسلام کوڕی ابی القاسم...)کەبرای (شیخ تقي الدین احمد بن تیمیة)یە، لە (١١) محرم ی ساڵی (٦٦٦) ی کۆچی لە (حەڕڕان) لە دایك بووە، منداڵ بووە کە لەگەڵ بنەماڵەکەی دا هاتۆتە دیمەشق، دەرسی

---

(١) وفيات الأعيان ٤/ ٣٨٦ - ٣٨٨ / طبقات الحنابلة ٢/ ١٥١.

لەلای زانایانی فیقهو تەفسیر و حەدیس خوێندوە و، شارەزایی زۆری پەیدا کردوە و فتوای لە مەزهەبی ئیمام احمد دا داوە.

کەسێکی دڵسۆز و سەر ڕاست و مەرد و ئازا بووە و قەناعەتی بە ژیانی سادە و کەم کردوە، عیبادەتی زۆری هەبووە و دنیا بە کەمگربووە، زۆر هەستی بە چاودێریی خوا کردوە و خاوەنی خێر و خێرات بووە و چەند جارێك حەجی کردوە، چەند جارێك لەلایەن نەیارانی داوای مناقەشەی لێکراوە و بەزاندوونی، لەگەڵ (شیخ الإسلام) ی برای دا لە(میسر) گیراوە. لە ڕۆژی چوار شەممەی (١٤) ی (جمادي الاولی)ی ساڵی (٧٢٧) ی کۆچی وەفاتی کردوە، دوایی بردویانە بۆ (قەلعة) و هەردوو براکەی (تقي الدین) و(عبدالرحمن) لە سجن دا نوێژیان لەسەر کردوە، دەنگیان بەرز دەکردەوە و دەگەیشتە خەڵکەکە، دوایی چەند جارێك نوێژی لەسەر کرا و ئنجا جەنازەکەیان لەسەر شان و سەری خەڵکی بردە قەبرەستانی (الصوفية) لە دیمەشق و لەوێ ناشتیان[1].

٢- زانای پایە بەرز (زین الدین ابو الفرج عبدالرحمن کوڕی عبدالحلیم کوڕی عبدالسلام بن تیمیەی حەڕڕانی، برای شێخ تقي الدین شیخ الإسلام) لەساڵی (٦٦٣) ی کۆچی لە (حەڕڕان) لەدایك بووە.

لەبەر خاتری (شیخ الإسلام) ی برای لە (اسکندریە و دمشق) لە سجندا لەگەڵی ماوەتەوە وەك دەربڕینی خۆشەویستی و بەمەبەستی خزمەتکردنی، تا شیخ الإسلام مردوە و دوای ئەو لە بەندیخانە هاتۆتە دەرێ، بە دینداریی زۆر و وەفا و ئەمانەت و خو و رەوشتی جوان بەناوبانگ بووە، ئەو زۆر رێزی لە (شیخ الإسلام) دەگرت و لە مەجلیسی ئەودا بەبێ دەنگ و جووڵە دادەنیشت، وەك ئەوەی باڵندە لەسەر شانی نیشتبێ، کە لەوبارەوە لێیان پرسیوە گوتویەتی: من هەندێك شت لەودا دەبینم کە جگە لەمن کەس نایبینێ، بۆیە پێویستە لەسەرم وەکو دەمبینی، ئاوابم لەگەڵ ئەودا، لە (٣) ذی الحجەی ساڵی (٧٤٧) ی کۆچی وەفاتی کردوە[2].

---

(١) الرد الوافر ص ٩٦ / مجموعة الشیوخ للذهبی ٣٢٣/١.

(٢) الدرر الکامنة ٢ / ٤٣٧ / البدایة والنهایة ٢٢٠/١٤.



(شیخ الإسلام) خزم و کەسی دیکەشی هەبوون کەزانا و دیندار و شارەزا بوون، ئەو لەو کەش و هەوا عیلمی و زانستی و بنەماڵە رەسەن و رێزدارەدا، لە هەڵگرانی ئاڵای دین و عیلم و فیقهدا ژیاوە و پێگەیشتوە و فێر بووە و خەڵکیشی فێر کردوە، تا سەرەنجام وەك زانایەکی ناوازە و هەڵکەوتوو ناوی دەرکردو زانا و شارەزایان و خەڵکی بەگشتی رێزیان لێ ناوە و گرنگییان پێ داوە و سوودیان لێبینیوە، و لەدوای خۆی سەدان کتێب و نووسراوی جێ هیشتوە، کە لەزۆربەی وڵاتاندا ناسراون و، هەرکاتێك نوێ کەرەوانی دین یان بانگخوازان و زانایانی پایە بڵند، باس بکرێن، ئەوە (شیخ الإسلام) لە ریزی پێشەوەیە، کە بێگومان ئەمەش بەخششێکی خوایە و دەیدات بە هەرکەسێك بیەوێ.



بەشی دووەم

# پێگەیشتن و گەڕان بەدوای زانیاریی دا

(شیخ الإسلام ابن تیمیة) لە خێزانێکی دینداردا کە بە زانیاری و زانست ناوی دەرکردوە، پێ گەیشتوە، کە باب و باپیران بۆ نەوە و رۆڵەکانیان جێیان هێشتوە، زۆر لە ئەندامانی ئەو خێزانە بەشێکی گەورەیان لەو زانستە پێ براوە، کەواتە شتێکی ئاساییە کە ئەو بنەماڵەیە گرنگی زیاد بە رۆڵەکانیان بدەن ولە نێویان دا(شیخ الإسلام) پەروەردە بکەن و، لەسەر خوڕەوشت و زانست و ئەدەبی بەرز و جوان پێی بگەیەنن و دووری بگرن لە ئاکاری پەست و ناشیرین.

(شیخ الإسلام) خووڕەوشتی دەوروبەرەکەی وەرگرت و بەدوای رێ و شوێنی باب و باپیرانی کەوت، کە باشترین جێگرەوە بوو بۆ ئەو پێشینە رەسەن و گەورە پیاوانە، بنەماڵەی ناوبراو کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر دروستکردنی کەسایەتیی (شیخ الإسلام) و هاندانی بۆ وەدەست هێنانی زانست و زانیاری لە سەرچاوە بێگەردەکان، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە، تا ئەوکاتەی گەیشتە قۆناغی دەرسگوتنەوە و، فتوادان و بوو بەنێوەندێکی پرشنگداری زانستی، ئەمەش سێ قۆناغ بوو:



## یەکەم:- قوناغی هیجرەت و جێگیربوون:

(شیخ الإسلام ابن تیمیة) لەسەردەمێکی پر لە ناخۆشیی و کارەسات و نائارامییدا لە دایك بوو، کە ژیانی مسولْمانان پربوو لە بەلاّ و گرفتاریی و رووداوی گەورە، لە داگیرکردنی تەتار بۆ ولاّتی مسولْمانان و، تەراتێن کردنیان لە شار و ئاوەدانییەکان دا و وێرانکردنی نیشانەکانی ئاوەدانکردنەوە و شارستانی و، بێبەزەیی و دڵ رەقییان لە کوشتنی مسولْمانان و بەدیل گرتنی ئافرەتان و بەتالاّن بردنی ماڵ سامانیان.

(شیخ الإسلام) سەرەتای ژیانی بووە کە بینیویەتی (تەتار) بەردەوام بووە لە فەساد و وێرانکاریی و کوشتاری بەناهەقی مسولْمانان، و هەر لەمنداڵییەوە دیمەنی فەساد و شەڕانگێزیی(تەتار)ی لە مێشکدا چەسپیبوو، بۆیە کە گەورەبوو، بوو بە پێشەوا و کەسایەتییەکی دیاری ئیسلام و، بەردەوام بانگەشەی جیهادی لە دژی تەتار دەکرد و خۆشی بە کردەیی بەشداریی دەکرد.

(إبن تیمیة) لە تەمەنی شەش ساڵاندا بوو کە تەتار بەسەر (حەڕڕان)ی داداوە و هێزی تێدا بەکار هێناوە و وێران و خاپووری کردوە، باپی (شهاب الدین عبدالحلیم) خۆی و خێزانی دەربەدەربوون و لە(حەڕڕان)ەوە بەرەو (دیمەشق) کەوتنە رێ لەگەڵ زۆر خێزانی دیکەی ئەو مەملەکەتە، کە لەبەر هەمان هۆ دەربەدەر بوو بوون، ئەو خێزانانە هەموو سەرمایەیان بریتی بوو لە کتێبی زانستیی کە دەیانویست لەگەڵ خۆیان دەربازیان بکەن، (شیخ شهاب الدین) زۆر لەسەر دڵی قورس بوو ئەو هەموو سەروەت و سامانەی لە کتێب و کەلەپووری ئیسلامیی، بەجێ بهێڵێ و تەتار بیسووتێنێ و پەرپووتی بکات، بۆیە هەر ئەوەندەی پێکرا زۆر لەو کتێبانەی هەیبوون لەگەڵ خۆی بیانبات، ئەوانەش کە وەك ئەو دەربەدەر بوو بوون و لەگەڵیدابوون لەوبارەوە یارمەتیان دەدا، ئەو زانا و خەتیب و پێشەوای ئاینی شارەکەشیان بوو، لە رێگا خەریك بوو (تەتار)

بیانگاتێ، چونکە ڕێگای دوور و ترسی تەتار و ماندووبوون و بێ وڵاغیی، زۆر شەکەت و بێ هێزی کردبوون، هەربۆیە ئەوان و ئەو خەڵکەی دیکەش کە بەیەکەوە بوون کەوتنە دوعا و پاڕانەوە کە خوای دەرووکەرەوە ڕزگاریان بکا و لەو بەڵایە چەپاڵەیان بدات، تاسەرەنجام خوای بەبەزەیی ڕزگاری کردن و بەسەلامەتی دەرچوون و ڕۆیشتن تا گەیشتنە دیمەشق و لەوێ جێگیر بوون[1].

## - جێگیر بوون لە دیمەشق:

هەر کە گەیشتنە دیمەشق و لەوێ جێگیر بوون، یەکسەر (شیخ شهاب الدین)ی بابی (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە مزگەوتی ئەمەویی و (مدرسة الحدیث السکریة) دەستی کرد بە دەرس گوتنەوە و ئامۆژگاریی کردنی خەڵکی، کە دەستێکی باڵای هەبوو لە فیقهو حەدیس و زانستەکانی دیکەدا، پێش خۆی ناو و شۆڕەتی ناوبراو لە (حەڕڕان)ەوە گەیشتبووە دیمەشق و، زۆر شوێنی دیکەش لەوڵاتانی ئیسلامیی، بۆیە بووبوو بەجێی ئومێد و ویستی قوتابیانی زانست و ئەوانەی شەیدای خوێندن بوون.

**ئیمام ذەهەبی دەڵێ:** هاتنی (شێخ شهاب الدین) لەگەڵ بنەماڵەکەی و دۆست و خزمانی بۆ دیمەشق، لەساڵی (٦٦٧) ی کۆچی بووە، کە یەکێك بووە لە ئەستێرە گەشەکانی ڕێنمایی کردنی خەڵك

**هەریەکە لە (البرزالی و ابن کثیر)** یش (ڕەحمەتی خوایان لێبێت)، ئاماژە بەوە دەکەن کە ناوبراو یەکێك بووە لە زانا ناودارەکانی حەنبەلیی و کەسێکی چاکەکار و بەکەڵك بووە، لە مزگەوتی دیمەشق کورسییەکی هەبووە، کە ڕۆژانی جومعە لەسەری دانیشتوە و قسەی بۆ خەڵك کردوە و ڕێنمایی کردوون و سەرپەرشتی (دار الحدیث السکریة) ی کردوە، کەدوای ئەو (شیخ تقي الدین، ابن تیمیة) ی کوڕی دەرسی تێدا گوتۆتەوە[2].

---

(١) البدایة والنهایة ١٣ /٣٢٥ تاریخ ابن الوردي ٢/ ٤٠٨.

(٢) البدایة والنهایة ١٣ /٣٢٠.



## دووەم: قۆناغی گەڕان بەدوای زانست و وەرگرتنی دا

مێژوونووسان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) بە ژیانێکی پاك و پارێزکاریی و چاکە خوازیی و خاوێن پێگەیشتوە و، خۆی لەسەر کەم خۆریی و گوێ نەدان بە جوانیی و چاکیی جلوبەرگ ڕاهێناوە و زۆر چاکەکاربووە بەرانبەر دایك و بابی، پارێزکار و دیندارێکی باش بووە، شەو نوێژی هەبووە و زۆر بەڕۆژوو بووە، لە هەق و سنوورەکانی خوا وەستاوە و، فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپەی ئەنجام داوە، زۆر حەزی لە زانست کردوەو خۆی ماندوو کردوە لە پێناو وەدەستهێنانیدا، بێزار و کول نەبووە لە خوێندنەوە و گەڕان و لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکان دا[1].

لە هەردەرگایەکی زانست چوویێتە ژووریێ، خوای زانا، بۆی خستۆتە سەرپشت و تێیدا سەرکەوتوو بووە، ئامادەی کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییەکان دەبوو، هەر لە منداڵییەوە وتووێژ و راگۆڕینەوە و مشت و مڕی لەگەڵ گەوران دەکرد و بێ دەنگی دەکردن، بەوە زانایانی پلە بەرزی سەرسام دەکرد، زمان پاراو و بیرتیژ بوو، بەخێرایی شتی دەخوێندەوە، کەم وێنەبوو لە زوو لەبەرکردنی دەق و نوسراوەکان دا، تەمەنی خۆی بۆ وەدەست هێنان و بڵاوکردنەوەی زانیاری و بانگەواز بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و جیهاد لە پێناو بەرزی وشەی (خوا) دا تەرخانکردبوو.

**لەوبارەوە (الحافظ الذهبي) دەڵێ:** نشأ - اي الشيخ تقي الدين (إبن تيمية) رحمه الله - في تصوف تام وعفاف وتأله وتعبد، واقتصاد في الملبس و المأكل، وكان يحضر المدارس والمحافل فی صغره، ويناظر ويفحم الكبار ويأتی بما يتحير منه أعيان البلد فی العلم، فأفتى وله تسع عشرة سنة، بل اقل، وشرع في الجمع

---

(١) الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٩٠.

والتأليف من ذلك الوقت وأكب على الإشتغال، ومات والده - وكان من كبار الحنابلة وأئمتهم - فقام بعده بوظائفه وله احدى و عشرون سنة، واشتهر امره، وبعد صيته في العالم)[1].

واتە (شيخ تقي الدين إبن تيمية) لە تەصەووف و پاکیی و دینداریی و خواپەرستییی دا گەورە بووە و ژیاوە، لە خواردن و بەرگ و پۆشاکدا گرتویەتەوە و دنیا نەویستانە رەفتاری کردوە، هەر لە منداڵییەوە ئامادەی کۆڕ و کۆبوونەوەکان دەبوو، دەرسی تێدا دەگوتنەوە، رووبەرووی گەوران دەبۆوە و لە وتوو وێژەکاندا بێدەنگی دەکردن، بەشێوەیەك گەورە زانایانی وڵاتی سەرسام دەکرد، لەتەمەنی (١٩) نۆزدە ساڵییدا بەڵکو کەمتریش بوو، کە فەتوای دەدا، لەوکاتەوە تێکەڵی نووسین و زانست کۆکردنەوە بوو، خۆی سەرقاڵکرد بە گەڕان بەدوای زانست و زانیاری دا. وەکە بابی مرد- کە یەکێك بوو لە زانا و پێشەوا گەورەکانی مەزهەبی حەنبەلیی- لەدوای ئەو بەئەرکی بابی هەستا، کە ئەوکات تەمەنی (٢١) بیست و یەك ساڵ بوو، بەوپێیە ناوی دەرکرد و ناوبانگی بەهەموو دنیادا بڵاو بۆوە.

### لەبەرکردن و فێربوونی زانیارییەکان:

### یەک: ناوبانگ دەرکردن بە لەبەرکردنی نووسین و دەقەکان:

(إبن تيمية) یەکێك بووە لە گەورە لەبەرکارانی سەردەمی خۆی، کە خوا توانایەکی زۆری لەبەرکردن و بیرێکی تیژی رۆشنی دابۆیە، بەشێوەیەك لەوبارەوە وێنەی پێ دەهێنرایەوە:

١- (شيخ محمد صادق عرجون) لەوبارەوە دەڵێت: (.... مێژوو لە پێشەوەی زانایانی دادەنێ، ئەوانەی لە لێهاتوویی و زیرەکیدا وێنەیان پێ دەهێنرایەوە، ئەو لە لەبەرکردندا کەسێکی ناوازە بووە، خاوەن بیر و هۆشێکی رۆشن بووە، هاوچەرخەکانی دەربارەی ئەو گوتوویانە: هیچ شتێکی لەبەر نەکردوە دوایی لەبیری چوبێتەوە، کەم تا زۆر تەماشای هیچ نووسراوێکی نەکردوە، مەگەر

---

(١) العقود الدرية ص٥ / تأريخ ابن الوردي ٢ / ٤٠٦.



لەبەری کردوە، هیچ شتێکی لە زانست و زانیارییەکان فێر نەبووە و دوایی لەبیری چوویێتەوە، ئەگەر دەربارەی ئیمام مالك کە پێشەوای ئەهلی مەدینە بووە، خوێندبێتمانەوە کە لەیەك مەجلیسدا سی تا چل حەدیسی لە پێشەوای فەرموودەناسان (ابن شهاب الزهري) بیستوە و یەکسەر لەبەری کردوە و کە خوێندویەتیەوە حەرفێکی لەبیر نەچۆتەوە، ئەوانەی حەدیسیان ریوایەت کردوە گێڕاویانەتەوە کە جارێکیان ئەو ئەندازەیەی گوێی گرتوە کە حەدیسی (سەقیفە) شی تێدابووە، بەو درێژیی و زۆری قسە و باسەشیەوە، لە دووبارە کردنەوەی دا یەك وشەشی زیاد و کەم نەکردوە، وە ئەگەر دەربارەی (ابوعبدالله الشافعي) بخوێنینەوە دەبینین کە لە مەجلیسێکدا گوێبیستی زیاتر لە دە حەدیس بووە لە مامۆستای خۆی -مالك بن انس- هەر لەو ماوەیەدا لەبەری کردوە و بەسەنەدەوە گێڕاویەتیەوە و، یەك وشە و پیتیشی لەگەڵ ئەوەی بیستبووی جیاوازیی نەبووە.

بەو شێوەیە زۆرن ئەوانەی خوای گەورە توانای لەبەرکردنی بەهێزی پێ بەخشیون لە ئیسلامدا و بیروهۆشێکی زۆر و رۆشنی پێ داون، ئەوەی هەر لە کاتی منداڵییەوە لە (إبن تيمية)دەگێڕنەوە لەکاتێکدا کەزۆر کەسیش بۆی لە کەمیندا بووە و ویستوویەتی بەناهەق عەیبانی لێ ببینێتەوە و لەکەداری بکات، مایەی ئەوەیە بەبێ دوو دڵیی لەو بارەشەوە لەگەڵ ئەو زانا و ناودارانەی ئیسلام دا لە ترۆپك دابنرێ[1].

٢- **(الحافظ الذهبي)** (رەحمەتی خوای لێبێت)، کە (ابن الوردی)لێ ی گێڕاوەتەوە باس لە بەهێزی لەبەر کردنی و زیرەکی زۆر و خێرا تێگەیشتنی دەکات[2].

٣- **(الحافظ عمر بن علی البزار)** (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (خوای گەورە تایبەتمەندیی زوو لەبەرکردن و درەنگ لەبیر چوونەوەی پێدابوو، کەم واهەبوو شتێکی خوێندبێتەوە یان گوێی لێ بووبێ و لە بیری چوویێتەوە، بەڵکو

---

(١) مجلة الوعي الإسلامي، السنة الثامنة عدد ٨٨ سنة ١٩٩٢ ص ٦٩.

(٢) تاريخ ابن الوردي ٢ / ٢٨٦.

یان بەمانا یان بە وشە لەبیری ماوە، دەتگوت زانست و زانیاری لەگەڵ گۆشت و خوێن و هەموو لاشەی دا تێکەڵ بووە[1].

٤- **(الحافظ ابن حجر)** (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (جمال الدین السرمري) گوتویەتی: (ومن عجائب ماوقع في الحفظ من أهل زماننا، أن (إبن تيمية) كان يمر بالكتاب مطالعة مرة، فينتقش في ذهنه، وينقله في مصنفاته بلفظه ومعناه)[2].

واتە: ئەوەی لەبارەی لەبەرکردن لەسەردەمی ئێمەدا جێ ی سەرسوڕمانە، ئەوەیە کە (إبن تيمية) یەکجار کتێبێکی خوێندبێتەوە لە مێشکیدا دەچەسپی، بەوشە و مانا دەیگواستەوە بۆ نووسراوەکانی .

٥- **(الحافظ صلاح الصفدی)** دەربارەی ابن تيمية دەڵێ:

(فما رأيت - ولا أرى - مثله في اطلاعه وحافظته، ولقد صدق ماسمعنا به عن الحفاظ الاول، وكانت همته عالية الى الغاية.....)[3].

واتە: وەك ئەوم نەبینیوە و نایبینم لە شارەزایی و لەبەرکردندا، ئەوەی لە زانایانی پێشوو دەربارەی ئەو بیستومانە بەڕاستیی گێڕا، هیممەت و ورەی بێ ئەندازە بەرز و گەورە بوو.

٦- **(ئیمامی ذەهەبی)** لە کتێبی (تذكرة الحفاظ) لەبارەی (إبن تيمية) وە دەڵێ: (كان من بحور العلم ومن الأذكياء المعدودين)[4].

واتە (إبن تيمية) لە کەسە شارەزاکانی زانیارییە و، یەکێکە لە زانا زۆر زیرەکەکان کە کەمن و دەژمێردرێن.

---

(١) الاعلام العلية ١٦، ١٨.

(٢) الدرر الكامنة ١٦٣/١.

(٣) الوافي بالوفيات ١٩/٧.

(٤) تذكرة الحفاظ ١٤٩٦/٤.



٧- (ابوالحسن الندوی دەڵێ بنەماڵەی (إبن تیمیة) م بە بەهێزیی بیروهۆش و زۆر و زوو لەبەرکردنی زانستەکان ناسیوە، باب و باپیری زیرەك و بیر تیژ بوون، بەڵام (تقي الدين، ابن تیمیة) لەو نیعمەتەدا پێش بنەماڵەکەی کەوتۆتەوە، بیر تیژیی و خێرایی لەبەرکردنی ناوبراو مامۆستا و زانایانی سەرسام کردبوو، کە بەوە ناوی لە دیمەشق دەرکردبوو[1].

یەکێك لەو نموونانەی لەسەر خێرایی لەبەرکردنی باس کراون:

ئەو لەتەمەنی حەوت ساڵاندا هەموو قورئانی لەبەر کردوە، کەخوای گەورە رێزی لێناوە و ئەو نیعمەتەی بۆ هێشتۆتەوە تا مردوە، هیچ شتێکی لەوە لەلا ئاسانتر نەبووە کە لەکاتی باسکردنی بەڵگەکانی و فتوا و نووسینی کتێبەکانی دا، ئایەتەکانی قورئان لە شوێنی خۆیان وەك دەلیل و بەڵگە، بەئاسانیی بهێنێتەوە بەپێی حاڵ و مەقام[2].

٨- (أبو مظفر جمال الدين السرمری) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: لەو شتە سەرسوڕهێنەرانەی دەربارەی ئەو لە هێندێك لە هاوەڵانی بیستوومە: کاتێك لەسەرەتای منداڵیدا بووە، بابی ویستوویەتی منداڵەکانی بەمەبەستی سەیران بەرێتە دەرێی ئاوەدانی، بابی پێی گوتوە: (أحمد) تۆش لەگەڵ براکانت وەرە، وەدەر دەکەوین بەمەبەستی گەشت و سەیران، (أحمد)یش چوونە دەرێی پێ ناخۆش بوو، بۆیە داوای لەبابی کرد نەچێت، پێی گوت: بابە گیان! پێم خۆشە لە نەهاتنم بمبووری، بابیشی رازی بوو، ئەمان چوونە دەشت و دەر و ئەویش لەماڵێ مایەوە، لای ئێوارێ کە باب و براکانی گەڕانەوە، بابی گوتی: ئەمڕۆ براکانت پێیان خۆشبوو تۆش لەگەڵ بای، بۆچی نەهاتی؟ ئەویش گوتی: بابی بەڕێزم! من ئەمڕۆ ئەم کتێبەم لەبەرکردوە، بابی بەسەرسامیەوە گوتی چۆن ئەم کتێبەت لەبەر کردوە ؟ وتی بەڵێ حەز دەکەی لێم بپرسەوە، کەلێی پرسیەوە بۆی دەرکەوت کە هەمووی لەبەر کردوە، بۆیە نێوچاوانی ماچ کرد و گوتی: کوڕی

---

(١) ابن تيمية للندوی ص ٣٧.

(٢) الأعلام العلية ص ١٧/ تاريخ ابن الوردي ٢/٢٨٦.



خۆم ئەوەی کردوتە بەکەسی مەڵێ، نەك بکەویە بەرچاوی پیس[١].

(صلاح الصفدی) (رەحمەتی خوای لێبێت) ئەو چیرۆکەی گێڕاوەتەوە و ناوی کتێبەکەشی نووسیوە کەلەبەری کردوە بەناوی (جَنّة المناظر و جُنّه المُناظر) کە کتێبێکی بچووکە بەڵام بەناویانگە.

## دووە: ئەو زانیارییانەی فێریان بووە:

شارەزاترین کەس بەهەر زانایەك قوتابی و هاوسەردەمیەکانینی، بەڕاستیی هیچ زانایەك ئەوەندەی (شیخ الإسلام) باسی زانایی و گەورەیی نەکراوە، لەسەر ئەو زانست و ئاستە بەرزەی هەیبووە.

ئەوەتا یەکێك لە گەورەترین قوتابیەکانی زانای گەورە (ابن عبدالهادي) سەرەتای کاری (إبن تیمیة) و زانایی ئەو باس دەکات و دەڵێ: سەرەتای کار و ژیانی لای زانایان پێگەیشتوە و لە پەرداخی زانست نۆشیویەتی و لەخوانی فیقهو تێگەیشتن و کتێبەکانی کۆکەرەوەی زانیارییەکان خواردوویەتی، خۆی بە غەیری خوێندنەوە و خەریك کردن بەکاری گرنگ، سەرقاڵ نەکردوە، بەتایبەتی زانستەکانی قورئان و حەدیس و ئەوانەی پێویستن بۆ تێگەیشتن لەوان، بەردەوام ئەوە رەفتاری بوو، ئینسانێکی پارێزکار و هەردەم روو لەخوا بوو. لەسەر رێی پێشینی چاك دەڕۆیشت، زۆر چاکەکاربوو لەگەڵ دایکی، پاك و بەندەیەکی راست و ساغ بوو، زۆر بەڕۆژوو دەبوو، شەونوێژی زۆربوو، لەهەمموو کات و بۆ هەموو کارەکانی یادی خوای دەکرد، بۆ هەموو شتێك و لەهەمموو کارەکاندا دەگەڕایەوە بۆ لای خوا، بە حوکمەکانی خوا پابەند و لەسەر بڕیارەکانی خوا دەوەستا و فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکردن و قەدەغەکانی نەدەشکاندن، بە شێوازی جوان زۆر فەرمانی بەچاکە و رێگیری لەخراپە دەکرد، لە زانست و زانیاری تێرنەدەبوو، لە خوێندنەوە تینوایەتی نەدەشکا، لەگەڕان بەدوای زانستدا بێزار و لە توێژینەوە کول نەدەبوو، کەم وا هەبوو لە بەشێك لە بەشەکانی هەر

---

(١) الرد الوافر ص ٢٣٤ - ٢٣٥.



زانستێك چوویێتە ژووری، خوای گەورە چەند دەرگایەکی لێ نەکردبێتەوە و چەند شتی فێر نەکردبێ، بەهۆی کەسانی زاناوە.

گوێم لێبوو دەربارەی بنەمای کارەکانی دەیگوت: بۆهەر مەسەلەیەك کە بە خەیاڵمدا دێ و بیری لێ دەکەمەوە و ناگەمە ئەنجام و لێ ی توشی ئیشکالێك دەبم، هەزارجار یان کەمتر (استغفر الله) دەکەم هەتا سینەم گوشاد دەبێ و ئەو شتەم بۆ حەل دەبێ، وەدەڵێ: وە لەوکاتانەدا کە لەبازاڕ یان لە مزگەوت یان لە رێگا یان لە قوتابخانە بم، ئەو شتانە رێگر نین لێم کە یادی خوا یان (استغفر الله) بکەم، بۆ ئەوەی بگەمە مەبەستی خۆم و حەلکردنی مەسەلەکان[1].

(شیخ الإسلام) لە زانستە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی دا کارامە و شارەزابوو، بەشێوەیەك مێژووی زانستیی لەئیسلامدا کەسێکی دیکەی وەك ئەوی نەناساندوە، شارەزابوو لەهەموو ئەو زانیارییانەی لەو سەردەمەدا هەبوون، لە کاتێکدا گەیشتبوونە چڵە پۆپە لە کامڵ بوون و پێگەیشتندا، ئەو دەیخوێندنەوە و تێیان دەگەیشت، ئەو هەڵە و کەموکوڕییانەی تێشیاندابوو دەستنیشانی دەکردن و رەخنەی لێ دەگرتن و، شتە راست و بەسوودەکانیشی سوود لێ دەبینین، زۆر لە شارەزا و هەڵکەوتووانی سەردەمی خۆی، شاهێدی فەزڵ و گەورەییان بۆ (شیخ الإسلام) داوە، کە شەهادەتی ئەوان شانازییە لەژیانی ئەو بانگخواز و موجاهید و پێشەوا گەورەیەدا، کە ئەمانە هێندێکن لەو شاهیدانە:

١- زانا و پێشەوای سەردەمی خۆی لە زانستەکانی فەرموودەناسی دا (ابن دقیق العید) (رەحمەتی خوای لێبێ)، کە لە نزیکەوە ناسیویەتی، پرسیاری لەو بارەیەوە لێ کراوە، دەڵێ: (رأیت رجلا جمع العلوم کلها بین عینیه، یأخذ منها ما یرید، ویدع ما یرید)[2].

واتە: ئەو پیاوەم بینیوە، هەموو زانیاریەکانی لەبەرچاوانەو کۆی کردۆتەوە، ئەوەی بیەوێ لێی وەردەگرێ و، ئەوەی بیەوێ وازی لێدێنێ.

---

(١) العقود الدریة ٥ - ٦.

(٢) الرد الوافر ص١٠٧/ تاریخ ابن الوردي ٤٨/٢.

٢- زانا و پێشەوا لە حەدیسدا (جمال الدين المزى) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (مارأيت أحدا اعلم بكتاب الله وسنة رسوله ولا أتبع لهما، منه)[1].

واتە: کەسم نەدیوە لەوی زاناتربێ لە قورئان و سوننەتدا و، لەوی زیاتر پابەند بوبێ پێیانەوە.

٣- زانا و شارەزا و مێژوونووس (ابن سيد الناس) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (نزیکە هەموو سوننەت و شوێنەوارەکان لەبەر بکا، ئەگەر قسەی لە تەفسیر بکردایە، ئەوە ئاڵا هەڵگری بوو، ئەگەر لە شەرع و فیقهدا فتوای دابایە، مەبەستی دەپێکا، ئەگەر قسەی لە حەدیس بکردبایە زانا و شارەزای تەواوی ئەو بوارەش بوو، دەربارەی میللەتان و تاقم و پێڕ و بەرنامە و شەریعەتەکانیش، بەهەمان شێوە شارەزابوو، لەهەموو زانستەکاندا لە ناو هاوشێوەکانی دا شارەزاتربوو[2].

٤- زانا و شارەزای پایە بەرز (كمال الدين بن الزملكاني) دەڵێ: خوای توانا زانستەکانی بۆ نەرم کردبوو وەك چۆن ئاسنی بۆ (داود) نەرم کردبوو، ئەگەر دەربارەی شتێك پرسیاری لێ کرابایە، هەر کەسێك بیستبای یان بینیبای لەکاتی وەڵام دانەوەدا، دەیگوت: جگە لەو شتە هیچی دیکە نازانێ، قەناعەتی وادەبوو کە کەس وەك ئەو ئەو شتە نازانێ، شارەزا و شەرعزانان ئەگەر لە مەجلیسی ئەودا ئامادەبان، لەمەزهەبەکانی خۆیان سوودیان لە (شيخ الإسلام) دەبینی، سەبارەت بە شتێك کەپێشتر نەیانزانیوە، نەزانراوە وتووڕژی لەگەڵ یەکێکدا کردبێ و نەیگەیاندبێتە قەناعەت، قسەی لە هیچ زانیارییەك لە زانیارییەکان نەکردوە - عەقلی و نەقلی-، مەگەر بەسەر پسپۆڕانی ئەو زانیارییانەدا باڵا دەست و سەرکەوتوو بووە. دەستێکی باڵای هەبووە لە دانانی کتێب و نووسین و ڕێکخستنی بابەتەکان و دەربڕینی جوان و ڕوونکردنەوەی مەسەلەکان دا[3].

---

(١) شذرات الذهب ٨٤/٦.

(٢) العقود الدرية ص ١٠/ الرد الوافر ٥٨ - ٥٩.

(٣) الرد الوافر ص ١٠٥. العقود الدرية ٧ - ٨



خوێنەر بەپێ ی ئەو دەقانەو ئی دیکەش بۆی دەردەکەوێ کە (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، هەموو ئەو زانیارییانەی زانیون کە لەسەردەمی خۆیدا هەبوون، هیچ لایەنێکی لە زانستەکانی وەلا نەناوە، مەگەر لێی شارەزا بووە، هەر بۆیە زانا و شارەزایانی سەردەمی خۆی، شاهێدیان لەسەر گەورەیی و بەرزی پلە و پایەی زانستیی ئەو داوە.

٥- زانای گەورە (ابن رجب) (رەحمەتی خوای لێبێت) لەوبارەوە دەڵێ: (گرنگیی زۆری بە حەدیس داوە و چەندجار گوێی گرتوە بۆ (مسند)ی ئیمام ئەحمدوشەش کتێبەکەی دیکەی حەدیس (البخاري، مسلم، النسائي، الترمذي، ابوداود، ابن ماجه) و (معجم الطبراني الكبير) و چەندین کتێبی دیکەش، خۆیشی دەیخوێندەوە، هەر لە منداڵیەوە دەستی بە خوێندنەوەی زانستەکان کردوە، فیقهو ئوسوڵی فیقهی لای بابی و (شیخ شمس الدين بن ابى عمر) و (شيخ زين الدين بن المنجا) فێر بووە و لەو بارەوە پێگەیشتووە، وەماوەیەك بنچینەکانی زمانی عەرەبی لای (سليمان بن عبدالقوى) خوێندوە، دوایی کتێبی (سيبويه)ی خوێندۆتەوە و تێی گەیشتوە، ئنجا خەریکی تەفسیری قورئان بووە و لەویشدا ناوی دەرکردوە، لە بوارەکانی (اصول و فرائض و حساب و جبر) و.. زۆر ئاگادار بووە، لە (علم الكلام) و فەلسەفەشدا زیرەك بووە و بەرپەچی زانا و شارەزایانی داوەتەوە. پێش تەمەنی بیست ساڵی دەرسی گوتۆتەوە و فتوای داوە، خوای گەورە یارمەتی داوە بە نووسینی کتێبی زۆر و زوو شت لەبەرکردن و هێزی بیر و هۆش و تێگەیشتن و کەم لەبیر چوونەوە. هەتا زۆر کەس گوتوویانە قەد شتێکی لەبەر نەکردوە و لەبیری چووبێتەوە[1].

٦- زانا و شارەزا (ابن عبدالهادي) (رەحمەتی خوای لێبێت)، گوتوویەتی: (وشيوخه الذين سمع منهم اكثر من مئتي شيخ) واتە: ئەو زانا و مامۆستایانەی زانیاری لێ وەرگرتوون و گوێی بۆ گرتوون، لە دووسەد زانا زیاترن. دواتر دەڵێ چەند جارێك گوێی گرتوە بۆ (موسنەدی ئیمام ئەحمد) و شەش کتێبە گەورەکە و

---

(١) الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٨٧.

(معجم الطبراني الكبير) و گرنگی زۆری بە (حدیث) داوە، وێڕای فیقهو (اصول) و زمانی عەرەبی، دوایی بەخەستیی گرنگیی بە تەفسیر داوە و تێیدا بووە بە پێشەنگ، کە ئەوکات تەمەنی لە خوار بیستساڵیدا بووە[١].

٧- زانای گەورە (الذهبي) یش زۆر باسی گەورەیی و شارەزایی (شیخ الإسلام) لە هەموو زانستەکان دەکا و بە موجتەهیدی ڕەهای دەزانێ و لە بارەیەوە دەڵێت: (وهو اعظم من ان یصفه کلمي، أو ینبه علی شأنه قلمي، فان سیرته وعلومه ومعارفه، ومحنه وتنقلاته یحتمل ان توضع في مجلدتین)[٢].

واتە: ئەو لەوە گەورەترە من وەصفی بکەم، یان قەڵەمەکەم لە باسی ئەو بنووسێ، چونکە ژیان و زانیاری و زانینی و هاتوچۆ و گرفت و ناخۆشییەکان کەتووشی بوون، دەشێ دوو کتێب(مجلد)دابگرن.

## سێ: شارەزایی لە زمانەکانی دیکەدا

شیخ الإسلام (إبن تیمیة) جگە لە زمانی عەرەبی چەند زمانێکی دیکەشی زانیوە وەك زمانی (عیبری) کەوای لێکردوە بەچاکی پەیمانی کۆن و نوێ[٣]. دوای ئەوەی دەستکاریی کراون بخوێنێتەوە و بەرپەرچی ئەوشتانەش بداتەوە کە گۆڕدراون و تێیاندا زیاد کراون.

خۆی دەڵێ: (چەند وشەیەکی تەوراتم بە عیبریی بیست لە یەکێکی (اهل الکتاب)، تەماشام کرد هەردوو زمانەکە زۆر لەیەك نزیکن، هەر بەوەی عەرەبیم دەزانی لەزۆر وشەی (عبری)ش دەگەیشتم[٤].

---

(١) العقود الدرية ص٣ تاريخ ابن الوردى ٤٠٦/٢.

(٢) العقود الدرية ص ٢٣ -٢٤.

(٣) پەیمانی کۆن (العهد القدیم) واتە: تەورات و کتێبەکانی کە لەگەڵنی و (العهد الجدید) واتە: چوار ئینجیلەکان و کتێبەکانی دیکە کە لە گەڵیانن..

(٤) مجموع الفتاوى ١١٠/٤.



ئەو زمانەکانی (تورکی و لاتینی)شی زانیون، وەك دەقێك لە (مجموع الرسائل الكبرى) دا هاتوە[١].

لەوەوە کەڕابرد دەردەکەوێ کە زاناکانی سەردەمی خۆی گەواهی گەورەیی و شارەزایی و لێهاتوویی (شیخ الإسلام) یان داوە و بەو پێیە لە (تەفسیر و حەدیس و فیقهو نەحو و صەرف و بەلاغە و ئوصول و فەلسەفە و جەبر و حیساب و عەقیدە و.. هتد)دا شارەزا بووە و لە دینەکانی (یەهودیی و نەصرانیی و کۆمەڵە گومڕا و رێ لێ تێکچووەکانی کۆن و تازە) ئاگادار بووە و لەشارەزایی دا وێنەی پێ هێنراوەتەوە وە یەکەمینی ئەو سێ کەسە بووە کە شاعیر شیعری بەناویانەوە گوتوە و دەڵێ:

ثلاثة ليس لهم رابـــع في العلم والتحقيق والنسك
وهم اذ شئت ابن تيمية وابن دقـيق العيد والسبكي

ئیمام(سیوطي) (رەحمەتی خوای لێبێت) لەبارەی زیرەکیی و توانایی زانستیی (شیخ الإسلام) باس دەکا و گەورەیی ئەو لەو بارەوە دەردەخا[٢].

(الحافظ الذهبي) دەڵێ: (لو حلفت بين الركن والمقام لحلفت أنى ما رأيت بعيني مثله وأنه ما رأى مثل نفسه في العلم)[٣].

واتە: ئەگەر لە نێوان روکنی بەردە رەشە و مەقامی ابراهیم سوێند بدرێم، ئەوە سوێند دەخۆم کە من بەهەردووك چاوی خۆم کەسی وەك (إبن تیمیة)م نەبینیوە، و سوێند بەخوا خۆشیی کەسی وەك خۆی نەبینیوە لە زانیاری دا.

---

(١) مجموع الرسائل الكبرى ١/ ١٢٤.

(٢) ابن تيمية لابى زهرة ص١١٦.

(٣) الذيل على طبقات الحنابلة ٣٨٩/٢ – ٣٩٠ / شذرات الذهب ٨٧/٦ -٨٢.



## سێیەم: قۆناغی سەرەتای بەخشینی زانیاری و فتوادان

وەك باسمان کرد (إبن تيمية) هەموو ئەو زانیارییانەی چاك دەزانین کە لە سەردەمی خۆی دا هەبوون و ڕەواجیان پێ درابوو، لەسەرەتای تەمەنیەوە خەڵك شتی لێ فێر دەبوو، خوا یارمەتی دا کە لەو بوارەدا دەوری خۆی ببینێ و خوێندکارانی زانستە شەرعییەکان سوودێکی زۆری لێ ببینن،

(شيخ الإسلام) لەخوێندنەوە و گەڕان بەدوای زیادکردنی زانیاری دا ماندوو و کول نەدەبوو، کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدەدا، بەهۆی ئەو بیر تیژیی و زیرەکیەی خوای بەخشندە پێی بەخشیبوو زانیارییەکەی ئەوەندەی دیکە بەرەکەتدار و فراوانتر بوو بوو، کە ئەوە وایکرد پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە بیست ساڵی شایستەی دەرس گوتنەوە و فتوا دان بێ:

١- ئیمام (الذهبي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەو بارەوە دەڵێ: (تأهل للتدريس والفتوى وهو ابن سبع عشرة سنة).[1]

واتە: (شيخ الإسلام) لەتەمەنی حەڤدە ساڵیی دا شایستەی دەرسگوتنەوە و فتوادان بوو .

وە دەڵێ: (.. فأفتى و له تسع عشرة سنة، بل أقل، وشرع فى الجمع والتأليف من ذلك الوقت، وأكب على الإشتغال)[2].

واتە: لە تەمەنی نۆزدە ساڵی دا بەڵکو کەمتریش فتوای داوە و لەو کاتەوە چۆتە ناو کتێب نووسین و هەوڵی بەردەوامی داوە بۆ وەدەست هێنانی زانیاری.

---

(١) العقود الدرية ص٢٤.

(٢) العقود الدوية ص٤.



٢- زانای گەورە (ابن کثیر) لە (البدایة والنهایة) دا باسی ئەوە دەکات کە (احمد بن نعمة المقدسي)(رەحمەتی خوای لێبێت) یەکێك بووە لەو زانایانەی مۆڵەتیان داوەتە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) بۆ فتوادان و، شانازیی بەوەوە دەکرد کە ئەو مۆڵەتی داوەتە (شیخ الإسلام) و دەیگوت؛ (أنا أذنت لإبن تیمیة بالافتاء)[١].

واتە: من مۆڵەتم داوە بە (إبن تیمیة) فتوا بدات.

## مردنی بابی و دەرس گوتنەوەی لە شوێنی ئەو :

پاش ماوەیەکی کەم لە مۆڵەت درانی بە فتوادان، بابی (شیخ شهاب الدین) کە زانایەکی ناودار بوو وەفاتی کرد، (شیخ الإسلام) ی کوڕی کە تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، بۆ دەرس گوتنەوە جێ ی گرتەوە .

١- **ئیمام ذەهەبی دەڵێ:** (مات والده وکان من کبار الحنابلة وأئمتهم فدرس بعده بوظائفه، و له احدی و عشرون سنة، فاشتهر امره و بعد صیته في العالم)[٢].

واتە: بابی کە یەکێك بووە لە گەورە زانایان و پێشەوایانی مەزهەبی حەنبەلیی وەفاتی کردوە، لەدوای ئەو (شیخ الإسلام) کە تەمەنی بیست و یەك ساڵ بوو، بە ئەرکی دەرس گوتنەوە هەڵسا و ناوبانگی دەرکرد و ناوی بەدنیادا بڵاو بۆوە.

٢- **(ابن کثیر)** (رەحمەتی خوای لێبێت) لە مێژووەکەیدا لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٨٣)ی کۆچی دا دەڵێ: ڕۆژی دووشەممەی دووی موحەڕرەمی ئەو ساڵە، زانا و پێشەوا (شیخ تقي الدین احمد بن تیمیة) ی حەڕڕانی لە (دار الحدیث السکریة)دا دەرسی گوتۆتەوە[٣].

---

(١) البدایتوالنهایة ٣٤١/١٣.

(٢) العقود الدریة ص٥.

(٣) البدایة والنهایة ٣٠٣/١٣.

**٣- زانای ناودار (ابن رجب)** (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: کە بابی - شیخ شهاب الدین - وەفاتی کرد، تەمەنی (إبن تیمیة) بیست و یەك ساڵ بوو بەکارەکانی بابی هەستا و لە (دارالحدیث السکریة)دا لەسەرەتای ساڵی (٦٨٣) دەرسی گوتۆتەوە[1].

## ئەو زانایانەی لەیەکەم دەرسی (شیخ الإسلام) ئامادە بوون:

لە کۆتایی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچیی دا، کە بابی (شیخ الإسلام) - شێخ شهاب الدین - وەفاتی کرد تەمەنی (شیخ الإسلام) پێی نابووە بیست و دوو ساڵیی، خەڵکی بە چۆڵ بوونی شوێنی (شیخ شهاب الدین) دڵگران بوون، بەڵام نارەحەتی و دڵگرانییەکەیان زۆری نەخایاند و (شیخ الإسلام تقي الدین ابن تیمیة) ی کوڕی جێ ی گرتەوە و ئەو کەلێنەی پڕکردەوە، یەکەم دەرسی لە رۆژی دووشەممەی دووی موحەڕرەمی ساڵی (٦٨٣)ی کۆچی بوو، کە لەودەرسەدا زانایانی گەورەی دیمەشق ئامادەی بوون وەك: (قاضي القضاة بهاء الدین بن الزکي الشافعي، شیخ تاج الدین الفزاري گەورەی مەزهەبی شافیعیی، شیخ زین الدین ابن المرحل، زین الدین بن المنجای حەنبەلی) و هێندێك لە زانایانی حەنەفی و زۆری دیکەش لە زانایان[2].

## گرنگیی ئەو دەرسە:

ئەو دەرسە کاریگەریی هەبوو لەسەر دڵ و دەروونی ئامادەبووان، وای کرد زۆر زانایی و زمان پاراویی و خێرایی گەیاندنی مەبەست و ئازایی ئەو زانا گەنجەیان بۆ دەرکەوێ و هەموویان مەدحی بکەن و دان بە لێهاتوویی ئەودا بێنن، لەوبارەوە (ابن کثیر) دەڵێ: لەبەر گرنگیی و بەسوودیی دەرسەکە (شیخ تاج الدین الفزاری) دەرسەکەی نووسیەوە، کە ئامادەبووان بە دەرسێکی چاك و

---

(١) الذیل علی طبقات الحنابلة ٢/٣٨٧.

(٢) البدایة والنهایة ١٣/٣٠٣.



بەسوودیان لەقەڵەم دا و زۆر سوپاسیان کرد کە بەو تەمەنە کەمەوە ئەو خزمەتە گەورەیە دەکات، کە تەمەنی بیست و دوو ساڵ بوو.[1]

**(ابن رجب)** (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: دەرسێکی گرنگی لەسەر (بسم الله الرحمن الرحیم) پێشکەش کرد، کە لەنێو خەڵکی دا دەنگی دایەوە و ئامادەبووان زۆر بەگرنکیان زانی.

(شیخ الإسلام) لەمزگەوتی ئەمەویی لە دیمەشق، دوای نوێژی جومعە لەسەر کورسییەك کە بۆی ئامادەکرابوو، دادەنیشت و تەفسیری قورئانی دەکرد، خەڵکێکی زۆر بۆی کۆدەبۆوە و سوودیان لێ دەبینی، بەهۆی ئەو هەموو زانیارییە جۆراوجۆرەی پێشکەشی دەکردن، لە شوێنی دووریشەوە بۆ دەرسەکانی دەهاتن.

## شێوازی دەرس گوتنەوەی (شیخ الإسلام) :

الحافظ (ابو حفص البزار)دەربارەی شێوازی دەرس گوتنەوەی دەڵێ: من تا لە دیمەشق بوومایە بەشدارییم لە دەرسەکانیدا دەکرد و نەمدەفەوتاندن، ئەو پێش دەرس گوتنەوە هیچ ئامادەکارییەکی نەدەکرد،، دادەنیشت و حەمد و سوپاسی خوای دەکرد و بەجوانترین وتام و چێژترین شێوە سەڵەواتی لەسەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەدا، کە ئەو شێوەیەم جگە لەو لە کەسی دیکە نەبیستبوو، ئنجا دەچووە نێو دەرسەکەوە، خوا دەرگای زانیاری بۆ دەکردەوە، شتی ورد و شاراوەی ئاشکرا دەکرد و، بەڵگەکانی بە ئایەت و حەدیس و قسەی زانایان دەهێنایەوە، باسی راستییەکانی دەکردن، یان ئەگەر ڕەخنەی لەشتێك گرتبایە، بە بەڵگەوە ڕوونی دەکردەوە و، هێندێك جاریش شاهێدی بەشیعری عەرەبی دەهێنایەوە و ناوی خاوەنەکەشی دەهێنا، ئەو وەکو رووبار نەدەوەستا و وەك بەحر سەر ریژی دەکرد لە زانیاری زۆر و شتەکانی دادەپۆشی، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەرسەکە وەك کەسی لەلا نەبێ چاوەکانی لێك دەنان و دەکەوتە نێو

---

(١) البداية والنهاية ١٣/٣٠٣.

باسەکان، بێ گرێ و ڕاوەستان، هەرکەسێك دەیبینی و، گوێ ی بۆ دەرسەکانی دەگرت، بەقسە و هەڵس و کەوت و دیمەن و ڕەنگ و ڕووی سەرسام دەبوو.

هیچ کاتێك ناوی پێغەمبەری(صلی الله علیه وسلم) نەدەهێنا مەگەر سەڵات و سەلامی بۆ دەنارد، سوێند بەخوا کەسم نەدیوە ئەوەندەی ئەو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی بە گەورە گرتبێ و، داکۆکیی کردبێ لە شوێن پێهەڵگرتن و پشتگیریی کردن لەوەی پێی هاتوە. ئەگەر حەدیسێك بۆ مەسەلەیەك هەبووبێ کاری پێکردوە و ئاوڕی لە قسەی یەکێکی دیکە لە دروستکراوەکان نەداوەتەوە، هەرکەسێك بووبێ، وە دەیگوت: هەموو کەسێك دەلیل دەهێنرێتەوە بۆ ڕاستیی قسەکەی، نەك دەلیل بە قسەکەی بهێنرێتەوە، جگە لەخوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

کە لەدەرسەکە دەبۆوە و چاوەکانی دەکردنەوە، بەڕوویێکی جوان و خۆشەوە ڕووی دەکردە خەڵکەکە و وەك ئەوەی ئەوکات پێیان گەیشتبێ، جارجار عوزریشی بۆ هێندێکیان دەهێنایەوە لە هەر کەموکوڕییەك، وە ئەوەی باسم کرد هەموو ئەو خەڵکە زۆرەی لە دەرسەکانی ئامادە دەبوون، هاوڕان لەگەڵ مندا،کە سوپاس بۆ خوا خەڵکێکی زۆر بوون لە زانایان و سەرۆك و ناودار و فەرموودە ناس و ئەدیب و شەرعزان و قورئان خوێن و کەسانی دیکەی گشتی[1].

**(الصفدي)** (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (... واجتمعت به مرات، وكنت احضر دروسه في الحنبلية، ويقع لي أثناء كلامه فوائد لم أسمعها من غيره، ولا وقفت عليها في كتاب)[2].

واتە: زۆر جار لە خوێندگای (حەنبەلییە) لە دەرسەکانی دائامادە دەبووم و لەگەڵی کۆدەبوومەوە، لەکاتی قسەکردنی دا سوودم زۆر لێ دەبینی، کە ئەو شتانەم لە غەیری ئەو نەبیستبوون، لە هیچ کتێبێکیش دا نەمدیبوون.

---

(١) الأعلام العلية ٢٧ - ٢٩.

(٢) الوافي بالوفيات ١٩/٧.



**دەرسەکانی چۆن بوون؟**

هەرچەندە بوار و لایەنەکانی دەرسەکانی زۆر بوون، بەڵام یەك شت کۆی دەکردنەوە، کە ئەویش ئەوەبوو دەیویست ئەوەی هاوەڵان لەسەدەی یەکەم دا لەسەری بوون و ئیسلامی ساغیان وەرگرتوە، دوور لە بیر و بۆچوونی نامۆ، زیندوو بکاتەوە و ئەوەی پەیڕەو دەکرد کە ئیسلام وەك سەردەمی هاوەڵان ڕانوێنێ، لە بوارەکانی عەقیدە وشتە بنچینەییەکان و فەرعییەکان، وە ئەگەر گەیشتبایە قەناعەت کە ئەوەی دەیڵێ ئەوەیە کە هاوەڵان لەسەری بوون، ئەوە بە دەلیل و بەڵگەی عەقڵیی و نەقڵیی و قسە و زاراوەی ڕێك و ڕاست و تەواو و بەوەی لەنێو خەڵك دا هەیە، ئەوەی بۆ سەرخستنی پێی کرابا دەیکرد و بەرگری لێ دەکرد.

(ابن دقيق العيد)ی فەرموودەناس دەڵێ: (.. ابن تيمية لەتەمەنی سی ساڵیدا بوو کە زانایان و قوتابیان پێی سەرسام بوون و دەیانویست بگەنە لای و گوێی بۆ بگرن، سوودیان لێ دەبینی و، بەفکر و دڵ و ساغیی و دڵسۆزیی و ڕێکوپێکیی قسە و شێوازی گەیاندنەکەی، خەڵکی هیدایەت دەدا[1].

(ابن حجر) یش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەوبارەوە دەڵێ: (.. کەلەسەر مینبەر قسەی دەکرد ئەوەی ئەو لەماوەیەکی کەمدا وەك دەلیل لە قورئان و سوننەت دەیهێنان، هیچ کەس نەیدەتوانی لەچەند مەجلیس و بەماوەیەکی زۆر بیهێنێ و بیڵێ[2].

---

(١) ابن تيمية لأبي زهرة ص٣٠.

(٢) الدرر الكامنة ١٥٣/١.



## دیارترین سیفەتی دەرسەکانی (شیخ الإسلام):

١- زمان پاراویی، دڵ گەورەیی و بەهێزیی، بێ گرێیی لە قسەکردندا، دەربڕینی وشەکان بە رێکوپێکی، هەبوونی دەنگێکی بەرز و زوڵاڵ، کە ئەوانەی ئامادەی دەرسەکە دەبوون، یان گوێیان بۆ دەگرت گوێیان لێ ی دەبوو.

٢- قسە و وشەکانی رێك و رەوان بوون، قسەی مەجلیسەکان و کتێبەکانی پڕبوون لە زانست و زانیاری بە شێوەیەك کە (الأقشهري) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: قەڵەم و زمانی لەیەکدی نزیك بوون.

٣- زۆر بەگەورە دانان و زانینی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و هەبوونی خۆشەویستییەکی زۆر بۆی و پێشخستنی سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەر هەموو رایەکی دیکە جگە لە قورئان .

٤- پشت گرتن و بەرگریی کردن لە قورئان وسوننەت و، ئەوەی هاوەڵان لە چاخی یەکەم لەسەری بوون، لەگەڵ روونکردنەوەی ئەوەی کە دەیگوت بە باشترین و بەهێزترین بەڵگە و دەلیل.

٥- زۆر زانا و شارەزابوونی لە زانیارییەکان، کەوایکردبوو بەڵگە و پاساوەکانی بۆ ئەوەی دەیڵێ زۆربن و توانینی دابەشکردنی زانیارییەکان لەو شوێنەی پێویستە، کە ئەمە وایکردبوو قسە و دەلیلەکانی بەهێزترین و توانای لەسەر قسە و وتووێژ فراوانتربێ، کەزۆر لە زانایانی سەردەمی خۆی لەو رووەوە لێ ی دەترسان، بەڵکو خۆیان پەنا دەدا لەوەی لەمەیدانی وتووێژ و دەمبەدەمەدا لەگەڵیدا رووبەروو ببنەوە.

٦- بیرێکی تیژی زیندوو، زیرەکییەکی بێ وێنە، کەمایەی هەبوونی توانایەکی زۆر بوو، بۆ ئامادەکردنی ئەو ئایەتانەی بۆ هەر مەسەلەیەك پێویستی پێی هەبوون و ئامادەکردنی دەقی حەدیسەکان و بەکارهێنانیان لە شوێنی خۆیاندا، وەك لەپێش چاوانی بن وابوون.



٧- هەبوونی سام و هەیبەتێکی زۆر لای خەڵکی و کاریگەریی ئەو سام و هەیبەتە لەسەر گوێگرەکانی، کەبووە هۆی سەرسام بوونی خەڵکی پێی، کە هیچیان بەدەست نەماوە جگە لەوەی بە چەند وشەیەك تەعبیر لەو سەرسامییە بدەنەوە، وەك چۆن (ابن دقیق العید) کردوویەتی.

٨- زیندوویەتی کۆڕ و دەرس و مەجلیسەکانی و کاریگەریی زۆریان لەسەر خەڵکی، چونکە دەرسەکانی زۆرپەیوەندییان بە رووداو و پێشهات و گیروگرفتەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکییەوە هەبوو، ئەو سیفەتانە و هاوشێوەیان وایان کرد کە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) ببێتە کەسایەتییەکی خۆشەویست و نزیك لە ئاوات و خەم و ئازارەکانی خەڵکی و، ئەو کاریگەرییە بوو بەهۆی دروستکردنی جموجۆڵێکی نائاسایی و گۆڕانکاریی لە نێو کەش و هەوای چەقبەستوو و تەقلید و چاولێکەریی و نەرمیی نواندن و موداراتی خراپ لەگەڵ کاربەدەستانی سەردەم دا.

## دەرس گوتنەوەی لە مەدرەسەی حەنبەلییە :

وێڕای دەرس گوتنەوەی (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) لە خوێندگای (دار الحدیث السکریة)دا و تەفسیرکردنی قورئانی پیرۆز لە (مزگەوتی ئەمەویی لە دیمەشق) بۆ ماوەیەکی زۆر دەرسی لە خوێندنگای (حەنبەلییە) ش گوتۆتەوە لە جێ ی زانای پایە بەرز (زین الدین بن المنجا الحنبلي) دوایی وازی لەدەرس گوتنەوە هێناوە، لەبەر نەبوونی کات و زۆر هاتو چۆ کردنی لە نێوان (مصر و شام) و خەریك بوونی بە بەرەنگار بوونەوە و کارکردنی لە دژی (تەتار) و خەڵك ئامادە کردن بۆ رووبەڕووبوونەوەی، لەو بارەوە زانای گەورە (ابن کثیر) لە مێژووەکەی دا کەباسی ساڵی (٦٩٥) ی کۆچی کردوە دەڵێ: (لە رۆژی چوارشەممەی (١٧) شەعبان (شیخ الإسلام ابن تیمیة) ی حەرڕانی لە خوێندنگای حەنبەلییە لە جێی زانا(زین الدین ابن المنجا) کە وەفاتی کردبوو دەرسی گوتۆتەوە)[1].

---

(١) البدایة والنهایة ١٣/٣٤٤.

زانای گەورەی شەرعزان(زین الدین ابن المنجا) ی دیمەشقی حەنبەلیی، یەکێك لە مامۆستاکانی (شیخ الإسلام ابن تیمیة) بوو، کە سەرپەرشتی کردنی مەزهەبی حەنبەلیی لەودا کۆتایی پێ هات، دەرسی لە خوێندنگای حەنبەلییە دەگوتەوە، لە (٤) شەعبانی ساڵی (٦٩٥) وەفاتی کردوە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) لە (١٧) شەعبانی هەمان ساڵدا جێ ی گرتۆتەوە لە دەرس گوتنەوەدا، واتە (١٢) رۆژ دوای مردنی (شیخ زین الدین).

## ناوبانگی (شیخ الإسلام) و کۆدەنگی زانایانی سەردەمی خۆی لەسەر مەدح و ڕێزلێنانیی :

هەر کەسێك خوای گەورە ئەو زانیاری و زانستەی پێ ببەخشێ و ئەو توانا زۆرەی پێ بدا، بۆ بەکارهێنانی لە پێناو خزمەت بە قورئان و سوننەت دا، شایەنی ئەوەیە کەخەڵکی لە هەموو شوێنێك بەچاکە باسی بکەن و ناوبانگی دەرکەوێ، خوێندکارانی شەیدای زانیارییەکان، تاك تاك و بەکۆمەڵ بچنە لای و لێ ی بەهرەمەند بن کە ئەوکات (شیخ الإسلام) لەسەرەتای بەخشینی زانست و هیممەت بەرزیی دا بوو، کە لە درێژایی تەمەنی دا لەوبارەوە لاواز نەبووە، تا وەفاتی کردوە.. شارەزایانی سەردەمی خۆی یەك دەنگ بوون لەسەر زانیاریی فراوان و بیر و هۆشی بەهێز و دوور بینیی و قووڵ بیرکردنەوەی (شیخ الإسلام)، کە دۆست و دوژمن ئەوەی دەسەلماند، هەر ئەو زیرەکی و توانا زۆرەش بوو وایکردبوو دۆستەکانی پشتی بگرن و ناحەزانی لێ ی بخوێنن، خۆ ئەگەر لە زات و بیرکردنەوەی خۆیدا کەسێکی سادە بووایە، ئەوا ناحەزانی دژایەتییان نەدەکرد، کەواتە ئەوەی هەردوولا تێیدا ناکۆك بوون، مەسەلەی پەسەند کردنی ئەو راوبۆچونانەی بوون کە بانگەشەی بۆ دەکردن، نەك لە سەر زانایی و شارەزایی ناوبراو، ئەگەر خەڵکێك وەك زانایەکی پایەبەرز رێزیان لێ نەگرتبێ و زانیبیشیان چ کەسێکە، ئەوە قەناعەتیان بەو هەڵوێستەی خۆیان نەبووە، بەڵکو ئەوەیان لە هەواو نەفسەوە بووە، کە زاڵ بووە بەسەر عەقڵ و فیکریاندا، کە ئەمە



کاری زانایانی ئیسلام نیە، قسەی نەفام و نەزانەکانیش حیسابێکی ئەوتۆی بۆ ناکرێ، ئەگەر پشتگیریی بکەن یان دژایەتیی بکەن.

کەواتە دەتوانین بڵێین هەموو زاناکانی سەردەمی خۆی بەرزیی پلە و پایەو ئەندازەی زانست و شارەزایی ئەویان زانیوە، هەتا ئەوانەی دژایەتییشیان کردوە و ئازاریشیان داوە[1].

---

(١) ابن تيمية لابی زهرة ص ٩٣-٩٤.



بەشی سێیەم



# مامۆستایەکانی و قوتابییەکانی

## سەرچاوەی بەدەستهێنانی زانیاری لەسەردەمی ئەودا:

بەدەست هێنانی زانیاری لەسەردەمی (شیخ الإسلام) دا کە دەکەوێتە نێو چاخی نووسینەوە و تۆمارکردنی زانستی، بەدوو شێوە بوو:

**یەکەم:** بەهۆی زانایانەوە کە خەڵکیان فێری زانیارییەکان دەکرد و، ڕێنماییکار بوون بۆیان و لەسەردەستی ئەوان زانایان پێ دەگەیشتن .

**دووەم:** بەهۆی کتێبەوە کە دەخوێنران و دەخوێنرانەوە و خەڵکی زانستیان لێ فێر دەبوون.

وە لەکۆی ئەوەی لە زانایان وەریان دەگرت و لەنێوەڕۆکی کتێبەکان بەدەستیان دەهێنا، ئەو ئەندازە کەرستە زانستی یە دروست دەبوو، کە شتی لەسەر هەڵدەچنرا و هەڵدەهێنجرا و لێ ی زیاد دەکرا.



**مامۆستاکانی شیخ الإسلام:**

لەمیانەی قسە کردن لە خاڵی یەکەم کە باس لە زانایان دەکات، لە فێرکردن و ڕێنمایی کردن و پێگەیشتنی زانایان لەسەر دەستی ئەوان، زانای پایە بەرز **(الشیخ محمد أبو زهرة)** (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ:

(... لەسەرەتای تەمەنیەوە قوتابخانەیەکی زانستی بە باشترین شێوە بۆ شیخ الإسلام (إبن تیمیة) فەراهەم هاتبوو، یەکەم ڕێنمایکاری بابی بوو، کەزانایەکی بەتوانا بوو، لە مزگەوتی گەورەی دیمەشق کورسیەکی هەبوو، دەرسی لەسەر دەگوتەوە، شیخ الإسلام لەجەرگەی زانستدا گەشەی کردوە و ئەو ڕێنماییکارەی هەردەم لەگەڵیدا بوو بە لوتف و بەزەییترین کەس بوو بۆی، ئەو بەیەکەوە بوونەی لەگەڵ بابی دا بەردەوام بوو تا (إبن تیمیة) بوو بە (٢١) بیست و یەك ساڵ وئەوکات ڕێنماییکارە دڵسۆز و خۆشەویستەکەی کە بابی بوو وەفاتی کرد، لەوکاتەدا کە لەگەڵ بابی دا بەیەکەوە بوون پەیوەندیی بە زانایانی دیکەشەوە دەکرد، وە لە هەر زانایەك لەزاناکانی دیمەشق بەپێی پسپۆڕییان، سوودی لێ دەبینین و شتیان لێ فێردەبوو[١].

**زانای پایە بەرز (ابن عبدالهادي)** (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (ئەو زاناو مامۆستایانەی (إبن تیمیة) دەرسی لەلاخوێندوون و زانیاری لێ وەرگرتوون لەدووسەد مامۆستا زیاترن)[٢].

**(الحافظ ابو حفص عمر بن علی البزار)** (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ:

(.. زیاد لە کتێبێك لە لای زیاتر لە مامۆستایەکی بیستوە، کە خاوەنی گێڕانەوەی حەدیسی ڕاستبوون، بەڵام ئەو کتێبە گەورانەی نووسراونەوە وەك

---

(١) ابن تیمیة لأبی زهرة (١١١).

(٢) العقود الدریة ص٣.

(مسند الإمام أحمد و صحيح البخاري و صحيح مسلم و جامع الترمذي و سنن أبي داود و النسائي و ابن ماجه والدارقطني) هەر هەموویانی چەند جاران بیستوون لە کۆڕی دەرسی زانایان دا، وە یەکەم کتێب، کە لە حەدیس دا لەبەری کردوە (الجمع بين الصحيحين للإمام الحميدي) بووە[1].

ئەوانەی بەدواداچوون دەکەن بۆ ژیانی (شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، بۆیان دەردەکەوێ کە ئەو زانیارییانەی بە گوێگرتن و دەرس خوێندن نەبێ وەرنەدەگیران، لەنزیکەوە دەیخوێندن و وەری دەگرتن، وەك (حەدیس) بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی بۆی خوێندۆتەوە. پێشتریش زانستەکانی لەو زانایانە وەرگرتبوون کە تێیاندا پسپۆڕبوون، ڕێزمانی عەرەبی ومەنطیق لە شارەزایانی خۆیان فێر بووە، تەفسیری لە شارەزایانی خۆی و فیقهی حەنبەلییش لە شارەزایانی خۆی، بە هەمان شێوە.

لەگەڵ ئەوەش دا کە باسمان کرد بەشداریی کۆڕ و کۆبوونەوە گشتییەکانیشی دەکرد، گوێی لە قسە و باس و لێکۆڵینەوە و موناقەشەکانی زانایان دەگرت، ئەوانەی خاوەنی زانایی و بیر و فکرێکی تیژ بوون، کە لە مزگەوتە گەورەکان و خوێندنگاکان دا پێی هەڵدەستان، ئەوە لە شوێنە گشتی یەکان، بەڵام لە کۆبوونەوە تایبەتییەکاندا بەهۆی پلەوپایەی زانستی بابی و شارەزایی و زانستی زۆری لە نێو زانا و شەرعزانان دا و، گەورەیی و پێگەی بەرپرسیاریەتی بۆ مەدرەسەی حەدیس، ماڵەکەی ببووە شوێنێکی تایبەتی کۆکردنەوەی زانایان و مەسەلە زانستییەکان، کە باس لە زۆر مەسەلەی زانستی ورد دەکرا و، لێکۆڵینەوەیان بۆ دەکرا دەربارەی لاوازیی و بەهێزییان بە عەقڵێکی زیرەکانەو دڵێکی فراوان و بەئاگا مامەڵەیان دەکرد، کە ئەوەی دەیان بیست دەیان پاڵاوت، بەو شێوەیە سوودی لە هەموو زانایەکان دەبینی، کە لە دیمەشق بوون، یان دەهاتن بۆ ئەوێ، یان پێیدا تێدەپەڕین، بەڵام ئەوەی عەقڵ قبووڵی نەکردبا و لەگەڵ دەقێك نەهاتبایەوە، وەری نەدەگرت[2].

---

(١) الاعلام العلية ص ١٨.

(٢) ابن تيمية لابى زهرة ص١١٢.



**ناوی چەند مامۆستایەکی شیخ الاسلام :**

ئەوانەی باسیان دەکەین بەشێکن لەو زانا و پێشەوایانەی کە (شیخ الإسلام) لێیان بەهرەمەند بووە و لە کۆڕی دەرسیان دانیشتوە و، گوێی بۆ گرتوون و زانیارییان لێ فێربووە، کە ئەوکات شێوازی دەرس گوتنەوە بە شێوەیەك بووە کە زانا و مامۆستا لەسەر کورسییەك دانیشتوە و دەرسی گوتۆتەوە و باسی لە مەسەلەکان کردوە و قوتابی و، کەسانی دیکەش لە دەوری دانیشتوون و گوێیان بۆ گرتوە و زانیاری لێ فێر بوون:

١- پێشەوای فەرموودەناس و شەرعزان مسندالشام - سەنەدزانی شام - (ابو العباس زین الدین احمد عبدالدائم بن نعمة بن احمد المقدسي) لەدایك بووی ساڵی (٥٧٥)ی کۆچی لە زانایانی حەنبەلیی بووە، زۆر شارەزا بووە لە حەدیس دا، پەنجا ساڵ زیاتر حەدیسی ریوایەت کردوە و، کەسێکی بە تەقوا و خۆ بەکەمگر و زۆر پاك بووە، لە رۆژی دووشەممەی ٨ ی رەجەبی ساڵی (٦٦٨)ی کۆچی وەفاتی کردوە، ابن تیمیة سوودی لێ بینیوە لە بواری حەدیس و لەساڵی (٦٦٧)ی کۆچی گوێی بۆ دەرسی ئەو گرتوە، وەك لە (مجموع الفتاوی الکبری)دا باسی کردوە[1].

وە (ابن عبدالدائم) لەکۆتایی تەمەنی دا کوێر بووە.[2]

٢- زانای پایە بەرز پێشەوای دنیا بەکەمگر، (قاضي القضاة شمس الدین ابو محمد عبدالرحمن بن محمد بن احمد بن قدامة المقدسي الجماعیلی الحنبلي) لە موحەڕڕەمی (٥٩٧)ی کۆچی لەدایك بووە، خاوەنی زۆر سیفەتی بەرز بووە، لەنووسراوەکانی کتێبی (شرح المقنع) و کتێبی (تسهیل المطالب في تحصیل المذاهب) کە هەردووکیان لە فیقهی حەنبەلیی دا نووسراون، لەحەدیس دا مامۆستای (إبن تیمیة) بووە، لە شەعبانی ساڵی (٦٦٧)ی کۆچی لە

---

(١) مجموع فتاوی الکبری ٧٧/١٨.

(٢) البدایة والنهایة ٢٤٤/١٣.

(قاسون) لە کۆڕی ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و (فقه و أصول) ی لێ فێربووە، لەساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە[١].

٣- پێشەوای شەرعزان (قاضي شرف الدين ابو العباس احمد بن احمد بن نعمة المقدسي الشافعي) ساڵی (٦٢٢)ی کۆچی لەدایك بووە، زۆر شارەزابووە لە فیقهو ئوصوڵ و زمانی عەرەبی و چەند کتێبێکی داناوە، زۆرجار لە جێ ی قاضي قەزاوەتی کردوە لە دیمەشق، مۆڵەتی فتوادانی داوەتە کۆمەڵێك لەزانایان، لە نێویاندا: (شیخ الإسلام ابن تیمیة) کە شانازیی بەوەوە دەکرد و دەیگوت: من مۆڵەتم داوەتە (إبن تیمیة)، لە بواری (اصول الفقه) دا کتێبی داناوە، لە ساڵی (٦٩٤)ی کۆچی وەفاتی کردوە[٢].

٤- بابی کە زانا و شەرعزان و فەرموودەناس بووە، (أبوالمحاسن عبدالحليم بن عبدالسلام بن تيمية الحراني) ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە، کەساڵی (٦٦٦) لە حەڕڕان (إبن تیمیة) گوێی بۆ دەرسی ڕاگرتوە و لێ ی فێر بووە، وەک پێشتریش باسمان کردوە.

٥- پێشەوای شەرعزان و فەرموودەناس: (زين الدين ابوالبركات المنجى بن عثمان بن اسعد بن المنجى بن بركات التنوخى الدمشقي الحنبلي)، لە ساڵی (٦٣٢)ی کۆچی لە دایك بووە و لەسەردەمی خۆیدا لەشام ئەو سەرمەشقی مەزهەبی حەنبەلیی بووە، لە کتێبەکانی (شر المقنع) و(تفسير القرآن العزيز)و چەند کتێبی دیکەشن، (إبن تیمیة) فیقهی لێ وەرگرتوە و ئەو بە (إبن تیمیة)ی ڕاگەیاندوە کەدوای خۆی لەجێ ی ئەو دەرس لە قوتابخانەی حەنبەلی بلێتەوە، دوایی شیخ الإسلام لە جیاتی ئەو دەرسی گوتۆتەوە، ئەو زانایە یەکێك بووە لەوانەی لە یەکەم دەرسی (ابن تیمیة) لە (دار الحديث السكرية) ئامادە بووە، ناوبراو لەساڵی (٦٩٥)ی کۆچی وەفاتی کردوە[٣].

---

(١) البداية والنهاية ٣٢/١٣.

(٢) البداية والنهاية ٣٤١/١٣.

(٣) البداية والنهاية ٣٦٥/١٣.

٦- پێشەوای شەرعزان و نەحوزان (شمس الدين ابو عبدالله محمد بن عبدالقوى بن بدران المقدسي المرداوى )كە زانابووە لە فیقهو حەدیس و نەحو و شعردا (ابن تيمية) نەحوی عەرەبی لای ئەو خوێندوە، چەند کتێبی نووسیوە لەوانە (کتاب الفروق) و لەساڵی (٦٩٩)ی کۆچی وەفاتی کردوە[١].

٧- پێشەوا و شەرعزان قاضي(شمس الدين احمد بن ابراهيم بن عبدالغنى السروجي الحنفي) کە شەرحی کتێبی (الهداية)ی کردوە، لەزۆر زانیاری دا زۆر شارەزابووە، چەند تێبینی لەسەر (شيخ الإسلام) هەبووە لە (عیلمی کەلامدا) و (شيخ الإسلام) یش لەچەند نووسراوێکیدا وەڵام و، بەرپەرچی دەلیلەکانی داونەوە، ناوبراو لەساڵی (٧١٠)ی کۆچی وەفاتی کردوە[٢].

٨- پێشەوای فەرموودەناس (فخرالدين ابوالحسن على بن احمد بن عبدالواحد بن احمد السعدى المقدسي الصالحى الحنبلي) ناسراو بە (ابن البخاري)، لەساڵی (٥٩٥) کۆچی لەدایك بووە، ناوبراو زانا و شەرعزان و دنیا بەکەمگر و دیندار و شارەزا لە حەدیس و خاوەن فەزڵ و چاکە بووە بۆ قوتابیانی و تەمەنێکی درێژی هەبووە، لە زۆر وڵاتان قوتابی ڕۆیشتون بۆ لای بۆ فێربوون، لە ساڵی (٦٨١)ی کۆچی(شيخ الإسلام) زانیاری لێ وەرگرتوە، ناوبراو لەساڵی (٦٩٠)ی کۆچی وەفاتی کردوە[٣].

٩- پێشەوای شەرعزان و زانای بەناوبانگ (جمال الدين ابوالفرج عبدالرحمن بن سليمان بن سعيد بن سليمان البغدادى ) لەساڵی (٥٨٥)ی کۆچی لە (حەڕڕان) لەدایك بووە، دوایی چووە بۆ دیمەشق، (شيخ الإسلام) لەساڵی (٦٦٨) زانیاری لێ وەرگرتوە و لێ ی بیستوە، ناوبراو لەساڵی (٦٧٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٤].

---

(١) الوافى بالوفيات ٢٧٨/٣.

(٢) البدايتوالنهاية ٥٢/١٤/ الدرر الكامنة ٩٦/١ - ٩٧.

(٣) شذرات الذهب ٤١٢/٥، البداية والنهاية ٣٤٣/١٣.

(٤) شذرات الذهب ٣٣٢/٥، النجوم الزاهرة ٢٣٧/٧.

١٠- پێشەوای فەرموودەناس، سەنەدزانی شام، نووسەری هەڵکەوتوو (تقي الدين ابو محمد اسماعيل بن ابراهيم بن ابى اليسر التنوخي)، لەساڵی (٥٨٩) لەدایك بووە و (إبن تيمية) لەساڵی (٦٦٩) گوێی بۆ دەرسەکانی راگرتوە و زانیاری لێ وەرگرتوە، ناوبراو ئینسانێکی دادپەروەر و چاکە خواز بووە، لەمانگی (صفر)ی ساڵی (٦٧٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[1].

١١- پێشەوای شەرعزان (سيف الدين أبو زكريا يحى بن عبدالرحمن بن نجم بن عبدالوهاب الحنبلي الانصاري) لەساڵی (٥٩٢)ی کۆچی دا لەدایك بووە، رۆژی جومعەی (١٠ شەوال)ی (٦٦٩) کۆچی(إبن تيمية) لە کۆڕی ئەو ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و، لە شەووالی (٦٧٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[2].

١٢- پێشەوا و قاضي (شمس الدين ابو محمد عبدالله بن محمد بن عطاء بن حسن الأذرعي الحنفي) لەدایك بووی ساڵی (٥٩٥) کۆچی یە،(إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە ساڵی (٦٦٧)ی کۆچی زانیاری لێ وەرگرتوە، لەساڵی (٦٧٣) ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[3].

١٣- زانای سەنەدزان (زين الدين ابو العباس المؤمل بن محمد بن على بن محمد البالسى) لەساڵی (٦٠٢)ی کۆچی لەدایك بووە، (ابن تيمية) لەساڵی (٦٦٩)ی کۆچی زانستی لێ فێربووە، و لەساڵی (٦٧٧)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[4].

١٤- زانای شارەزا (رشيدالدين ابو عبدالله محمد بن ابى بكر محمد بن محمد بن سليمان العامري) (إبن تيمية) کە (رەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵانی

---

(١) البداية والنهاية ١٣/٢٥٤.

(٢) شذرات الذهب ٥/٣٤٠ / العبر ٣/٣٢٩.

(٣) البداية والنهاية١٣/٢٨٩.

(٤) العبر ٣/ ٣٣٧.



(٦٦٨-٦٦٩)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراو ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و، لەمانگی (ذي الحجة)ی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[١].

١٥- پێشەوای فەرموودەناس (شرف الدین ابو عبدالله محمد بن عبدالمنعم بن عمر بن عبدالله بن غدیر بن القواس الطائي)، لە دایك بووی (٦٠٢)ی کۆچی، زانایەکی ناوازەی زۆر دینداربووە (إبن تیمیة) لەساڵی (٦٧٥)ی کۆچی زانستی لێ فێربووە و، لە ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٢].

١٦- پێشەوای زانای دنیا بەکەمگر (کمال الدین ابو زکریا یحیی بن ابی منصور بن ابی الفتح بن رافع بن علی الحرانی ابن الصیرفی)، کە پێشەواو زانایەکی خاوەن عیبادەتێکی زۆر و شەونوێژ و سیفەتی بەرز و جوان بووە، لە (شوال)ی ساڵی (٦٦٨)ی کۆچی(إبن تیمیة) لە کۆڕی ناوبراو ئامادە بووەو، زانیاری لێ بیستوە و لە چواری (صفر)ی ساڵی (٦٧٨)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٣].

١٧- زانای سەنەدزان (ابو بكر بن محمد بن ابی بكر بن عبدالواسع الهروی الدمشقي عمادالدین)، لەساڵی (٥٩٤)ی کۆچی لەدایك بووە، (إبن تیمیة) (رەحمەتی خوای لێبێت) لە (٤) (ربیع الاول)ی (٦٦٨) زانیاری لەلا فێربووەو لە (رجب)ی ساڵی (٦٧٣)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٤].

١٨- پێشەوای سەنەدزان(زین الدین ابو العباس احمد بن ابی الخیر سلامة بن ابراهیم بن سلامة بن الحداد الدمشقي) بابی ناوبراو پێشەوا و مامۆستای کۆڕی حەنبەلیەکان بووە، خۆی منداڵ بووە کە بابی مردوە، لەساڵی (٦٠٩)ی کۆچی لەدایك بووە و لە (ربیع الاول)ی ساڵی (٦٧٥)ی کۆچی دا (إبن تیمیة) لە

---

(١) العبر٣/٣٥١.

(٢) شذرات الذهب ٥/ ٣٨٠.

(٣) مجمع المؤلفین ١٣/٢٣٣، العبر ٣/٣٣٩.

(٤) مجموع الفتاوی ١٨/٨٢.

کۆڕی ناوبراو دا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و، لە ڕۆژی عاشوڕای ساڵی (٦٧٨)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە.[١]

١٩- زانای سەنەدزان (أمین الدین ابومحمد القاسم بن ابي بكر بن قاسم بن غنیمە الأربلي)، لەساڵی (٥٩٥)ی کۆچی لەدایك بووە، تەمەنی لەخوار بیست ساڵان بووە کە لەگەڵ بابی و لەپێناو دەستخستنی زانست دا کۆچیان کردوە، (ابن تیمیة) لەساڵی (٦٧٧)ی کۆچی دا لە کۆڕی ناوبراو دا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، لە (جماد الأولی) ی ساڵی (٦٨٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٢].

٢٠- پێشەوای زانا (شمس الدین ابوالغنائم المسلم بن محمد بن المسلم بن علان القیسی الدمشقي)ی فەرموودەناس، لەساڵی (٥٩٤)ی کۆچی لەدایك بووە و (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵی (٦٦٧) و ساڵی (٦٨٠)ی کۆچی گوێی لە دەرسەکانی گرتووە، لە (٦)ی (ذي الحجة)ی ساڵی(٦٨٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٣].

٢١- پێشەوا و فەرموودەناس (بدرالدین ابو العباس احمد بن شیبان بن تغلب بن حیدرة الشیباني) لەساڵی (٥٩٩)ی کۆچی لەدایك بووە، (مسند الأمام احمد بن حنبل) ی ڕیوایەت کردوە، (ابن تیمیة) لەساڵی (٦٨٤) و شەعبانی (٦٧٥) دەرسی لەلاخوێندوە، و لەساڵی (٦٨٥)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٤].

٢٢- پێشەوای فەرموودەناس (ناصر الدین ابوحفص عمر بن عبدالمنعم ابن القواس الدمشقي)، لە دایك بووی ساڵی (٦٠٥) کۆچی و لەساڵی (٦٩٨) ی کۆچی دا وەفاتی کردوە و سەنەد زانی سەردەمی خۆی بووە[٥].

---

(١) العبر ٣٣٨/٣، مجموع الفتاوى ٩١/١٨ - ١١٢.

(٢) العبر ٣٤٤/٣/ شذرات الذهب ٣٦٧/٥.

(٣) البداية والنهاية ٣١٦/١٣.

(٤) شذرات الذهب ٣٩٠/٥ العبر ٣٥٨/٣.

(٥) شذرات الذهب ٤٤٢/٥.



٢٣- زانای سەنەدزان (كمال الدين ابو نصر عبدالعزيز بن عبدالمنعم بن الخضر بن شبل بن عبدالحارثي) لەدایك بووی (٥٨٩)ی کۆچییەو (إبن تيمية) لەرۆژی جومعەی شەشی شەعبانی (٦٦٩)ی کۆچی لەمزگەوتی گەورەی دیمەشق لە کۆڕی ناوبراو ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و، لە شەعبانی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[1].

٢٤- زانای چاکە خوازی سەنەدزان (ابو عبدالله محمد بن بدر بن محمد بن يعيش الجزری)، کە (إبن تيمية) لە شەعبانی ساڵی (٦٧٥)ی کۆچی لە (قاسیون) لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و لە شەعبانی (٦٧٥)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[2].

٢٥- زانای سەنەدزان (ابو يحيى اسماعيل بن أبي عبدالله بن حماد بن عبدالكريم العسقلاني) کە لە ساڵی (٥٩٩) لە دایك بوە و (إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت) لە شەعبانی ساڵی (٦٧٥) و لەساڵی (٦٨١)گوێی بۆ دەرسی ناوبرا و گرتوە و لە رەمەزانی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[3].

٢٦- پێشەوای زانا و شەرعزان (زين الدين ابو اسحاق ابراهيم بن احمد بن أبي الفرج بن أبي طاهر بن محمد بن نصر) کە بە (أبن السديد الأنصاري الحنفي) ناسراوە، (إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە رەجەبی ساڵی (٦٧٥)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، لە (جمادى الأولى) ساڵی (٦٧٧)ی کۆچی لە تەمەنی (٧٣) ساڵی دا، وەفاتی کردوە[4].

٢٧- پێشەوا و زانا و فێرکاری قورئان خوێندن (كمال الدين ابو اسحاق ابراهيم بن احمد بن اسماعيل بن فارس التميمی السعدی) لەساڵی (٥٩٦)ی کۆچی

---

(١) شذرات الذهب ٣٣٨/٥.

(٢) مجموع الفتاوى ٨٨/١٨ - ٨٩.

(٣) العبر ٣٤٩/٣ مجموع الفتاوى ١٠٥/١٨.

(٤) مجموع الفتاوى ٨٩/١٨ -٩٠.

لەدایك بووە، (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە ڕەمەزانی (٦٧٤)ی کۆچی گوێی لە دەرسی ناوبراو گرتوە و لە (صفر)ی ساڵی (٦٧٦)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[١].

٢٨- (احمد بن أبی بکر بن سلیمان الواعظ ان الحموی ابو العباس الدمشقي)، لەدایك بووی دەور و بەری ساڵی (٦٠٠) کۆچی، (إبن تیمیة) لەمانگی (رجب) ی ساڵی (٦٨٠) و ساڵی (٦٨١)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراو ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و لە (ذي الحجة)ی ساڵی (٦٨٧) لەتەمەنی (٨٧) ساڵی دا، کۆچی دوای کردوە[٢].

٢٩- سەنەدزان و زانا (مجد الدین ابو عبدالله محمد بن اسماعیل بن عثمان بن المظفر بن هبتالله بن عساکر الدمشقي الشافعي) لەساڵی (٥٨٧)ی کۆچی لەدایك بووە (إبن تیمیة) لە (شعبان) ی ساڵی (٦٦٧)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، لەمانگی (ژی القعدة) ی ساڵی (٦٦٩)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٣].

٣٠- پێشەوای گەورە (عماد الدین ابو محمد عبدالرحمن بن أبي الصعر بن السید بن الصانع الأنصاري)،(ابن تیمیة) لەساڵی (٦٧٦)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە و، لە ڕەمەزانی (٦٧٩)ی کۆچی دا. وەفاتی کردوە[٤].

٣١- زانای سەنەدزان (نجم الدین أبو العز یوسف بن یعقوب بن محمد بن علی المجاور الشیبانی الدمشقي) کە بەتەنیا مێژووی بەغدادی لە (کندی) گێڕاوەتەوە و (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵی (٦٧٦ و ٦٨٠)ی

---

(١) شذرات الذهب ٣٥١/٥ .

(٢) النجوم الزاهرة ٣٨٧/٧ مجموع الفتاوی ١٨/ ١١١-١١٢.

(٣) الوافی بالوفیات ٢١٩/٢. شذرات الذهب ٣٣١/٥

(٤) الأربعون لابن تیمیة ص ٦٦.



کۆچی لە کۆڕی ناویراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، وە ناویراو لە ساڵی (٦٠١)ی کۆچی دا لەدایك بووە و لە (ذي القعدة) ی ساڵی (٦٩٠) ی کۆچی وەفاتی کردوە[١].

٣٢- پێشەوا و زانا (ابو اسحاق ابراهيم بن اسماعيل بن ابراهيم بن يحى بن علوى بن الحسين الدرجى القرشي الحنفي) ئیمامی مەدرەسەی (کەشك) (المعجم الكبير للطبراني) ریوایەت کردوە، (إبن تيمية) لەساڵی (٦٨٠)ی کۆچی لە کۆڕی ناویراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، خۆی لەساڵی (٥٩٩)ی کۆچی لەدایك بووە و لە (صفر)ی ساڵی (٦٨١) ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٢].

٣٣- پێشەوا (نجيب الدين المقداد بن ابى القاسم هبة الله بن المقداد ابو المرهف القيسي البغدادي الشافعي)، کە ئینسانێکی دادپەروەر و خێرۆمەند و بازرگان بووە، لەساڵی (٦٠٠)ی کۆچی لە دایك بووە و لە (٨) ی (شعبان)ی ساڵی (٦٨١)ی کۆچی دا لە دیمەشق کۆچی دوایی کروە[٣].

٣٤- پێشەوا (محمد بن عامر بن ابي بكر الفسولي ابو عبدالله)ی فێرکاری قورئان کە ئینسانێکی چاکەخواز و خۆ بەکەمگر و خێرۆمەند و ئامۆژگاریکاری قسەزان بووە، لە دوعاکانیدا قسە و رستەی جوان و پاراوی بەکارهێنان، (إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت) لەساڵی (٦٨٢)ی کۆچی لە کۆڕی ناویراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، لە (جماد الاخرة)ی ساڵی (٦٨٤)ی کۆچی وەفاتی کردوە، نزیکی هەشتا ساڵ ژیاوە[٤].

---

(١) معجم المؤلفين ٣٤٥/١٣ /العبر ٣٧٥/٣ /النجوم الزاهرة ٣٣/٨.

(٢) العبر ٣٤٧/٣ / النجوم الزاهرة ٣٥٦/٧.

(٣) العبر ٣٤٩/٣.

(٤) العبر ٣٥٧/٣، البداية والنهاية ٣٢٣/١٣.

٣٥- زانای پایە بەرزی چاکەکار (کمال الدین ابو محمد عبدالرحیم بن عبدالملك بن یوسف بن قدامە المقدسي) لەدایك بووی (٥٩٨)ی کۆچی یەو، لە (جماد الأولی) ی ساڵی (٦٨٠)ی کۆچی وەفاتی کردوە، (إبن تیمیة) لە (صفر)ی هەمان ساڵدا واتە: پێش وەفاتی نزیکەی بە دوو مانگ لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[1].

٣٦- زانای پێشەوا (علی بن محمود بن شهاب)، لەدایك بووی ساڵی (٥٩٥) ی کۆچی، لەرەمەزانی (٦٨٠)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[2].

٣٧- زانای پایە بەرز (زین الدین ابوبکر محمد بن أبي طاهر اسماعیل بن عبدالله بن عبدالمحسن الانماطی الانصاري المصري) کەلە ساڵی (٦٠٩) کۆچی لەدایك بووە، (ابن تیمیة) لە (رجب)ی ساڵی (٦٦٨)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، و لە (ذي الحجة)ی ساڵی (٦٨٤)ی کۆچی دا لە قاهرە کۆچی دوایی کردوە[3].

٣٨- زانای پێشەوا (شمس الدین ابو الفرج عبدالرحمن بن احمد بن عبدالملك بن عثمان بن عبدالله بن سعد المقدسي) یەکێك بووە لە زانا ناودارەکان، لەساڵی (٦٠٦) ی کۆچی لەدایك بووە و لەساڵی (٦٨٩)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، (إبن تیمیة) لەساڵی (٦٨١)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[4].

٣٩- زانا و پێشەوا (جمال الدین ابو حامد محمد بن علی بن محمود بن احمد بن علی بن الصابونی) مامۆستای (دار الحدیث النوریة)) لە دیمەشق، لەساڵی (٦٠٤)ی کۆچی لەدایك بووە، لەساڵی (٦٨٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە،

---

(١) العبر ٣/٣٤٣.

(٢) مجموع الفتاوی ١٨/ ١٠٥ - ١٠٦.

(٣) مجموع الفتاوی ١٨/ ١٠٧ -١٠٨ / شذرات الذهب ٥/٣٣٨.

(٤) مجموع الفتاوی ١٨/١٠٨ -١٠٩.



(شيخ الإسلام) لەساڵی (٦٦٨)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[١].

٤٠- زانای ئەمینداری ڕاست (شمس الدين ابو غالب المظفر بن عبدالصمد بن خليل الأنصاري) لەساڵی (٦٠٦)ی کۆچی لەدایك بووە و لەساڵی (٦٨٨)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە، (ابن تيمية) لەساڵی (٦٨٤)ی کۆچی لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[٢].

٤١- زانای پێشەوا (عبدالرحمن بن احمد بن عباس ابو محمد الفاقوسي) کەلە ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە و تەمەنی (٧٥) ساڵ بووە[٣].

٤٢- زانا و پێشەوا (محى الدين ابو حفص عمر بن محمد بن عبدالله بن محمد بن أبي عصرون التميمي) کەلەساڵی (٥٩٩) ی کۆچی دا لەدایك بووە و لە (٣ ی ذي الحجة)ی ساڵی (٦٨٢)ی کۆچی وەفاتی کردوە، (شيخ الإسلام) لە هەمان ساڵ لە کۆڕی ناوبراو ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[٤].

٤٣- زانا و قازی گەورە (نفيس الدين ابو القاسم هبة الله بن محمد بن علي بن جرير الحارثي الشافعي) کەلە (صفر)ی ساڵی (٦٨٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە و لەساڵی(٦٧٩)ی کۆچی دا (إبن تيمية) لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[٥].

٤٤- زانا و پێشەوای دنیا بەکەمگر (شمس الدين ابو عبدالله محمد بن الكمال عبدالرحيم بن عبدالواحد بن احمد بن عبدالرحمن المقدسي السعدى الحنبلي)

---

(١) مجموع الفتاوى ١١٠/١٨ - ١١١.

(٢) مجموع الفتاوى ١١٢/١٨ - ١١٣.

(٣) مجموع الفتاوى ١١٢/١٨ - ١١٣.

(٤) مجموع الفتاوى ١١٣/١٨ - ١١٥.

(٥) مجموع الفتاوى ١١٥/١٨ - ١١٦.

گرنگیی زۆری بە حەدیس داوە و کۆی کردۆتەوە و تەخریجی کردوە و کەسێکی دیندار و پارێزکار بووە، سەرپەرشتی (المشیخة الضیائیة) و (مشیخة الأشرفیة) ی کردوە لەساڵی (٦٠٧)ی کۆچی لەدایك بووە و لە(جمادی الأولی)ی ساڵی (٦٨٨)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە (إبن تیمیة) لەساڵی (٦٨١)کۆچی دەرسی لەلا خوێندوە[1].

٤٥- زانای پایە بەرز (شمس الدین عبدالرحمن بن الزین احمد بن عبدالملك المقدسي)[2].

٤٦- (احمد بن محمد الظاهری) فەرموودەناسی حەلەبیی، کە لە ساڵی (٦٢٦)ی کۆچی دا لەدایك بووە و لەساڵی (٦٩٦)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[3].

٤٧- (احمد بن عبدالرحمن بن العنیقة الحراني)[4].

٤٨- ئافرەتی چاکەکار (أم الخیر ست العرب بنت یحي بن قایماز بن عبدالله الدمشقي) کەلەساڵی (٥٩٩) کۆچی دا لەدایك بووە و لەساڵی (٦٨٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، (شیخ الإسلام) لەڕەمەزانی (٦٨١)ی کۆچی دا دەرسی لەلا خوێندوە[5].

٤٩- ئافرەتی زانا و بەرێز و خاوەن کەسایەتیی گەورە (أم العرب فاطمة بنت ابی القاسم علي بن ابی محمد القاسم بن ابی القاسم علی بن الحسن بن هبتالله) کە کچی مێژوو نووسی شام (ابوالقاسم بن عساکر)ە لەساڵی (٥٩٨) ی کۆچی دا لەدایك بووە، لەساڵی (٦٨٣)ی کۆچی وەفاتی کردوە و، لە رەمەزانی ساڵی (٦٨١)ی

---

(١) مجموع الفتاوی ١١٦/١٨ – ١١٧ / شذرات الذهب ٤٠٥/٥.

(٢) مجموع الفتاوی ١١٦/١٨ - ١١٧.

(٣) الرد الوافر ص ٩٦.

(٤) الرد الوافر ص ٩٦.

(٥) مجموع الفتاوی ١١٧/١٨ - ١١٨.



کۆچی دا (إبن تیمیة) لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە[١].

٥٠- ئافرەتی چاکەکاری زۆر زانا و خوا پەرستی موجتەهید (زینب بنت مکي بن علي بن کامل) ی حەڕڕانی، کە قوتابییەکی زۆری هەبوون و دەرسی پێ گوتوون، لەساڵی (٥٩٨)ی کۆچی دا لەدایك بووە و لە شەووالی (٦٨٨) ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە لەساڵی (٦٧٥)ی کۆچی دا (ابن تیمیة) دەرسی لەلا خوێندوە[٢].

٥١- ئافرەتی زانای چاکەکار دایکی محمد (زینب بنت احمد بن عمر بن کامل المقدسية)، (ابن تیمیة) لەساڵی (٦٨٤) ی کۆچی دا لە کۆڕی ناوبراودا ئامادە بووە و زانیاری لێ بیستوە، ناوبراو قوتابییەکی زۆری هەبوون، کە دەرسی پێ گوتوون، (الذهبي) لە (العبر)دا باسی کردوە کە لەساڵی (٧٢٢)ی کۆچی لە تەمەنی (٩٤) ساڵی دا وەفاتی کردوە، هەروەها (ابن حجر) دەڵێ لە (ذي الحجة)ی ساڵی (٧٢٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٣].

ئەوانەی باسمان کردن لە بەناوبانگترین ئەو زانا پایە بەرزانەن کە (شیخ الإسلام) زانیارییان لێ فێربووە و زۆر لە زانستەکانی لەلا خوێندوون و بەدەستهێناون، کە دواتر لە زۆربەی زانستەکاندا لە مامۆستاکانی خۆی شارەزاتر دەرکەوت.

---

(١) مجموع الفتاوی ١٨/١١٨ - ١١٩.

(٢) شذرات ٥/٤٠٤.

(٣) العبر ٤/٦٥ / شذرات ٦/٥٦.

## خوێندنەوەو هەوڵدانی خۆی:

دوای ئەوەی (إبن تيمية) پاشخانێکی زۆری زانستیی بۆ دروست بوو، زانیاریەکی زۆری کۆکردەوە، ئەنجا خۆی کتێبی دەخوێندنەوە و تێیاندا قوڵ دەبۆوە و توێژینەوەی بۆ دەکردن، هەبوونی توانا و ئارەزوو و هیممەتی بەدواگەڕان و پەیداکردنی زانستی زیاتر، یاریدەدەریبوون بۆ ئەو مەبەستە، ئەو لە موتاڵا و نووسین تێر نەدەبوو، هیچ شتێك لەوانەی بێ ئاگا نەدەکرد، ئەو وەك (الصفدی) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ:

(كان من صغره حريصاً على الطلب، مُجِداً على التحصيل والدأب، لايُؤْثِرُ على الإشتغال - أي تحصيل العلم - لَذةً.........)[1].

واتە: هەر لە منداڵییەوە داکۆکیکاربوو لەسەر گەڕان بەدوای زانستدا، بەردەوام گرنگیی بە بەدەستهێنانی زانیاری دەدا، هیچ خۆشییەکی بەسەر وەدەسخستنی زانیاری دا باو نەدەدا، هەوڵی دەدا کاتێکی کەمیشی لێ نەفەوتابایە و، بەفیڕۆ نەڕوا کەسێکی کارامە و هەڵکەوتوو بوو، لەبەر لەزەت و خۆشی وەرگرتن لە زانست و زانیاری ئاگای لە خواردن نەدەما و، گوێی پێ نەدەدا ئەوەی هەیبا دەیخوارد و داوای شتی دیکەی نەدەکرد.

بەڕاستیی ئەوەی لێی گێڕدراوەتەوە لە موتاڵاکردنی هەموو جۆرە زانستەکان و خوێندنەوەیان، شتێکی سەرسوڕهێنەر بووە، کەم کتێبی چنگ کەوتوە و نەیخوێندبێتەوە و موتاڵای نەکردبێ، بۆ وێنە: (الحافظ البزار) کە باس لە زۆر خوێندنەوەی (شیخ الإسلام) دەکا، دەڵێ:

(قل كتاب من فنون العلم الا وقف عليه وكان الله قد خصه بسرعة الحفظ وابطاء النسيان، لم يكن يقف على شيء أو يستمع لشيء غالبا، الايبقى على خاطرة اما بلفظه أو معناه)[2].

---

(١) الوافي بالوفيات ١٩/٧ - ٢٢.

(٢) الأعلام العلية ص١٨.



واتە: کەم کتێب هەبووە لەبەشەکانی زانست دا مەگەر دیتوویەتی و خوێندوویەتەوە، خوا تایبەتمەندیی پێ دابوو لە زوو لەبەرکردن و درەنگ لە بیرچوونەوە، شتێکی نەخوێندۆتەوە یان گوێ ی لێ ڕانەگرتوە مەگەر هەر لەبیری ماوە بە وشە یان بەمانایەکەی.

وە (الذهبي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (.. لاتكاد نفسه تشبع من العلم، ولا تروى من المطالعة ولاتمل من الإشتغال، ولا تكل من البحث وقل ان يدخل في علم من العلوم في باب من ابوابه الا ويفتح له من ذلك الباب ابواب.......)[1].

واتە: قەت لە زانست تێر نەدەبوو، وە لە موتالاکردن تینوایەتیی نەدەشکا و بێتاقەت و ماندوو نەدەبوو لە گەڕان و بەدەستهێنانی زانست و توێژینەوەی دا، کەم وا هەبوو دەست بە زانستێك لە زانستەکان یان باسێك لە باسەکان بکا، مەگەر دەرگای زیادی لێ کراوەتەوە و، لەو زانستە دا لە شارەزایان و پسپۆڕانی خۆی زیاتر ئاگاداربووە و شتی زانیوە.

(شيخ الإسلام إبن تيمية) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (ربما طالعت على الآية الواحدة نحو مائة تفسير، ثم أسأل الله الفهم، وأقول: يا معلم ادم وابراهيم علمني، وكنت أذهب الى المساجد المهجورة ونحوها وأمرغ وجهى في التراب، وأسأل الله تعالى، وأقول: يا معلم ابراهيم فهمني)[2].

واتە: (جاری وا هەبووە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ئایەتێك سەد تەفسیرم موتالاکردوە، دوایی لەخوا دەپاڕامەوە لەو بارەوە تێمبگەیەنێ، وە دەمگوت: ئەی فێرکاری (ئادەم و ابراهیم) فێرم بکە، زۆرجاران دەچوومە مزگەوتە دوور و لاچەپەکان و دەم و چاوی خۆم لەخۆڵ وەردەدا و لەخوا دەپاڕامەوە، دەمگوت: ئەی فێرکاری ئیبراهیم فێرم بکە و تێمبگەیەنە).

---

(١) الوافي بالوفيات ١٦/٧.

(٢) العقود الدرية ص٢٦.

وە لە هەموو زانستەکان دا شتی زۆری لەبەر بوو، (الشيخ البرزالي) لەوبارەوە دەڵێ: ((شيخ الإسلام ابن تيمية) ی حەڕڕانی زانا و پێشەوایەك بوو کە زانایان لەسەر دینداریی و گەورەیی و شارەزاییەکەی کۆك بوون، فیقهو رێزمانی عەرەبی و ئوصوڵی خوێندوە و زۆر لێیان شارەزا بووە، لە تەفسیر و حەدیس دا دەستێکی باڵای هەبووە، بەڕاستیی لە هەموو بوارێکدا پیشەوا بووە و مەرجەکانی موجتەهیدی تێدا هاتونەدی و گەیشتۆتە پلەی ئیجتهاد....)[1].

بێگومان ئەو پلە وپایە بەرز و کەسایەتییە بەهێز و شارەزاییە زۆرەی ناوبراو پێی گەیشتوە، چاکە و بەخششێکی خوای گەورە و بەرهەمی هەوڵ وماندوو بوون و کرد و کۆش و شەونخوونیی و گەڕانی زۆری خۆی بەدوای زانستەکان دا بووە، کە لە پێناو ڕەزامەندیی خوا و تێگەیشتنێکی راست و ساغ لە قورئان و سوننەت و، دواتر فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگیریی لە خراپەدا، ئەزیەت و ئازاری زۆری بینیوە و ئەوەی زانیویەتی لە زانستەکان ویستوویەتی لە مەیدانی کردەیی دا جێ بە جێ ی بکات و بێ سڵەمینەوە و ترسان لە لۆمەی لۆمەکاران، ڕایبگەیەنێ.

## قوتابییەکانی (شيخ الإسلام):

(شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، نەوەیەکی زانای موجاهیدی ئەوتۆی پەروەردە کرد و پێگەیاند، کە لەگەڵ ئەودا بەشداربوون لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا، ئەوەی تووشی (شيخ الإسلام) هات لە خۆشیی و ناخۆشیی لە بەسەرهات و ڕووداوەکانی جەنگ لەگەڵ (تەتار) و هەستان بە کاری فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپە، هێندێك جار بە هێز و هێندێك جار بە ئامۆژگاریی جوان، قوتابییەکانیش تووشی بوون، هەروەك چۆن بەشداریی (شيخ الإسلام) یان کرد لە بانگەواز و وریاکردنەوەی خەڵك و دەرس گوتنەوە و سوودگەیاندن و

---

(١) العقودالدرية (١٢ - ١٣).



فتوادان و نووسین و دانانی کتێب، بەهەمان شێوە تووشی بەندیخانە و ئازاریش هاتن.

قوتابیەکانی (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە قوتابیانی زانایانی دیکەی سەردەمی خۆی زۆرتر بوون.

زانای گەورە (محمد ابو زهرە) لەویارەوە دەڵێ: (لەوانەیە ئەو نەوەیەی لە سەردەمی (إبن تیمیة)دا ژیاوە، زانایەکی دیکەیان نەدیبێ و نەناسیبێ کە قوتابیەکانی ئەوەندەی قوتابیەکانی (شیخ الإسلام) زۆر بووبن، کە بێگومان هاتن و چوونی لە نێوان (میسر و شام) و لە (میسر)یش لە نێوان (قاهیرە) و (ئەسکەندەرییە) و بەردەوام بوونی لەسەر دەرس گووتنەوە و وتار و توێژینەوەی مەسەلەکان و مشت و مڕی لەگەڵ کەسانی دیکەدا، هۆکاربوون کە قوتابیەکانی ئەوەندە زۆر بن، قوتابی لە (میسر و شام) هەبوون، کە قوتابیەکانی میسر زۆربەیان لە (قاهیرە و ئەسکەندەرییە)بوون.[1]

**جۆری دەرس و قوتابییەکانی :**

(لەبەرئەوەی دەرسەکانی (شیخ الإسلام) دوو جۆر بوون، قوتابییەکانیشی دوو جۆر بوون:

**جۆری یەکەم: دەرسە گشتییەکان:** بریتی بوون لەو دەرسانەی کە بۆ خەڵکی بە گشتی لە مزگەوتی گەورەدا پێشکەشی دەکردن و ئامۆژگاریی خەڵکی دەکرد و چۆنیەتی شوێنکەوتنی دین و خۆ پاراستن لە بیدعەتی بۆ ڕوون دەکردنەوە، کە لە (میسر و شام) و هەر شوێنێکی دیکەش دەرسی گشتی گوتبایەوە داکۆکیی لەو مەسەلانە دەکردەوە، وە لە (غەززە)ش کە پێیدا تێپەڕی بەرە و (میسر)، بەهەمان شێوە بوو، (شیخ الإسلام) زۆر قوتابی هەبوون کە بۆ ئەو دەرسە گشتییانە ئامادە دەبوون، هەرچەندە وا گونجاوە بەزۆربەیان بگوترێ: (مورید) چونکە توانایان نەبوو لە هەموو مەبەست و قسەکانی (شیخ الإسلام)

---

(١) ابن تیمیة لابی الزهرة ص٥٢٥

بگەن، تا پێیان بگوترێ قوتابی، بەو مانا تایبەتییەی کە زانیاری لێ بە میرات بگرن.

**جۆری دووەم: دەرسە تایبەتییەکان:** ئەو دەرسانەی بەو جۆرە قوتابییانەی دەگوتن، کە تایبەتمەند بوون بە چاك تێگەیشتن و گونجاوبوون بەوەی میراتگری ئەو بن، لە زانیاری لەدوای خۆی و دەست گرتووبوون بە بیر و بۆچوونەکانی و، شیاوی ئەوە بوون جێگری ئەوبن لەو بارەیەوە.

ئەو جۆرە کەسە تایبەتییانە ئەوانە بوون کە (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، هەموو بیر و هزر و بەرنامەی خۆی پێ ڕادەگەیاندن، لە قوتابخانەکانی شام و، لە هێندێك لە کۆبوونەوە تایبەتییەکانی لە (میسر و شام)دا.

وە ئەوبەشە لە قوتابییەکانی ئەوانەبوون کە لەدوای خۆی پارێزگارییان لە پاشماوەی فکریی و زانستیی و کەلەپووری ئەو دەکرد، کەزۆربەیان حەنبەلیی مەزهەب بوون، وە زۆریشیان شافیعیی مەزهەب بوون، ژمارەیان زۆر بوو و نەدەژمێردران، چونکە ماوەیەکی دوور و درێژی نێو بەندیخانە و، لەدەرەوەش نزیکەی (٤٦) ساڵ لەسەر یەك دەرسی گوتۆتەوە و توێژینەوەی کردوە، بەبێ کول بوون و ماندووبوون، هەر لەوکاتەوە کە بابی وەفاتی کردوە، کەتەمەنی خۆی (٢١) بیست و یەك ساڵ بووە تا وەفاتی کردوە لە تەمەنی (٦٧)ساڵیی دا، ئەو قوتابییە تایبەتیانەی وەك چۆن لە دەرسەکان لە گەڵیدابوون، لە ناخۆشییەکانیشدا شەریکی (شیخ الإسلام) بوون و کە ئەو دەگیرا ئەمانیش تووشی ناخۆشیی و گیر و گرفت دەهاتن)[1].

زۆر لەو کتێبانەی ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیی دا دەبینرێن و، لەزۆربەی زانستە ئیسلامییەکان دا قوتابیان پشتیان پێ دەبەستن، دانراوی (شیخ الإسلام ابن تيمية)ن، یان دانراوی قوتابی یان قوتابی قوتابییەکاننی، کە دنیایان پڕ کردوە لە زانست و هیچ قوتابیەکی زانست بێ نیاز نیە لێیان.

---

(١) ابن تيمية لأبي زهرة ص ٥٢٥ - ٥٢٦.



(الحافظ ابن حجر) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە باسکردنی چاکە و خەسڵەتەکانی (شیخ الإسلام إبن تیمیة) دا باسی ئیمام (ابن القیم) ی قوتابیی دەکات، وەکو نموونەیەکی جوان لە قوتابییەکان کە دەبنە مایەی چاکە بۆ مامۆستاکانیان و دەڵێ: (. ولو لم يكن للشيخ تقي الدين من المناقب إلا تلميذه الشهير الشيخ (شمس الدين ابن قيم الجوزية) صاحب التصانيف النافعة السائرة، التى انتفع بها الموافق والمخالف، لكان غايه في الدلالة على عظمة منزله)[1].

واتە: ئەگەر (شێخ تقي الدين ابن تيمية) هیچ خەسڵەتی بەرز و شوێنەوارێکی باشی نەبێ، جگە لە قوتابییە ناودارەکەی (شیخ شمس الدین ابن القیم) کە خاوەنی چەندین کتێبی بە سوودە و، دۆستەکانی و نەیارەکانی سوودیان لێ بینیون، ئەوە ئەو پەڕی مانای گەورەیی و بەرزی پلەو پایەی (شیخ الإسلام) دەگەیەنێ.....

**هۆکاری زۆربوونی قوتابییەکانیی :**

١- خاوەنی کەسایەتییەکی گەورەو بەهێز بوو، کە کەسانی زیرەك و خاوەن توانا زۆرەکان دەچوونە لای، وێڕای ئەو توانایەی هەیبوو لە کارتێکردنی دەوروبەرکەی و کارکردنی بەردەوامی بۆ ئیسلام، لە هەموو بوارو لایەنە جیاوازەکاندا.

٢- زانیاری زۆر و تێگەیشتنی فراوان و شارەزابوونی لە هەموو زانستەکانی سەردەمی خۆی، کە ئەمە وای کرد ببێتە جێی مەبەستی قوتابیانی تامەزرۆی عیلم و زانیاری، کە لەوکانی و سەرچاوە زۆرانەی، زانستە جۆراوجۆرەکان بخۆنەوە، وە توانایەکی زۆری پێ بەخشرابوو لە سەرنج ڕاکێشانی قوتابیان، وێڕای ڕەوانبێژیی و زمانپاراویی.

---

(١) الرد الوافر ص٢٣١.

٣- زۆر هاتوچۆ کردنی لە نێوان (میسر و شام)دا کە ئەمە گەورەترین کاریگەریی هەبووە بۆ ئەوەی خەڵکێکی زۆر سوود لە زانستەکانی ببینن، لە سەفەردا بوویێ یان نیشتەجێ بوویێ، خەڵکی بەردەوام سوودیان لێ بینیوە، بگرە ئەوکاتەی کە لە بەندیخاشدا بووە، سوودی هەر لێ بینراوە.

٤- گوتنەوەی دەرسی گشتی کە ببووە مایەی پەیداکردنی پەیوەندییەکی زۆری کۆمەڵایەتیی، لەگەڵ زۆر لە چین و توێژەکانی کۆمەڵگای (دیمەشق و قاهیرە) دا، وە بە هۆی قسە هەق و بوێرەکانی رێزو خۆشەویستی و سام و گەورەیی لای خەڵك بە گشتی بۆ دروست بوو بوو، لە هەموو توێژەکاندا خۆشەویست و کەسی دڵسۆزو نزیکی هەبوون، وێڕای ئەوە ئەو دەرسە تایبەتییانەی کە پێشکەشی قوتابییە تایبەتەکانی دەکردن، کە لە میانی ئەوەدا زانیاری زۆرو توانای بەرزی ناوبراو زیاتر دەرکەوت.

٥- رێزو خۆشەویستی بۆ قوتابییەکانی و بەخشینی زانیاری پێیان و مامەڵە و رەفتار کردنێکی جوان لەگەڵ ئەو تواناو لێهاتوویییەی کە ئەوان هەیانە، کە ئەوە بوو بە هۆی ئەوەی قوتابییەکان زۆر متمانەیان بە خۆیان هەبێ لە گوتنی قسەی هەق و بەرگریی کردن لێی، لەگەڵ هەبوونی گرفت و بەربەستیشدا.

**بەناوبانگترین قوتابییەکانی شیخ الإسلام :**

وەك گوتراوە: (قوتابیان پەڕی نووسراوی مامۆستایەکانیانن) قوتابییەکانی (شیخ الإسلام) وەك فەخرو شانازیی بەسن بۆی، ئەوان پێشەواو زانای هەڵکەوتوون، پاك و هەڵبژاردەن، شاهێدی زانست و پارێزکاریی و چاکەکارییان بۆ دراوە، کە کاروبەرنامەیان بریتیی بووە لە لێکۆڵینەوەو وردبینی و شیکردنەوەی مەسەلەکان. وەك پێشتریش باسمان کرد لە توانای ئێمەدا نیە هەرکەسێك دەرسی لەلای (إبن تیمیة) خوێندبێ و قوتابی ئەو بوویێ بیناسین، چونکە ناوبراو لە سەرەتای تەمەنیەوە چۆتە نێو کاری زانستەوە و دواتر دەستی کردوە بە دەرس گوتنەوە و فتوادان، ئەمەش لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیەوە تا وەفات کردنی لە تەمەنی شەست و حەوت ساڵیدا زۆر زۆر دەکات، بەڵام ئاماژە بە ناودارترین قوتابییەکانی



دەکەین کە دەرسیان لەلا خوێندوە و لێ ی بەهرەمەند بوون:

١- شەرعزانی حەنبەلی، موجتەهیدی رەها -مطلق-، توێژەرەوەی قورئان، نەحو زان، شارەزا لە ئوصول، (شمس الدين محمد بن ابوبكر بن أيوب الزرعي الدمشقي) ناسراو بە (ابن قيم الجوزية) کە خاوەنی چەندان کتێبی بە سوود بووە، دۆستان و نەیاران سوودیان لێیان بینیوە، لە ساڵی (٧٥١)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[١].

٢- زاناو پێشەوا، قورئان و سوننەت لەبەر، مێژوونووسی ئیسلام، رەخنەگر لە فەرموودەناسیی و شارەزا لە (جرح و تعديل) (شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان التركماني "الذهبي") دیمەشقی کە لە ساڵی (٧٤٨)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، خاوەنی کتێبی (تأريخ الإسلام) و (سير اعلام النبلاء ) و (ميزان الإعتدال) و چەندانی دیکە یە[٢].

٣- پێشەوای فەرموودە ناسی قورئان و سوننەت لەبەر و شەرعزانی مێژوونووس و نەحوزانی خاوەن زانستەکان (شمس الدين محمد بن احمد بن عبدالهادي بن قدامة المقدسي الحنبلي)، خاوەنی (العقود الدرية) وەچەند کتێبێکی دیکە، لە ساڵی (٧٤٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٣].

٤- پێشەوای زانای پارێزکاری دونیا بەکەمگر، فەموودەناسی گەورەی سەردەم، قورئان و سوننەت لەبەری شارەزا (جمال الدين بن الزكي عبدالرحمن بن يوسف المزى الحلبي، الدمشقي) کە شافیعی مەزهەب و پێشەوای فەرموودەناسان بووە، خاوەنی کتێبی (تهذيب الكمال في أسماء الرجال) ە لە ساڵی (٧٤٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٤].

---

(١) شذرات الذهب ١٦٨/٦.

(٢) البداية ١٩٤/١٤ / شذرات الذهب ١٥٣/٦.

(٣) البداية ٢٢١/١٤ / الذيل على طبقات الحنابلة.

(٤) البداية ١٩١/١٤ / تذكرة الحفاظ ١/ ٣٩٩.

٥- پێشەوای قورئان و سوننەت لەبەر، شەرعزان و مێژوو نووس و توێژەرەوەی قورئان، (أبو الفداء عمادالدين اسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي الشافعي) ، خاوەنی (تفسير القرآن العظيم) وە کتێبی (البداية والنهاية) لە مێژوودا، کە لە ساڵی (٧٧٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[١].

٦- شەرعزان، شارەزا لە "اصول"، فەمووده ناس، جێگری قاضي القضاة، (محمد بن مفلح بن محمد المقدسي الرامينى الدمشقي شمس الدين ابو عبدالله الحنبلي) کە لە ساڵی ٧٦٣ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٢].

٧- پێشەوا و قورئان و سوننەت لەبەر، و مێژوو نووسی ناودار (قاسم بن محمد بن يوسف بن محمد بن يوسف البرزالى ) کە بە ئەسڵ ئیشبیلیی یە، دیمەشقیی، شافیعیی، خاوەنی مێژوو، وە چەندین کتێبی دیکەی جۆراوجۆر کە لە ساڵی (٧٣٩)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٣].

٨- پێشەوای قورئان و سوننەت لەبەری شەرعزانی زانای ئەدیبی هەڵکەوتوو (فتح الدين ابو الفتح محمد بن ابى عمر محمد بن أبى بكر بن سيد الناس اليعمرى ئەندەلوسیی، ئەشبیلی، ئنجا مصريی شافیعیی ) کە لە ساڵی (٧٣٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە[٤].

٩- قازیی و شەرعزان، زاناو پێشەوا (شرف الدين ابو العباس احمد بن الحسن بن عبدالله بن ابوعمر محمد بن احمد بن قدامة)ی حەنبەلیی، زانای حەنبەلیەکان کە بەئەسڵ مەقدیسی یە، ئنجا دیمەشقیی ناسراو بە (ابن قاضي الجبل) لە ساڵی (٧٧١)ی کۆچی وەفاتی کردوە[٥].

---

(١) شذرات الذهب ٦/ ٢٣١ / الدرر الكامية ١/٣٩٩.

(٢) البداية ٢٥٢/١٤. شذرات ١٩٩/٦

(٣) البداية ١٩٦/١٤.

(٤) الرد الوافر ٥٨ - ٦٠.

(٥) الردالوافر ١٣٢ / شذرات ٢١٩/٦



١٠- مامۆستا و زانای گەورە و فەرمووده ناسی هەڵکەوتوو (شمس الدین ابو عبدالله محمد بن محمد بن أبي بكر بن أبي العباس احمد بن عبدالدائم) کە لە ساڵی (٧٧٥)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[١].

١١- مامۆستاو زانای فەرموودەناس، بەکەڵك و ئەمینداری دین (محمد بن ابي اسحاق ابراهيم بن محمد بن احمد بن احمد الواني) کە لە ساڵی (٧٣٥)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٢].

١٢- زانای چاکەخوازی فەرموودەناس (شمس الدین محمد بن ابراهیم بن محمد بن ابي بكر بن ابراهيم بن يعقوب بن الياس الأنصاري الخزرجي) لە ساڵی (٧٦٢)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە[٣].

١٣- مامۆستاو زاناو شەرعزانی زۆر خواپەرست (شرف الدین ابوعبدالله محمد بن الشیخ سعدالدین ابي محمد سعدالله بن عبدالأحد بن سعدالله بن عبدالقهار بن عبدالواحدی حەڕڕانیی بن نجیح) کە لە ساڵی (٧٢٣)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە، (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) مۆڵەتی پێ داوە بە فتوادان، یەکێك بووە لەوانەی زۆر بەیەکەوە بوون[٤].

١٤- مامۆستاو زانای گەورە و فەرموودەناس (ناصرالدین ابوالمعالي محمد بن طغريل بن عبدالله الخوارزمي الصيرفي المتصوف) کە لە ساڵی (٧٣٣)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە، گوێگری (شیخ الإسلام) بووە لە ڕۆژی جومعەی دوازدەیەمی ڕەمەزانی (٧١٧)ی کۆچی دا، لە مزگەوتی دیمەشق[٥].

---

(١) الرد الوافر ٦١ - ٦٢.

(٢) الرد الوافر ٧٤ - ٧٦.

(٣) الر الوافر ٨٠ - ٨١.

(٤) الرد الوافر ص٩٠.

(٥) الرد الوافر ص٩١ -٩٢.

١٥- پێشەواو مامۆستای دنیا بەکەمگر و زانای پایە بەرز و فەرموودەناس (حافظ)ی گەورە، مامۆستای فەرموودەناسان (شمس الدین ابوبکر محمد بن عبدالله بن احمد بن عبدالله السعدی المقدسي الحنبلي)، کە بەبێ دەنگ ناوی دەرکردوە، لە ساڵی (٧٨٨)ی کۆچی دا، وەفاتی کردوە و یەکێك لە مامۆستا ناودارەکانی بریتی بووە لە (إبن تیمیة)[١].

ئەو زانایانەی باسمان کردن هێندێك بوون لەو قوتابیانەی کە لەسەر دەستی (شیخ الإسلام ابن تیمیة) بەهرەمەند بوون و دەرسیان لەلای ناوبراو خوێندوەو زانست و شارەزاییان پەیداکردوە و، بوونە زانای ناوداری سەردەمی خۆیان، کە هەموویان بە قوتابی تایبەت و ناوازەی (شیخ الإسلام) دادەنرێن و هەریەکەیان زانایەکی بەکەڵك و خەزنەیەکی بەسوود بوون بۆ خەڵکی و چەندان کتێب و نووسراوی بە سوودیان لەدوای خۆیان بەجێ هێشتوە و سوودیان لێ بینراوە، کە ئەوە گەورەیی و زانایی و لێهاتوویی (شیخ الإسلام) دەگەیەنێ کە خاوەنی ئەو جۆرە قوتابییانە بووە.

---

(١) الرد الوافر ص ٩٥ - ٩٦.



بەشی چوارەم



# هەڵس و کەوت و ڕەوشت و خووی (شیخ الإسلام)

ئەو خوورەوشت و سیفەتانەی (شیخ الإسلام) یان ڕازاندۆتەوە، زۆرن و بەشێوەیەکی گشتی دەلالەت لەسەر گەورەیی ناوبراو دەکەن، کە بەرهەمی ئیمانی چەسپاون، چونکە هەرکاتێك ئیمان پتەوبوو، چۆ نێو دڵان و جێگیر بوو و دڵەکانی رۆشنکردەوە، ئەوە خووڕەوشتی خاوەنەکەی جوان و فراوانتر دەبێ و هەموو لایەنەکانی ژیانی دادەپۆشێ . چونکە عیبادەت و رەوشت و خوی بەرزو جوان بەرهەمی عەقیدەی خاوێن و ئیمانی پتەوە.

(شیخ الإسلام) لە زۆر ڕووەوە پێشەنگی ئەو رەوشت و ئاکارە بەرزانە بووە و گەیشتۆتە ئەوپەڕی، بۆیە زانایانی سەردەمی خۆی سەرسامیی خۆیان بەرانبەر ئەو ئاستە بەرزەی کە لەو لایەنەوە پێگەیشتوە، دەربڕیوە.

(الحافظ ابن الزملكاني) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لەوبارەیەوە گوتوویەتی:

ماذا يقول الواصفون لـه     وصفاته جَلَت عن الحصر
هو حجة لله قاهـــــرة     هو بيننا اعجـوبة الدهـر
هو آية للخلق ظاهـــرة     أنوارهـا أربَت على الفجر[1]

---

(١) العقود الدرية ص ٩. الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٩٢

**(ئیمام ذەهەبیی)** لەو بارەوە دەڵێ: (لەسەردەمی خۆیدا پێشەوایەتی لەودا کۆتایی پێهاتوە، لە زانیاریی و کار پێ کردن و پارێزکاریی و، گوێ نەدان بە خۆشیی و ماڵی دونیا و، هێمنیی و لەسەرخۆیی و، خۆ بەکەم گرتن و نەرم ونیانیی و، رێز و حورمەت و فەرمان بە چاکە و رێگیری لە خراپە و ڕاستیی لە هەڵس و کەوت و ئەمانەت و پاکیی و پارێزراوی و نیازو مەبەست خاوێنی و دڵسۆزیی و رووکردنە خواو گەڕانەوە بۆلای و زۆر لێترسانی و، بەردەوامی لە هەست پێکردنیی چاودێریی خواو پاڕانەوە لێ ی و دەستگرتن بە دەق و شوێنەوار، لە قورئان و حەدیس و... وە خوورەوشتی بەرزو جوان و، سوود گەیاندن بە خەڵك و چاکە کردن لە گەڵیاندا..)[1]

## چەنـد ئاکار و ڕەوشـتێکی (شیخ الإسلام):

### ١- ئیمان بە هێزیی:

چەسپینی ئیمان و بیروباوەڕ لە دڵ و دەروونی (شیخ الإسلام) دا بەشێوەیەک بوو، کە کەم کەس دەتوانێ لە باسکردنی دا، هەقی خۆی بداتێ، بێگومان هەڵوێستە ئازاو جوامێرەکانیشی بەرهەمی ئەو ئیمانە بەهێزە بوون کە دڵی ئاوەدانکردۆتەوە و ئازایەتیی و بوێریی پێ بەخشیوە.

پێشەوا (شمس الدين ابن قيم الجوزية) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: گوێم لە (شيخ الإسلام ابن تيمية) بوو دەیگوت: في الدنيا جنة - يعني جنة الإيمان بالله وبما جاء به سيدنا رسول الله- من لم يدخلها- أي يتصف بها في الدنيا- لايدخل جنة الآخرة).

واتە: لە دونیادا بەهەشتێك هەیە - مەبەستی بەهەشتی ئیمان بەخواو بەوەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هێناویەتی- هەرکەسێك نەچێتە نێوی -

---

(١) العقود الدرية ص٤.



واتە لە دونیادا پێی نەڕازابێتەوە- ناچێتە بەهەشتی ڕۆژی دوایی.

وە جارێکیان پێی گوتم: (ما يصنع أعدائي بي؟ أنا جنتي وبستاني في صدري - يعني بذلك إيمانه وعلمه- أين رحت فهي معي لا تفارقني، إن حبسي خلوة، وقتلي شهادة، وإخراجي سياحة) .

واتە: دوژمنانم چیم لێ دەکەن؟ من بەهەشت و باخ و بێستانم لە سینەم دایە - مەبەست پێی ئیمان و زانیارییەکەی بوو- بۆ هەر جێیەك بڕۆم ئەو بەهەشتە لەگەڵم دایە و لێم جیا نابێتەوە، حەبس کردنم خەڵوەتە، کوژرانم شەهادەتە، دەرکرانم، گەشتوگوزارو سیاحەتە.

وە جارێکیان لە ژووری بەندیخانەی (قلعة)دا دەیگوت: ئەگەر بە پڕی ئەو قەڵایە زێڕم بەخشیبایە نەدەبووە بارتەقای سوپاس کردنم بۆ ئەوچاکەیەی لەگەڵمدا کراوە - واتە لێرە بوونم سوودێکی زۆری هەبووە بۆ دنیاو قیامەتم- یان دەیگوت: ئەگەر پڕی ئەو قەڵایە زێڕ ببەخشم، پاداشتی ئەو چاکەیەم پێ نادرێتەوە کە بەهۆی بەندکرانم تووشی بووم لەلایەن کەسانێکەوە.

وە لەکاتی زیندانیدا لە سەجدەکانیدا دەیگوت: (اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) واتە: ئەی خوایە یارمەتیم بدە، لەسەر یادو سوپاسکردنی خۆت و چاك عیبادەت کردنم بۆت.

وە جارێکیان پێی گوتم: (المحبوس من حبس قلبه عن ربه تعالى، والمأسور من أسره هواه)

واتە: بەندکراو ئەو کەسەیە دڵی بەند کرابێ لە پەروەردگاری خۆی - واتە ئاگای لێ نەبێ و یادی نەکا- وە دیلکراو، ئەو کەسەیە هەواو نەفسی دیلی کردبێ.

وە کاتێك بردیانە سجنی (قلعة)و چووە ژوورێ، تەماشای شوورەکەی کردو گوتی: ﴿فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ﴾ الحديد١٣.

واتە: شوورەیەك دەکێشرێ لە نێوانیاندا -ئیمانداران و مونافیقان- کە دەرگایەکی هەیە دیوی ژوورێ ڕەحمەتە و لای دەرێشی عەزابە.

وە خوا ئاگادارە قەت کەسم نەبینیوە ژیانی وەك ئەو خۆش بوویێ، هەرچەندە بەڕواڵەت لە ژیانی ناڕەحەتیی و تەنگ دەستیی دابوو، بەشێك لە ژیانی ئازارو دەربەدەری و سجن و هەڕەشە و گوڕەشە بوو، بەڵام وەك ئینسانێك لە خۆشترین ژیان و دڵخۆشترین و دڵ بەهێزترین کەسدا دەردەکەوت و، هەردەم رووی گەش و درەوشاوە بوو .

لە درێژەی قسەکانی دا (ابن القیم) دەڵێ: ئێمە ئەگەر ناخۆشییەك یان ترس رووی تێ دەکردین و تینی بۆ دێنایین، یان گومانمان بۆ دروست دەبوو، زەویمان لێ وەتەنگ دەهات، دەچووینە لای (شیخ الإسلام) هەرکە دەمانبینی و گوێمان لە قسەکانی دەبوو، هەموو دڵتەنگی و ناڕەحەتییمان لەلا دەرۆیشت و، دەبوو بە شادیی و دڵنیایی و هێز و ئارامیی و ئۆخژن.

وەگوێم لێبوو دەیگوت: (الذکر للقلب مثل الماء للسمك، فکیف یکون حال السمك اذا فارق الماء) . واتە: یادی خوا بۆ دڵ وەك ئاو وایە بۆ ماسی، حاڵی ماسی چۆن دەبێ ئەگەر لە ئاو دابڕێ. ؟![1]

## ٣- دڵسۆزیی لە کەران بەدوای ڕاستیی و، دەربازبوون لە چڵکی هەواو ئارەزووەکان:

ساغیی و ڕاستیی سەرچاوە و مایەی قبووڵ بوونی بەندایەتیی و نزیکیی بەندەیە لە پەروەردگار، وە سەرچاوەی هەرە گەورەیە کە وشك نابێ و، بنچینەیە بۆ هەموو کردەوە چاکەکان، بەڵکو بناغەی پتەوی هەموو قسەو کردەوەکانە . لەوبارەوە (شیخ الإسلام) دەڵێ:

(.. شتێکی ئاشکرایە کە هەموو ئیمان بریتیە لە پارێز(تقوی) لە خوا، لێرەدا ناتوانین بنچینەو لق و ماناکانی تەقوا باس بکەین، ئەوەندە هەیە بەکورتی پارێز لە خوا - تقوی الله- هەموو دینە .

---

(١) الوابل الصیب ٦٩ - ٧٠ / الذیل علی طبقات الحنابلة ٢/٤٠٢



بەڵام سەرچاوەی خێرو ڕەگ و ریشەکەی بریتیە لە دڵسۆزیی و یەکلابوونەوەی بەندە بۆ پەروەردگاری، لە ڕووی بەندایەتیی کردن -خواپەرستن- و داوای یارمەتی لێکردنەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾

هەر تۆ دەپەرستین و داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین، وە فەرموویەتی:

﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ﴾ هود: ١٢٣

واتە: بیپەرستەو پشت هەر بەو ببەستە . وە دەفەرموێ:

﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود: ٨٨

واتە: پشتم هەر بەو بەستوە و هەر بۆ لای ویش دەگەڕێمەوە.، وە دەفەرموێ:

﴿فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ ﴾ العنكبوت: ١٧

واتە: هەر لە خوا ڕزق و ڕۆزیی داوابکەن و هەر ئەو بپەرستن و سوپاسگوزاریی بن[1].

بێگومان ئەوەی لەگەڵی ژیابێ لە خۆشەویستانی هەستی بە دڵسۆزیی (شیخ الإسلام) کردوە و تێی گەیشتوە، ناحەزانیشی لەو بارەوە نەیانتوانیوە بە چاکە وەسفی نەکەن و ئەو ڕاستییەیان سەلماندوە، چونکە سروشتی زانای ئیسلامیی خواناس، هەموو کاتێك بە ویژدان بووە لە شەهادەتدان و هەڵسەنگاندنی کەسانی دیکەدا، هەرچەندە لە زۆرشتیشدا جیاوازیی هەبووبێ لە بەینداا بۆ نموونە: زانای پایەبەرز (السبكي) (تقي الدين علی بن عبدالكافي) (رەحمەتی خوای لێبێت) لەو نامەیەی دا کە بۆ (ئیمام ذهەبی) نووسیوە، وەسفی (شیخ الإسلام ابن تيمية) دەکا و دان بە گەورەیی و فەزڵ و چاکەی دا دێنێ[2].

---

(١) الوصية الصغرى (٤٤).

(٢) الذيل على طبقات الحنابلة ٣٩٢/٢ / العلماء العزاب ص١٧٥. الردالوافر١٠٠

وە ساغیی ناوبراو تایبەت نەبوو بە ماوەیەك لە ژیانی دا، بەڵكو هەموو ماوەی ژیانی داپۆشیوە، پێشەوا (محمد أبو زهره) رەحمەتی خوای لێبێ، لەو بارەوە دەڵێ: ساغیی و دڵسۆزیی (شیخ الإسلام) لە چوارشتدا رەنگی داوەتەوە و دەركەوتوە، بگرە هەموو تەمەنی گرتۆتەوە و هیچ لایەن و قۆناغێكی ژیانی لێ بێ بەش نەبووە، كە ئەوە وامان لێ دەكات باوەڕمان وابێ، ئەو زانا پایە بەرزە، لە هەموو ژیانی دا بە ساغیی بۆ خواو دینەكەی ژیاوە:

**یەكەم:** ئەو رووبەڕووی زانایان بۆتەوە بەوەی زانیویەتی و قەناعەتی پێی هەبووە و لە نێو خەڵكدا بڵاوی كردۆتەوە، ئەوەش دوای تێڕامان و توێژینەوە، بەتایبەت لەو مەسەلانەدا كە ڕای ئەو پێچەوانەی ئەوە بووە كە لەنێو خەڵكدا باو بووە، جا كە زانیویەتی قسەكەی حەقە بانگەشەی بۆ كردوە و لای گرنگ نەبووە كێ رازی دەبێ و كێ پێی ناخۆشە، چونكە تەنیا خوای مەبەست بووە، لە وتوێژو موناقەشەكانیشی دا قسەی بریقەدارو لووسی بۆكەس نەكردوە، جگە لە خوا مەبەستی رازی كردنی كەس نەبووە.

**دووەم:** ئەوەی ساغیی و دڵسۆزیی ناوبراوی دەردەخست و توانەوەی لەهەقدا نیشاندەدا، جیهادكردنی بوو لەڕێی خوادا ئەگەر بە هێزو شمشێریش بووایە، وەك لەگەڵ تەتار و (نصيرية)كان پێی هەستا، وە تەحەممول كردنی ناخۆشیی و لێ وەتەنگ هاتنەوەی ئازادییەكانی بوو، لە پێناو ڕانواندنی ڕاوسەرنجی خۆی كە لەگەڵ هەبوونی زەحت و زۆری سوڵتان لەسەری بۆ رانەگەیاندنی سەرنجەكانی بەڵام ئەو، راوقەناعەتەكانی خۆی رادەگەیاندن، تا سەرئەنجام سوڵتان بەمەبەستی سنووردارکردنی دەنگی (شیخ الإسلام) بڕیاری بەندكردنی دا لە بەندیخانەی (قلعة)ی دیمەشق، تا لەسەر دڵسۆزیی و بۆچوونەكانی بە بەندكراوی لە بەندیخانەدا وەفاتی كرد، ئەوە هەمووی لەسەر ئەوەبوو كە دڵسۆزیی بۆ ئیسلام وای لێكردبوو ئەوەی پێی راست و هەقە بیڵێ و ئاشكرای بكات، بێ گوێ دانە هەواو ئارەزووی خۆی ئەوەش بەمەبەستی دڵسۆزیی نواندن بۆ دینی خوا.



**سێیەم:** ئەوەی یەکلابوونەوەو ساغیی و بەریی بوونی (شیخ الإسلام) ی لە بەدواکەوتنی هەواو نەفس و حەسوودیی و رق لێ بوونەوەی خەڵکی زیاتر لێ دەرخست، ئەوە بوو ئەو کەسانەی عەفوو کردن و سینگ فراوان بوو لەگەڵیان کە خراپەیان لەگەڵیدا کردبوو، وە دەیانویست بکوژرێ یان سجن بکرێ. بەهەمان شێوە (شیخ الإسلام) سنگ فراوانیی بەرانبەر هەموو ئەوانەش نیشاندا کە کتێبەکانیانی لێ ستاندبوون، کاتێك بەندکرابوو لە قەلعەی دیمەشق، وەك دەیگوت: (أحللت کل مسلم من أیذائه لی) واتە: گەردنی هەموو مسوڵمانێکم ئازاد کردوە کە ئازاری داوم.

**چوارەم:** هیچ کات داوای پلە و پایەی نەکردوە، جگە لەوە هەموو ئەو پلەوپایانەش کە بۆی ڕانوێنران ڕەتی کردوونەوە، بۆ نموونە: داوای لێکراوە پلەو پایەی (مشیخه الشیوخ و قاضي القضاة) وەربگرێ، بەڵام وەك (ابن رجب) لە (الذیل علی طبقات الحنابلة)دا باسی کردوە، هەموویانی ڕەت کردونەوە[1]. زۆرجاران ئەو ساغیی و یەکلابوونەوەیەی لە فڕوفێڵی ناحەزانی رزگاری کردوە، کە پیلانیان بە نهێنیی بۆ داڕشتوە.

لەو بارەوە ئیمام ذەهەبی دەڵێ: (وکم من نوبة قد رموه في قوس واحدة، فینجیه الله تعالی فإنه دائم الإبتهال، کثیر الإستعانة، قوي التوکل، ثابت الجأش، له أوراد واذکار یدیمها)[2]

واتە: زۆر جاران لە کەوانێکەوە کردوویانەتە نیشانە، بەڵام خوا پاراستوویەتی، ئەو بەردەوام لە پاڕانەوەو لاڵانەوەدا بوو بۆ خوا، زۆر داوای یارمەتی لە خوا کردوە و پشت بەستنی بەخوا بەهێز بوو، خۆڕاگرو نەترس بوو، چەند زکرو تەسبیحاتێکی هەبوو بەبەردەوامیی ئەنجامی دەدان.

---

(١) ابن تیمیة لأبي زهرة ص١٠٠ - ١٠٢ / الذیل علی طبقات الحنابلة ٢/٣٩٠.

(٢) الذیل علی طبقات الحنابلة ٢/٣٩٤.

## ٣- دوورکەوتنەوە لە گوناهو، دونیا بەکەمگرتن :

ئەگەر زانا لە ژیانیدا دنیا بەکەمگریێ و، هەڵپە نەکا بۆ پلەوپایە، دەبێتە جێی متمانەی خەڵکی و گرنگیی پێدەدەن، چونکە خەڵك هەست دەکەن ئەو کەسە دوورە لە داکۆکی کردن و دواکەوتنی هەواونەفس، بەڵکو داکۆکی کارە لەسەر پێویستییەکانی خەڵك و رایی کردنی داواکانیان و سوودیان پێ دەگەیەنێ، هەر بۆیە خۆشەویستییان بۆی زیاد دەبێ، (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لەو کەسە دنیا بەکەمگرانە بووە کە وێنەی پێ هێنراوەتەوە، بەڵکو زۆر زاهید بووە و شتێکی کەم نەبێ لە ماڵی دنیا نەیبووە، وە ئەگەر کەسێك ویستبی شتێکی بداتێ، قبوڵی نەکردوە.

(الحافظ الذهبي) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەربارەی زوهد و چەند سیفەتێکی بەرزی دیکەی (شیخ الإسلام) دەڵێ: (كان من بحور العلم ومن الأذكياء المعدودين، والزهاد الأفراد، والشجعان الكبار، والكرماء الأجواد، أثنى عليه الموافق والمخالف)[١].

واتە: (شیخ الإسلام) یەکێکە لە زانا گەورەکان، وە لەو کەسە زیرەکانەی کە دەژمێردرێن، وە یەکێکە لەو زاهد و دنیا بەکەمگرانەی کە دەگمەنن، وە لەوانەی زۆر ئازان، وەلەوانەی چاوتێرو سەخیین، کە دۆستان و، ناحەزانیشی مەدحیان کردوە.

سەبارەت بە وەرع و لە خواترسانی (شیخ الإسلام) زانای گەورە (صفي الدين البخاري) دەڵێ: لە خوا ترسیی و خۆپاراستنی لە گوناهان بە ئەندازەیەك بووە کە کەمکەس بەو شێوەیە بینراوە، لە ژیانیدا بەشداری لە کڕین و فرۆشتن دا بە مەبەستی بازرگانی نەکردوە، قەت داوای شتێکی دنیایی بۆ خۆی لە هیچ ئەمیرو کاربەدەست و دەوڵەمەندێك نەکردوە، هەرچەندە چاوەڕوان بوون ناوبراو داوای شتێکیان لێ بکات، هیچ ماڵ و پارەیەکی پاشەکەوتیشی نەبووە[٢].

---

(١) تذكرة الحفاظ ص١٤٦٩.

(٢) الكواكب الدرية ص ١٥٦.



(الحافظ أبو حفص البزار) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەفەرموێ: هەموو ئەوانەی (شیخ الإسلام) یان بینیوە بەتایبەتی ئەوانەی زۆر لەگەڵی تێکەڵ بوون، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کەسێکی وەك ئەویان لە زوهد و دنیا بەکەمگرتندا نەبینیوە، بە شێوەیەك ئەو مەسەلەیە دەنگی داوەتەوە و لە نێو دڵی کەسانی نزیك و دووردا چەسپیوە، ئەوانەی سیفەتەکانی شیخ الإسلامیان بیستوە، لە هەر شوێنێك لێیان بپرسرایە کە کێ لەهەموو کەس لەم سەردەمەدا زاهد و دنیا بەکەمگرترە و مەبەستی رەزامەندی خواو رۆژی دوای یە؟ ئەوە دەڵێ: کەسم وەکو (ابن تیمیة) نەبینیوە[1].

## چەند نموونەیەکی دیکە لەسەر زوهد و لە خواترسانیی و دنیا بەکەمگرتنیی:

### أ- وەڵامدانەوەی بۆ سوڵتان کە بۆ دەستخستنی دەستەڵات کار ناکا:

سوڵتان ناصر محمد بن قلاوون (رەحمەتی خوای لێبێت) پێی گوت: خەبەرم دراوەتێ کە تۆ خەڵك بەقسەت دەکات، وە دەتەوێ دەستەڵات و گەورەیی بەدەست بێنی، (شیخ الإسلام) بە دڵێکی ئارام و چەسپاوو دەنگێکی بەرز کە زۆربەی ئامادەبووان گوێیان لێبوو گوتی: (أنا أفعل ذلك.. ؟!! والله ان ملكك وملك المغل لايساوي عندي فلسين)[2].

واتە: من ئەوە دەکەم؟!! سوێند بەخوا هەموو دەستەڵاتی تۆو (مغۆل) لای من دوو فلس ناهێنێ.

---

(١) الأعلام العلية ص ٤٤-٤٥.

(٢) الأعلام العلية ص٧٤.



**ب- شێوازی پەروەردەکردنی قوتابییەکانی بە خۆ گرتنەوە لە هێندێك موباحدا:**

دەربارەی زیادەڕۆیی لە موباح دا، یا جار جار خۆ نەگرتنەوە لە موباح، (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ڕێنمایی و شێوازی پەروەردەکردنی خۆی هەبووە بۆ قوتابییەکانی، لەو بارەوە (ابن القیم) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (قال لي یوما شیخ الإسلام ابن تیمیة - قدس الله روحه- في شيء من المباح: هذا ینافي المراتب العالیة وان لم یکن ترکه شرطا في النجاة)[1].

واتە: ڕۆژێکیان شیخ الإسلام ابن تیمیة - خوا ڕۆحی بە پاکیی بێڵێتەوە- دەربارەی شتێکی موباح پێی گوتم: ئەوە ناکۆکە لەگەڵ گەیشتن بە پلە بەرزەکان دا، هەرچەندە واز لێهێنانی مەرج نیە بۆ ڕزگار بوون.

**ج- دووریی لە خۆشیی ژیان و جلو بەرگی جوان و خواردنی خۆش:**

ڕۆژێکیان دایکی چێشتێکی لێنابوو، سەرەتا تامی نەکرد بزانێ چۆنە، دوایی کە تامی کرد بۆی دەرکەوت کە تاڵە، (شیخ الإسلام) برسی بوو چووە لای دایکی و پێی گوت: برسیمە هیچمان هەیە بیخۆم؟ دایکی گوتی نەخێر، هەر ئەو چێشتەمان هەیە، ئەویش تاڵ دەرچووە، شێخ الإسلام گوتی لە کوێیە؟ ئەویش شوێنەکەی نیشاندا، هەرچەندە تاڵ بوو، بەڵام (شیخ الإسلام) ڕەخنەی نەگرت، تا تێر بوو لێی خوارد[2].

بەکورتی (شیخ الإسلام) هەژاریی هەڵبژاردبوو، دنیای بەکەم دەگرت، ئەگەر شتێکی پێبدرایە دەیدایە خەڵکی و لەسەر زوهد و عیبادەت خۆی ڕاهێنابوو، خۆی خەریك دەکرد بە وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو خۆ دوور دەگرتن لە هۆکارەکانی بەرەو دونیا چوون[3].

---

(١) مدارج السالکین ٢/٢٦.

(٢) الوافي بالوفیات للصفدي ص٢٧.

(٣) الرد الوافر ص٩٥ / العقود الدریة ص١٣.



## ٤- خوا پەرستیی و پاڕانەوەی زۆر

ئیمام ذەهەبی (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (لم أر مثله في ابتهالاته، واستعانته بالله وكثرة توجهه)[1] واتە: کەسم وەك ئەو - ابن تيمية - نەدیوە لە پاڕانەوەو لالآنەوەی بۆ خواو، داوای یارمەتی لە خوا کردنی و زۆر روو تێکردنی.

وە دەڵێ: ((... كان في ليله منفردا عن الناس كلهم خاليا بربه عزوجل، ضارعا اليه، مواظبا علي تلاوة القرآن، مكررا لأنواع التعبد الليلية والنهارية، وكان اذا دخل في الصلاة ترتعد فرائصه وأعضاؤه حتى يميل يمنة ويسرة)[2]

واتە: شەوێ لە خەڵکی جیا دەبۆوە بەتەنیا لەگەڵ خوای خۆی دەیبردە سەر، بە مل کەچیی بۆ خوا، بەردەوام بوو لەسەر قورئان خوێندن، هەموو جۆرە خواپەرستییەکانی شەوو رۆژی دووبارە دەکردنەوە، ئەگەر دەچۆ نێو نوێژیشەوە، کەلەکە و ئەندامەکانی هەڵدەلەرزین و بەلای راست و چەپدا بەلادا دەهات.

چەند نموونەیەك لەو بارەوە:

أ- (ابن قيم الجوزية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لەو بارەوە دەڵێ: (وحضرت (شيخ الإسلام ابن تيمية) رحمه الله، مرة صلى الفجر ثم جلس يذكر الله تعالى الى قريب من انتصاف النهار، ثم التفت الى وقال هذه غدوتي، ولو لم اتغد الغداء سقطت قوتي...).

واتە: جارێکیان لە لای (شيخ الإسلام ابن تيمية) بووم (رەحمەتی خوای لێبێت)، نوێژی بەیانی کرد، کە لێبۆوە تا نزیکی نیوەڕۆ دانیشت هەر زیکرو یادی خوای دەکرد، ئنجا ڕووی تێکردم و گوتی: ئەوە خواردنی - روحی - بەیانیانی منە، ئەگەر ئەو خواردنەم نەبایە هێزم نەدەما. دیسان ناوبراو لەوبارەوە دەڵێ:

---

(١) الوافي بالوفيات ١٧/٧ - الكواكب الدرية ص١٤٥.

(٢) الكواكب الدرية ص١٥٦.

(لا أترك الذكر الا بنية اجمام نفسي واراحتها لأستعد بتلك الراحة لذكر آخر)[١]
واتە: لە زیکرو یادی خوا ناکەوم، مەگەر بە نیەتی حەسانەوەم، کە بەو حەسانەوەیە خۆم ئامادە بکەمەوە بۆ زیکرێکی دیکە.

ب- (شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، زۆر یادو زیکرو عیبادەتی خواکردنی بە مایەی چاك بوونەوە لە نەخۆشیی خۆی داناوە، (ابن القيم) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: گوێم لە مامۆستای گەورەمان (ابو العباس ابن تيمية) بووە، کاتێك نەخۆش بووە گوتوویەتی: دکتۆر پێی گوتوە: ئەوەی کە زۆر زەرەری هەیە بۆ نەخۆشییەکەی تۆ قسەکردنە لە عیلم و بیرکردنەوە و خۆماندووکردنە بەزیکرو یادی خواوە، ئەویش گوتوویەتی: ئایا ئێوە وانازانن کە هەرکاتێك نەفسی ئینسان بەهێزو دڵخۆش بێ، ئەو بەهێزیی و شادیی یە، توانایەکی بۆ پەیدا دەکات کە یارمەتی دەدا بۆ لاچوونی نەخۆشیەکەی، چونکە ئەو نەخۆشییە دوژمنیەتی هەر کاتێ نەفس بەهێزتر بێ بەسەری دا زاڵ دەبێ؟ دکتۆرەکە گوتی: با.

(شيخ الإسلام) گوتی: ئەگەر خۆم خەریك بکەم بە عیبادەت و زیکرو یادی خواو وەدەستهێنانی زانست و زانیاری و گەیشتن بە ئەنجامی بیرکردنەوە و توێژینەوەکان، ئەوە نەفسم دڵخۆش دەبێ و بەهێز دەبێ کە سەرەنجام بەو هۆیەوە نەخۆشییەکەم نامێنێ[٢].

ج- الحافظ البزار (رحمه الله) باس لە چۆنیەتی نوێژی (شيخ الإسلام) دەکاو دەڵێ: (.. ئەو هەرکاتێك نوێژی دادەبەست، لە هەیبەت و کاریگەری ئەو "الله اكبر"ەی دەیکرد، دڵەکان ڕادەچڵەکین و دادەخوریان، ئەگەر قورئانی تێدا دەخوێند، وەك لە پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم- گێڕدراوەتەوە ئاوای دەخوێند، رکووع و سەجدەو مانەوەی تێیاندا بەتەواوترین شێواز ئەنجامی دەدان،

---

(١) الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٤٠٢-٤٠٣ ، العلماء العزاب ص١٧٦-١٧٨، وە لە (الوابل الصيب) ٦٩ - ٧٠.

(٢) مفتاح دار السعادة ٢/١٧٠-١٧١.

کە لە نوێژی فەرزدا باسی لێوە دەکرێ، لە تەحیاتی یەکەمدا کەم دەمایەوە، بەدەنگی بەرزیش سەلامی یەکەمی دەدایەوە، تا ئەوانەی لەوێ بوو گوێیان لێی بێ"[1].

(ابن القیم) (رەحمەتی خوای لێبێت)، لە بارەی خوا پەرستیی و خوا بەگەورە گرتنی (شیخ الإسلام)ەوە، (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (لقد شاهدت من شیخ الإسلام ابن تیمیة - قدس الله روحه - من ذلك امرا لم اشاهده من غیره، وكان یقول كثیرا: (مالي شيء، ولا مني شيء، ولا في شيء). وكان كثيرا ما یتمثل بهذا البیت:

انـا المكـديُّ وابن المكـديِّ وهـكذا كان أبـي وجـدّي

واتە: ئەوەی لە (شیخ الإسلام) خوای رووحی بە پاکیی بێڵیتەوە، بینیومە لەکەسم نەبینوە، کە زۆرجاران دەیگوت: "من خاوەنی هیچ نیم، هیچ شتێك لەمنەوە نیە، من هیچم لە باراندا نیە".

وە زۆر جاران ئەم دێرە شعرەی دەخوێندەوە کە دەڵێ: من سواڵکەری کوڕی سواڵکەرم وە باب و باپیریشم هەر بەو جۆرە بوون.

وە ئەگەر یەکێك بەرەو روو مەدحی بکردبایە دەیگوت: سوێند بەخوا من تا ئێستاش رۆژانە مسوڵمانەتییەکەم نوێ دەکەمەوە، تا ئێستاش نەبوومە مسوڵمانێکی باش.

(ابن القیم) لە درێژەی قسەکانی دا دەڵێ: لە کۆتایی تەمەنی دا (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) بەخەتی خۆی (قاعدة في التفسیر)ی بۆ ناردبووم کە لەسەر بەرگەکەی چەند دێرە شعرێکی خۆی نووسیبوون کە ئەمانە بوون:

أنــا الفقــيـر الى رب البريّات انـا المسـكين في مجموع حـالاتي
انـا الظـلوم لنفسي وهـي ظالمتي والخـير إن يأتنـا من عنده يأتي
لا استطيع لنفسي جلب منفعة ولا عن النفس لي دفع المضرات

---

(١) الاعلام العلية ٣٦-٣٧.

وليس لـي دونـه مولى يدبّرني ولا شفيع اذا حاطت خطيئاتي
الا بإذن مـن الرحمن خالقـنا الى الشفيع كما قد جاء في الآيات
ولست أملك شيئاً دونه ابـداً ولا شـريك أنا في بعض ذرات
ولا ظهـير له كي يستعـين بـه كما يكون لأرباب الولايـات
والفقر لي وصف ذات لازم ابداً كما الغنى ابداً وصف لـه ذاتي
وهذه الحال حال الخلق أجمعهم وكلـهم عـنده عـبد لـه آتي
فمن بغى مطلباً من غير خالقه فهو الجهول الظلوم المشرك العاتي
والحمدلله مـلء الكون اجمعـه مـا كان منه ومـا مـن بعـد يأتي
(ثم الصلاة على المختار من مضَر خير البرية من مـاض ومن آتي)[1]

**ماناکەی:**

من فەقیرم وموحتاجی پەروەردگاری مەخلوقاتم - لەهەموو کات و حاڵێکدا هەژارو بێ دەستەڵاتم

من زوڵمم لە نەفسم کردوە، ئەویش زاڵمی منە - وەهەر چاکەیەك،کە بۆمان بێت لای خواوە بۆمان دێ

من ناتوانم هیچ قازانجێك بە خۆم بگەیەنم - وە ناتوانم هیچ زەررو زیانێك لەخۆم دوور بخەمەوە

من جگە لە خوا هیچ سەرپەرشتیارێکم نیە کارسازم بێ - وەهیچ تکا کارێکم نیە کە گوناهەکانم دەوریاندام

تەنیا بە ئیزنی دروستکەری بە بەزەییمان - کە ئیزنی تکاکار بدات وەك لە ئایەتی قورئاندا هاتوە.

جگە لەو قەت هیچ شتێك شك نابەم - هیچ شەریکی نین، من لە چەند زەررەیەك پێکهاتووم.

---

(١) مدارج السالکین ١/٥٧٨، ٥٧٩ . دێڕی کۆتایی زیادمیە لە (العقود الدرية) ص٣٧٥.



هیچ پەنایەك نیە ئەو پشتی پێ ببەستێ - وەك چۆن گەورەی شوێنەكان هەیانە.

هەژاریی بۆ من وەسفێكی زاتییە و پێمەوە لكاوە و هەر دەمێنێ - وەك چۆن دەوڵەمەندیی و بێ نیازیی وەسفی زاتیی بەردەوامی پەروەردگارە.

ئەو جۆرە حاڵ و وەزعە هی هەموو خەڵكە - هەموو خەڵك بۆ خوا عەبدە و دەگەڕێتەوە لای لە قیامەت.

هەر كەسێك داوایەك بكات جگە لە پەروەردگاری - ئەوە زۆر نەزان و زاڵم و موشریكە.

بە پڕی هەموو بوونەوەر هەموو سوپاس هەر بۆ خوا- ئەوەی بووە لەوەوەیە، ئەوەی دێش لەمەودوا.

ئنجا سەڵاوات لەسەر هەڵبژاردەی هۆزی موزەڕ كە (محمد)ە - باشترین كەسە لە ڕابردوو و داهاتوودا.

## ٥- خۆ بەكەمگریی و هێمنیی و لێبوردەیی بەرانبەر خەڵكی:

بێگومان خۆبەكەمگریی و ڕقی خۆ خواردنەوە، یەكێكە لە تایبەتمەندییەكانی پیاوانی تایبەتی خواو پلەوپایەیەكی گەورەیە لە ئایینی ئیسلامدا و لە زۆر شتی دیكەی باش باشترە، وە ئینسان كاتێك بەو پلەیە دەگات كە خۆ ویستیی بمرێنێت و، دڵی خۆی لەهەموو گوناهو تاوانێكی نەفسیی پاك بكاتەوە، (شیخ الإسلام) خۆی بەو سیفەتە ڕازاندبۆوە، جگە لە سیفەتە بەرزەكانی دیكەی وەك: پلەی بەرزی زانستیی و دینیی، وە ئەوەی دەربارەی ئەو گوتراوە، ئەوە دەسەلمێنێ كە ناوبراو زۆر خواپەرست و خۆ بەكەمگر بووە و سەركۆنەی نەفسی كردوە و رقی خۆی قوتداوەتەوە[1].

---

(١) الحافظ احمد بن تيمية للندوي ١٦٤.

(الحافظ البزار) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەربارەی خۆ بەکەمگریی (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (و أما تواضعه فما رأيت ولا سمعت بأحد من اهل عصره مثله في ذلك، كان يتواضع للكبير والصغير والجليل والحقير، والغني الصالح والفقير، وكان يدني الفقير الصالح ويكرمه ويؤنسه ويباسطه بحديثه المستحلي زيادة على مثله من الأغنياء.....)

واتە: سەبارەت بە خۆبەکەمگریی (شیخ الإسلام) نەمدیوەو نەمبیستوە هیچ کەس لە خەڵکی سەردەمی خۆی وەك ئەو بووبێ، ئەو خۆی بەکەمدەگرت لەگەڵ گەورەو بچووك و کەسی خاوەن رێزو پلەوپایە و کەسی کەم و نزم، و کەسانی دەوڵەمەندی چاك و خەڵکی هەژار، وە فەقیری چاکی لە خۆی نزیك دەکردەوە و هۆگری دەبوو، رێزی دەگرت و بەقسەی شیرین و خۆش دەیدواند، زیاتر لە خەڵکی دەوڵەمەند، هەتا جاری وا هەبوو خزمەتیشی کردوون، شتی بۆ هەڵگرتوون، کە لەوەدا مەبەستی لە خوا نزیك بوونەوە بووە، بێزار نەدەبوو لەوەی یەکێك شتێکی لێپرسیبایە، یان داوای فتوای لێکردبایە، بەڵکو بەروویەکی گەشەوە پێشوازیی لێدەکرد و لەگەڵی رادەوەستا، هەتا پرسیارەکەی تەواو دەکرد و لە قسان دەبۆوە، ئنجا ئەو (شیخ الإسلام) ی بە جێ دەهێشت، گەورە بایە یان بچووك، پیاو بایە یان ژن، ئازاد بووایە یان کۆیلە، زانا بووایە یان نا، نیشتەجێ بووایە یان کۆچەریی، بەقسەیەك ڕووبەڕووی نەدەبۆوە بێ تاقەتی کردبایە، یان بە شێوەیەك ناخۆش بووایە و لێی بێزار بووبا، بەڵکو بەهێمنیی و کراوەیی، وەڵامی دەدایەوە و تێی دەگەیاند و هەڵەو ڕاستیی بۆ لێك جیادەکردنەوە، وە لەگەڵ خەڵکی بووایە یان نا، هەموو کاتێك لە هەستان و دانیشتن و رۆیشتن و مەجلیسی خۆی و خەڵکی دا خۆی بەکەم دەگرت[1].

لە جل و بەرگدا مام نێوەندیی بوو، جل و بەرگی زۆر جوان و بەنرخی لەبەر نەدەکرد، بەشێوەیەك لە خەڵکی جیا بکاتەوە، بەڵکو جل و بەرگەکەی وەك زۆربەی خەڵکی بووە، وە پابەند نەبووە بەیەك جۆر جل و بەرگەوە کە هیچ

---

(١) الاعلام العلية ٥٠-٥١.



جۆری دیکە لەبەر نەکا، بەڵکو بەپێی هەبوون، ئەوەی هەیبووە لەبەری دەکرد، وە لەخواردن دا بە زەحمەت نەبوو، ئەوەی حازر بووایە دەیخوارد، بە هێزیی ئیمان و بیروباوەڕ لە ڕووی دا دیاربوو، لە جل و بەرگ و مێزەر لەسەرنان و هەستان و دانیشتن و ڕۆیشتن دا خۆی ڕانەدەنواند، ئەگەر چووبایە لای یەکێك پێشتر خۆی بۆ ئامادە نەدەکرد و نەدەڕازاندەوە، وە بۆ یەکێکیش کە لەدوورەوە هاتبایە بەهەمان شێوە[١].

دەربارەی ئەوەی کە (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، خۆی بەکەمگرتوە بەسەر کەسدا خۆی هەڵنەکێشاوە و گلەیی و منەتی بەسەر کەسدا نەکردوە (ابن قيم الجوزية) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (سمعت شيخ الإسلام ابن تيمية "قدس الله روحه" يقول: العارف لا يرى له على احد حقا، ولايشهد على غيره فضلا، ولذلك لا يعاتب ولا يطالب ولا يضارب)[٢]

واتە: گوێم لە (شيخ الإسلام ابن تيمية) بوو خوا رووحی بە پاك ڕابگرێ، دەیگوت: خواناسی ڕاست خۆی بە خاوەن ماف نازانێ لەسەر کەس، خۆشی بە خاوەن چاکە نازانێ لەسەر خەڵکی و منەتیان بەسەردا ناکا، هەر بۆیە گلەیی و سەرکۆنەی کەس و داوا لەکەس ناکا و شەڕ و هەرا لەگەڵ کەس ناکا.

## لێبوردەیی (شیخ الإسلام) لەگەڵ نەیارانی دا:

(ابن القيم) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لەبارەی هەڵوێستی (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، بەرانبەر نەیارەکانی، دەڵێ: (وما رأيته يدعو على أحد منهم قط، وكان يدعو لهم) واتە: قەت (شیخ الإسلام) م نەبینیوە دوعا لە هیچ یەکێکیان بکات، بەڵکو دووعای بۆ دەکردن، هەر لەو بارەوە (ابن القيم) دەڵێ: ڕۆژێکیان چووم مزگێنیی مردنی یەکێك لە سەرسەختترین دوژمنەکانیم پێدا، کە زۆرترین دوژمنایەتیی دەکرد و ئازاری دەدا، ئەویش سەرزەنشتی کردم و

---

(١) الاعلام العلية ٥٣.

(٢) مدارج السالكين ١/٤٩٦.

پێی ناخۆش بوو، گوتی: (انا لله و انا الیه راجعون) دوایی یەکسەر هەستا و چوو بۆ ماڵی مردووەکە و سەرەخۆشیی لێ کردن و دڵی دانەوە، وە پێی گوتن: من بۆ ئێوە لە جێی ئەوم، هەر ئیشێکتان هەبێ و پێویستیتان بە چی بێت من - بە پێی توانا - ئامادەم یارمەتیتان بدەم.(١)

ئەوەتا (إبن تیمیة) کاتێك زانای گەورە (صدرالدین ابو عبدالله محمد بن عمر بن مکی الشافعي العثماني) ناسراو بە (ابن المرحل) یا (ابن الوکیل) مردووە، کە یەکێك بووە لە سەرسەختترین نەیارانی (شیخ الإسلام)، بەڵکو لەسەرسەختترین کێ بەرکێکانی بوو، پەرۆشی بووە و (ابن العماد الحنبلي) لە باسی وەفاتی (ابن المرحل)دا دەڵێ: (... ولما بلغت وفاته ابن تیمیة قال: أحسن الله عزاء المسلمین فیك یا صدرالدین)(٢).

واتە: دوای ئەوەی هەواڵی وەفاتی (ابن المرحل) بە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) گەیشت گوتی: خوای گەورە دڵتەنگیی و دڵدانەوەی موسڵمانان بۆتۆ ئەی (صدرالدین) بەخێر بگێڕێ.

یەکێکی دیکە لە لێبوردەیی و چاوپۆشیی (شیخ الإسلام ابن تیمیة) (رەحمەتی خوای لێبێت) بەرانبەر نەیارەکانی لەکاتی تواناو دەستەڵاتدا ئەوەیە کە (ابن القلانسی ) باس دەکات کە (إبن تیمیة) بۆی گێڕاوەتەوە کە: سوڵتان داوای فتوای لێکردوە بۆ کوشتنی هێندێك لە قازییەکان، چونکە بە خراپە باسی سوڵتانیان کردوە و فتوای هێندێکیانی دەرهێناوە بە لادانی سوڵتان لە دەستەڵات و بەیعەت دان بە (جاشنکیر)، وە سوڵتان گوتویەتی: دیارە دژایەتیی تۆشیان کردوە و زۆر ئازاریان داوی، کە بەوەش هەڵیدەنا بۆ ئەوەی فتوا لەسەر کوشتنی هێندێکیان بدات. (إبن تیمیة) دەڵێ: منیش لەمەبەستەکەی گەیشتم، بۆیە دەستم کرد بە بەگەورە ناوبردن و رێز لێنانی ئەو زانا و قازییانە و ئینکارییم کرد لەوەی کە هیچ کام لەوانە شتێکی خراپیان لەگەڵ بکرێ، وە بە سوڵتانی

---

(١) مدارج السالكين ٢/٣٤٥.

(٢) شذرات الذهب ٤/٤٢.

گوتوە: ئەگەر ئەوانە بکوژی، دوایی کەسی وەکو ئەوانت دەست ناکەوێتەوە، ئەویش گوتویەتی: ئاخر چەند جاران تۆشیان ئازار داوە و ویستوویانە بتکوژن. منیش پێم گوتوە: (من آذاني فهو في حل، ومن آذى الله ورسوله فالله ينتقم منه، وانا لاأنتصر لنفسي، وما زلت به حتى حلم عنهم السلطان وصفح).

واتە: هەر کەسێك ئازاری منی دابێ گەردنی ئازاد بێ، هەرکەسێك ئازاری خواو پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دابێ، ئەوا خوا تۆڵەی لێدەستێنێ، وە من لەسەر خۆم هەڵنادەمێ، بەردەوام ئەوە هەڵوێستم بووە، تا سوڵتان نەرمیی لەگەڵدا نواندن و لێیان خۆش بوو.

زانای پایە بەرز (ابن كثير)یش (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (كان قاضي المالكية "ابن مخلوف" يقول: ما رأينا مثل ابن تيمية، حرضنا عليه، فلم نقدر عليه، وقدر علينا فصفح عنا و حاجج عنا)[1].

واتە: (ابن مخلوف) قازی مالیکییەکان - کە زۆر ناحەزی (شيخ الإسلام) بوو - دەیگوت: کەسێکی وەکو (إبن تيمية)مان نەدیوە، خەڵکمان لە دژی ئەو هان دەدا و دژایەتییمان دەکرد، کە تواناشمان بەسەریدا نەبوو، بەڵام ئەو،کە توانای بەسەرماندا هەبوو - لەبری تۆڵە سەندنەوە - چاوپۆشیی لێدەکردین و بەرگریشیی لێ دەکردین.

## ٦- جورئەت و ئازایەتیی لە گوتنی قسەی حەق و سازش نەکردن:

(إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و نەفسێکی نەترس بوو، کە لە ناخۆشیەکان بێ باك بوو، بەرانبەر سوڵتان و ستەمکاران دەوەستایەوە و ئامۆژگاریی دەکردن و دەیترساندن، خۆڕاگرانە ئاگاداری دەکردنەوە، بەشێوەیەك هەرکەسێك لە مەجلیسی ئەو ئامادە بووایە، سامی لێ دەکرد، لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەدەترسا.

---

(١) البدية والنهاية ١٤/ ٥٤ / العقود الدرية ٢٨٢.

ئەو ئازاو نەترس و دڵ دامەزراو بوو، چەسپاو بوو لە کاتی قسەکردندا، کە پیاوە بە هێزەکانی دەلەرزاند، دڵ قایم و سینە گوشاد بوو، ئەمەش چەند نموونەیەك لەوبارەوە.

أ- (ابراهیم ابن احمد الغیانی) (رەحمەتی خوای لێبێت) کە لە خزمەتی (إبن تیمیة) دا بوو دەڵێ: (.. دوای چەند رۆژێك (شمس الدین ابن سعدالدین)ی حەڕڕانی هاتە لای (إبن تیمیة) و پێی گوت: کە دەیانەوێ بتبەن بۆ (أسکندریە) هێندێك زانای (تەدموور) یش هاتنە لای و ئەو خەبەرەیان دایە و پێیان گوت: ئەو هەڵوێستانەشیان لەگەڵ تۆ بۆ ئەوەیە هاوڕا بی لەگەڵیان، دەیانەوێ بتکوژن، یان نەفییت بکەن، یان زیندانیت بکەن.

ئەویش گوتی: (ئەگەر بکوژرێم شەهیدییم بە نسیب دەبێ، ئەگەر نەفیشم بکەن بۆمن کۆچ کردنە و، ئەگەر نەفیشم بکەن بۆ (قوبروس) ئەوە خەڵکەکەی بانگ دەکەم بۆ لای خواو ئەوانیش بە پیر بانگەکەمەوە دێن، ئەگەر زیندانیشم بکەن، ئەوە بۆم دەبێتە پەرستگا، من وەکو مەڕ وام چۆنم وەرگێڕن بەسەر خوریدا دەکەوم. ئەوانیش لێی بێ ئومێد بوون و بە جێیان هێشت.

دوایی باس دەکا و دەڵێ: دوایی کە لەگەڵ نائیبی سوڵتان بەرەو (أسکندریە) دەڕۆیشتن، یەکێك پێی گوت: (ئەی گەورەم ئەم حاڵەتە شوێنی سەبر گرتنە). ئەویش پێی گوت: نەخێر بەڵکو شوێن و کاتی حەمد و سوپاسکردنی خوایە، سوێند بەخوا خۆشیی و شادییەك هاتۆتە دڵمەوە، ئەگەر دابەش بکرێ بەسەر خەڵکی (شام و میسر)دا لێیان زیاد دەبێ، وە ئەگەر زێڕێکی زۆرم پێ بایە و بەخشیبام بارتەقای دەیەکی ئەو نیعمەتەم نەدەدا کە من تێیدام[1].

ب- (ئیمام ذهەبیی) لەسەر ئازایەتیی و گوتنی هەقی (إبن تیمیة) دەڵێ: (... وکان قوالا بالحق، نهاء عن المنکر، لاتأخذه في الله لومة لائم، ذا سطوة وإقدام، و عدم مداراة ......).[2]

واتە: زۆر هەقگۆ بوو، زۆر نەهی لە خراپە دەکرد، لە پێناوخوادا گوێی نەدەدایە

---

(١) ناحیة من حیاة (شیخ الإسلام) لابراهیم بن احمد الغیاني ص٣٠-٣٢.

(٢) ثلاث تراجم نفیسة من کتاب ذیل تاریخ الإسلام ص٢٣.



لۆمەی هیچ لۆمە كارێك....... .

ج- ئەوە كە سوڵتان (ناصر محمد بن قلاوون) بە (إبن تيمية)ی گوتوە كە خەڵك بەقسەی دەكا و دەیەوێ دەستەڵات بگرێتە دەست، ئەویش بێ ترس و بەتوندیی بەرپەرچی داوەتەوە و پێی دەڵێ: سوێند بە خوا هەموو موڵك و دەسەڵاتی تۆو مەغۆل لای من دوو فلس ناهێنێ، دوایی سوڵتان بە زەردەخەنەوە بەوپەڕی شەرم و ڕێز بەرانبەر بە (إبن تيمية) دەڵێ: سوێند بە خوا تۆ ڕاستگۆی و ئەوەی دژی تۆ هانم دەدا درۆزنە.[1]

ئەو بەسەرهاتە ئەو پەڕی ئازایەتیی و جورئەتی (شيخ الإسلام) دەگەیەنێ، كە بێ باكانە ئەوەی بە ڕاستیی زانیبێ بە سوڵتان و هەركەسێكی دیكەی گوتوە و، لەبەر خاتری خوا ڕاستییەكانی نەشاردونەوەو شەرمی لەكەس نەكردوە.

د- هەر لەبارەی ئازایەتیی و هەقگۆیی (شيخ الإسلام) بەسەرهاتی (قطلوبك)ی مەنسوریی كە یەكێك لە گەورە مەمالیكەكانی سوڵتان (ناصر)ە كەسێكی زۆردار بووە و هەر شتێكی كڕیبێ زۆر بەزەحمەت نەبێ پارەكەی نەداوەتە خاوەنەكەی، بەو بۆنەیەوە یەكێك لە بازرگانەكان هاتۆتە لای (شيخ الإسلام) و شكایەتی لە (قطلوبك) كردوە كە هەقی خواردوە، بۆیە (شيخ الإسلام) بازرگانەكەی لەگەڵ خۆی بردوە بۆ لای (قطلوبك) بۆ ئەوەی هەقەكەی بۆ لێ بستێنێتەوە، كە چووە بۆ لای قطلوبك بە (شيخ الإسلام)ی گوتوە: ئەگەر دەستەڵاتدارێكتان بینی لە دەرگای فەقیرێك، ئەوە باشترین دەستەڵاتدارو باشترین فەقیرە، وە ئەگەر فەقیرێكتان بینی لە دەرگای دەستەڵاتدارێك ئەوە خراپترین دەستەڵاتدارو خراپترین فەقیرە، بۆیە من دەمەوێ بێمە لای تۆ چونكە تۆ زاهید و پارێزكاری. (إبن تيمية) پێی دەڵێ: شتەكان تێكەڵ مەكە، فیرعەون لە تۆ خراپترو مووساش لە من چاكتر بوو، بەڵام هەموو ڕۆژێ چەند جاران مووسا دەچووە لای فیرعەون و داوای لێدەكرد ئیمان بێنێ، منیش داوات لێدەكەم هەقی ئەو كابرایە بدەیەوە، ئەویش هیچی پێ نەما جگە لە بەقسە كردنی و دانەوەی هەقی تەواو بە كابرایەكە[2].

---

(١) الاعلام العلية ٧٤.

(٢) الدار الكامنة ٣/ ٣٣٧ -٣٣٨

### ٧- واقیع بینیی و ئینصاف:

دادگەریی و ویژدان لە پێویستییەکانی ئیمان و دەرهاویشتەکانیەتی، وە خوای دادگەر ئەرز و ئاسمانی بە دادگەریی دروستکردوون، کە دادگەریی یاسا و دەستوورە بۆ هەموو شتێك و بنچینەی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتییە، دادگەریی شتێکە کە خەڵکی سەرزەوی هەمووی لەسەری کۆکن کە شتێکی چاکەو جێی مەدح کردنە.

دادگەران چاکن و هاوڕێیەتی کردنیان شتێکی چاکە و داکۆکیی لەسەر دەکرێ، وە خوا فەرمانمان پێ دەکات کە بە دادگەریی مامەڵە بکەین لەگەڵ دوور و نزیك و دۆست و دوژمندا .

دادگەریی یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکانی (شیخ الإسلام) کە پێی رازابۆوە و پشکێکی زۆرو بەشێکی گەورەی تێدا هەبووە، وە ئەوەی مانای گەورەیی ئەو ڕەوشتە لە دڵی (شیخ الإسلام) دا دەگەیەنێ ئەم شتانەن کە لێی گێڕدراونەوە:

### أ- سەلماندنی هەق و ڕاستی:

(شیخ الإسلام ابن تیمیة) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (خوا فەرمانی پێ کردووین تەنیا هەق بڵێین، وە هیچ قسەیەك دەربارەی هیچ شتێك نەڵێین مەگەر بە زانیارییەوە بێت، وە فەرمانمان بە ڕاستیی و دادگەریی لە قسەو کردەوەدا پێ دەکات، دروست نیە ئەگەر جوولەکەیەك یان نەصرانییەك شتێکی گوت و هەق بوو، وەری نەگرین، بەڵکو تا هەقەکەی لێ وەرنەگرین، ناڕاستەکەشی وەلا نانێین.

وە لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) نەکردوەو هیچ عاقڵێك رازی نیە، کە بەنەسەلماندن و ئینکاریی کردن بەرەو ڕووی بەڵگەی بە هێز ببینەوە، بەڵکو قسەی راست و پابەند بوون بە عەقڵ لای هەموو عاقەڵمەندان شتێکی چاك و پێویستە، وە موسڵمانان لە خەڵکی بەوە شایستەترن، چونکە سوپاس بۆ خوا لە خەڵکی عاقڵترو تێگەیشتوترن و، دینیان راستتر و، کتێبەکەیان بەرزتر و بەبەهاتر و پێغەمبەرەکەیان تەواترین و چاکترین و، شەریعەتەکەیان باش و ڕێك و پێکترینە.



## ب- مامەڵەکردنی لەگەڵ زانایان بە دادگەرانە :

(شیخ الإسلام) لەو بارەوە دەڵێ: بێگومان ئێمە کە قسە دەکەین دەربارەی کەسانی دوای هاوەڵان ڕەزای خوایان لێبێ، وەك مەلیکەکان کە ناکۆکییان هەبوو لەسەر موڵك و دەسەڵات، یان زاناو پێشەواکان کە لە زانیاری و مەسەلە دینیەکان راجیایی و کێشەیان هەبوو، پێویستە قسەکردنمان لە بارەیانەوە لەسەر بنچینەی زانیاریی و بە دادگەرانە بێ، نەك بە نەزانیی و ستەم، وە دادگەریی لەسەر هەموو کەس پێویستە، بەرانبەر هەموو کەس و لەهەموو کاتێکدا، زوڵمیش بە ڕەهایی حەرامەو هەرگیز بە هیچ شێوەیەك حەڵاڵ نابێ، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ .... ﴾ المائدة (٨).

واتە: با ڕق هەستانتان لە خەڵك واتان لێ نەکا دادگەر نەبن، بەڵکو دادگەر بن، چونکە ئەوە نزیکترە لە پارێزکاریی یەوە...).

ئەم ئایەتە بەهۆی ڕق هەستانیان لە کافران هاتۆتە خوارێ، کە ئەو ڕق هەستانە فەرمانی پێ کراوە، جا ئەگەر رق هەستانێك خوا فەرمانی پێ کردبێ و ڕێگرییش بکا لە ڕق هەستاوەکە کە ستەم بکات و داوای دادگەری لێ بکات، ئەدی دەبێ مامەڵەی بەرانبەر کەسێك کە موسڵمانە و بە تەئویل و شوبهە یان بە پاڵنەری نەفسی ڕقی لێیەتی چۆن بێ؟ بێگومان ئەمەیان شایستە ترە کە زوڵم و ستەمی لێ نەکرێ، بەڵکو بە دادگەرانە ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ.[1]

وە لە باسی شێوازی مامەڵەو هەڵس و کەوتی لەگەڵ نەیاران و ناحەزانی دا دەڵێ: (هذا وانا في سعة صدر لمن يخالفني، فإنه وان تعدى حدود الله في بتكفير أو تفسيق أو افتراء أو عصبية جاهلية، فأنا لا أتعدى حدود الله فيه، بل أضبط ما أقوله وأفعله وازنه بميزان العدل واجعله مؤتما بالكتاب الذي انزله الله و جعله هدى للناس حاكما فيما اختلفوا فيه)

---

(١) منهاج السنة النبوية ١٢٦/٥.

واتە: (لەگەڵ نەیارەکانمدا بە سنگ فراوانی مامەڵە دەکەم، هەرچەندە ئەو سەبارەت بە کافر کردنی من یا فاسق کردنم، یان بوختان هەڵبەستن بۆم، یان دەمارگیریی نەفامی سنوورەکانی خوا بشکێنێ، ئەوە من وەك ئەو ناکەم و سنوورەکانی خوا لە بارەی ئەوەوە ناشکێنم، بەڵکو لەوەی دمیڵێم و دەیکەم بە تەرازووی دادپەروەری هەڵیدەکێشم و بە پێی ئەو قورئانەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ و کردوویەتی بە ڕێنمایی بۆ خەڵکی، وە حوکم دەکا و فەرمان ڕەوایە لەسەر ئەوەی خەڵکی تێیدا ڕاجیان ڕەفتار دەکەم، خوا دەفەرموێ:

﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ البقرة (٢١٣).

واتە: (خەڵکی یەك کۆمەڵ بوون.... وە خوا بەهەق بە پێغەمبەراندا کتابی ناردوە بۆ ئەوەی حوکم بکات لە نێوان خەڵکی دا لەو شتانەی راجیاییان تێدا هەیە.....). وە دەفەرموێ:

﴿ فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ النساء (٥٩).

واتە: ئەگەر لە شتێك دا کەوتنە ناکۆکیی، حوکمەکەی بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەر (واتە قورئان و سوننەت). وە دەفەرموێ:

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴾ الحديد (٢٥).

واتە: بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمان بە بەڵگەوە ناردوون و کتێب و تەرازوومان لەگەڵ ناردوونە خوار، بۆ ئەوەی خەڵکی بە دادگەریی بەڕێوە بچن.

وە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴾ النحل (١٢٨).



واتە: بێگومان خوا لەگەڵ ئەوانەدایە کە پارێزکار و چاکەکارن. وە دەفەرموێ:

﴿وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ ال عمران (١٢٠)[١].

واتە: ئەگەر ئارامگرین و پارێزکاربن فێڵ و پیلانی ئەوان هیچ زیانتان لێ نادا و، بێگومان خوا دەورە دەری ئەوەیە کە دەیکەن.

## ٤- هەڵوێستی (شيخ الإسلام) دەربارەی سۆفییەکان: -

(شيخ الإسلام ابن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ:

(فَطَائِفَةٌ ذَمَّتْ "الصُّوفِيَّةَ وَالتَّصَوُّفَ". وَقَالُوا: إنَّهُمْ مُبْتَدِعُونَ خَارِجُونَ عَنْ السُّنَّةِ وَنُقِلَ عَنْ طَائِفَةٍ مِنْ الْأَئِمَّةِ فِي ذَلِكَ مِنْ الْكَلَامِ مَا هُوَ مَعْرُوفٌ وَتَبِعَهُمْ عَلَى ذَلِكَ طَوَائِفُ مِنْ أَهْلِ الْفِقْهِ وَالْكَلَامِ. وَطَائِفَةٌ غَلَتْ فِيهِمْ وَادَّعَوْا أَنَّهُمْ أَفْضَلُ الْخَلْقِ وَأَكْمَلُهُمْ بَعْدَ الْأَنْبِيَاءِ وَكِلَا طَرَفَيْ هَذِهِ الْأُمُورِ ذَمِيمٌ. وَ "الصَّوَابُ" أَنَّهُمْ مُجْتَهِدُونَ فِي طَاعَةِ اللَّهِ كَمَا اجْتَهَدَ غَيْرُهُمْ مِنْ أَهْلِ طَاعَةِ اللَّهِ فَفِيهِمْ السَّابِقُ الْمُقَرَّبُ بِحَسَبِ اجْتِهَادِهِ، وَفِيهِمْ الْمُقْتَصِدُ الَّذِي هُوَ مِنْ أَهْلِ الْيَمِينِ وَفِي كُلٍّ مِنْ الصِّنْفَيْنِ مَنْ قَدْ يَجْتَهِدُ فَيُخْطِئُ وَفِيهِمْ مَنْ يُذْنِبُ فَيَتُوبُ أَوْ لَا يَتُوبُ. وَمِنْ الْمُنْتَسِبِينَ إلَيْهِمْ مَنْ هُوَ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ عَاصٍ لِرَبِّهِ. وَقَدْ انْتَسَبَ إلَيْهِمْ طَوَائِفُ مِنْ أَهْلِ الْبِدَعِ وَالزَّنْدَقَةِ؛ وَلَكِنْ عِنْدَ الْمُحَقِّقِينَ مِنْ أَهْلِ التَّصَوُّفِ لَيْسُوا مِنْهُمْ: كَالْحَلَّاجِ مَثَلًا؛ فَإِنَّ أَكْثَرَ مَشَايِخِ الطَّرِيقِ أَنْكَرُوهُ وَأَخْرَجُوهُ عَنْ الطَّرِيقِ. مِثْلُ: الْجُنَيْد بْنِ مُحَمَّدٍ سَيِّدِ الطَّائِفَةِ وَغَيْرِهِ. كَمَا ذَكَرَ ذَلِكَ الشَّيْخُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِي؛ فِي "طَبَقَاتِ الصُّوفِيَّةِ" وَذَكَرَهُ الْحَافِظُ أَبُو بَكْرٍ الْخَطِيبُ فِي تَارِيخِ بَغْدَادَ).[٢]

---

(١) مجموع الفتاوى ٣/٢٤٥.

(٢) مجموع الفتاوى ١١/١٧.

واتە: کۆمەڵێك زەمم و لۆمەی سۆفیایەتیی و سۆفیان دەکەن و دەڵێن: بیدعەچین و لە ڕێی ڕاست چوونە دەرێ، کە ئەمە بە ئاشکرا لە کۆمەڵێك لە پێشەوایان گێڕدراوەتەوە و کۆمەڵێکیش لە شارەزاو زانای دیکە لەوەدا بە دوایان کەوتوون، لەلایەکی دیکەشەوە کۆمەڵێك تێیان پەڕاندوە و ئیددیعای ئەوە دەکەن کە سۆفییەکان باشترین کەسی سەر زەوین و، تەواوترین کەسن دوای پێغەمبەران (علیهم السلام)، کە هەردووك تێڕوانینەکە هەڵەو ناشیرینن و زەم کراون .

ئەوەی ڕاستە ئەوەیە کە: ئەوان - اجتیهاد- کۆششیان کردوە لە شێوەی فەرمانبەری کردن بۆ خوا، وەك چۆن خەڵکی دیکە لەوبارەوە کۆششیان کردوە، جا تێیان دا هەیە بەپێی هەوڵەکەی پێشکەوتووە و نزیکە لە خوا، وە تێیاندا هەیە مام نێوەندە و لە پێڕی دەستە ڕاستە، وە لەهەردووك کۆمەڵەکەشدا کەسانێك هەن لە کۆششەکەیان دا بەهەڵەدادەچن، وە هەیانە گوناهدەکات و پەشیمان دەبێتەوە و تۆبە دەکات، یان تۆبە ناکا، وە لە نێو هەردووك کۆمەڵەکەدا کەسانێك هەن ستەمیان لە خۆیان کردوە و گوناهدەکەن و سەرپێچیی فەرمانی خوا دەکەن.

وە زۆر کۆمەڵ پاڵ دەدرێنە لای سۆفییەکان، کە بیدعەچیی و بێ دینن بەڵام بەڕای شارەزا و لێکۆڵەرەوانی ئەهلی تەصەوف ئەوانە لە ئەهلی تصوف نین، بۆ نموونە: (حەللاج) کە زۆربەی زانایان بە خراپیان زانیوە و لەو ڕێگاو مەسلەکە دەریان کردوە، یەکێك لەو زانایانە (جنید بن محمد)ە کە سەرقافڵەی سۆفیەکانە و چەند کەسێکی دیکەش. هەروەها (ابو عبدالرحمن السلمی)ش لە (طبقات الصوفیة)دا باسی کردوە، وە (الحافظ ابوبکر الخطیب)یش لە (تاریخ بغداد)دا باسی کردوە.

## د- تێڕوانینی (شیخ الإسلام) بۆ زانایان و پێڕ و تاقمەکان :

نموونەیەکی دیکەی (إبن تیمیة) کە بە ویژدانەوە باسی زانایانی کردوە و وێڕای ئەو شتە خراپانەی لێیانی دەبینێ، چاکەکانیانیشی باس کردوون بۆ نموونە:

* لەمیانەی باسکردنـی حەنبەلییەکان دا، (إبن تیمیة) دەڵێ: بەو ئەندازەیەی



خوای بەتوانا بۆمان دەرخسێنێ لە روانگەی زانیاری و بە دادپەروەرانە، قسە لەسەر ئەوە دەکەین[١].

* قسەی (إبن تیمیة) لەسەر کۆمەڵ و ڕێڕەوی مەزهەبەکان هەرچەندە خۆشی نەدەویستن، بەڵام شتێکی نەدەگوت کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بووایە، چاکەکانیان و راوبۆچوونە پەسەندەکانیانی باس دەکردن و دەیگوت: بەهەمان شێوە ئەوانەی قسەیان لەسەر چەسپاندنی سیفەتەکانی خوا کردوە، وەك (الکلابیة، الکرامیة، الأشعریة) زۆربەی خەڵکی قبووڵیان کردن و دوایان کەوتن بەوەی کە ئیسپاتی پایە و بنچینەکانی ئیمانیان کردوە، لە ئیسپاتکردنی دروستکەر و سیفەتەکانی و ئیسپاتکردنی پێغەمبەرایەتی و بەرپەچ دانەوەی کافر و هاوبەشپەیداکەران و ئەهلی کیتاب، بەهەمان شێوە خەڵکی مەدحی دەکردن بەوەی بەرپەرچی (جەهمی و موعتەزیلە و رافیزە و قەدەرییە) یان دەدایەوە لە جۆرەها قسەی نارەوایان و هەڵوێستیان، کە پێچەوانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوون.

**چاکەکانیان دوو جۆرن:** یان وەك ئەهلی سوننەت و حەدیسن یان بەرپەرچی ئەوانە دەدەنەوە کە پێچەوانەی سوننەت و حەدیس بوون، بە هەڵوەشاندنەوەی بەڵگە و دەلیلەکانیان[٢].

* یەکێکی دیکە لەو نموونانەی کە (إبن تیمیة) بەوریژدانەوە باسی لە گەورەیی و چاکەی زانایان کردوە: مەدح کردنی بووە بۆ (صلاح الدین الأیوبی) (رەحمەتی خوای لێبێت)، و بەوەی کە یەکێکە لە مەلیکەکانی ئەهلی سوننەت، هەرچەندە لە مەسەلەی عەقیدەدا ئەشعەریی بووە و ڕای جیاواز بووە لە (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، کە لەوبارەوە دەڵێ: کاتێك (ابو عمرو عثمان بن مرزوق) هاتە (میسر) پادشاکانی ئەوێ ئەوکات پشتی شیعایەتییان دەگرت، کە خۆیان کافر بوون، هەر بەو هۆیەوە بیدعەت لە میسر پەرەی سەند و زۆر بوو،

---

(١) نقض المنطق (ص ١٣٦).

(٢) نقض المنطق (١٠ – ١١).

هەربۆیە فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد کە نوێژ لە پشت هیچ کەسێکەوە نەکەن کە نەیناسن، دوای مردنی ئەو چەند مەلیکێکی سوننی میسریان فەتح کرد، وەك (صلاح الدين الأيوبي)وە وشە و دەنگی سوننەی پێچەوانەی شیعەی رافیزە دەرکەوت و سەرکەوت، ئنجا زانست و سوننەت تێیدا گەشەی کرد[١].

* دەربارەی (أبو حامد الغزالي) یش بەهەمان شێوە (إبن تيمية) بە ئینسافەوە باسی دەکا و لەگەڵ هەبوونی تێبینی خۆی لەسەری، بەزانا و زاهید و زیرەك و شارەزا و ... وەسفی دەکات[٢].

* یەکێکی دیکە لە هەڵوێستە راست و دادگەرانەکانی (شيخ الإسلام)، سینگ فراوانیی و چاکەکاریی بوو بەرانبەر (ابن مخلوف) و چەند زانایەکی دیکە کە نەیاری بوون و ویستیان زیانی پێ بگەیەنن، وەك پێشتر باسمان کرد[٣].

### هـ- هەڵوێستیی بەرانبەر بیدعەتچییەکان :

وە لە حوکمدان لەسەر بیدعەتچیی یەکان بە جیاوازیی رێبازیان، بەو پێیەی شەریعەت دەیخوازێ و ئەوەی واقیع پاڵپشتی دەکات، دوور لە هەواو نەفس، هەقی هەر خاوەن هەقێکی دەدا، بۆیە وێڕای گوناهو تاوانی رافیزە و هەڵە و پەڵەی زۆر و دژایەتیان بۆ هاوەڵان، شيخ الاسلام دان دێنێ بە فەزڵ و چاکەکانیان دا کە دەڵێ: (ڕافیزەش تێیاندا هەیە کە خواپەرست و پاریزکار و دنیا بەکەمگرن، بەڵام لە هەموو شتێك دا وەك غەیری خۆیان نین لە ئەهلی هەوا و بیدعەت)، وە دەڵێ: (موعتەزیلە لەوان تێگەیشتووتر و زاناتر و دیندارترن، درۆ و خراپە لەماندا کەمترە لەوەی لە ڕافیزەکان دا هەیە، زەیدییەکانیش لەنێو شیعەدا لە جۆرەکانی دیکەی شیعە چاکترن و نزیکترن لە ڕاستیی و دادپەروەریی و زانیارییەوە، بەڵام لە ئەهلی بیدعەت کەس لە خەواریج ڕاستتر و دیندارتر نین،

---

(١) مجموع الفتاوى ٢٨١/١٣.

(٢) نقض المنطق (ص ٦٠).

(٣) البداية والنهاية ٥٤/١٤.



ئەهلی سوننەت لەگەڵیان دادگەرە و زوڵمیان لێ ناکا، چونکە زوڵم بەشێوەیەکی رەها حەرامە، بەڵکو ئەهلی سوننەت بۆ هەریەك لەو کۆمەڵانە، باشترە لە بەشێکیان بۆ بەشەکەی دیکەیان، بەڵکو بۆ ڕافیزەش باشتر و دادگەرترن لە هێندێکیان بۆ هێندێکیان[1].

چونکە ئەهلی سوننەت لە روانگەی (شیخ الاسلام)ەوە ئەمە هەڵوێستیانە کە (هەموو ئیمانداران بە دۆست و پشتیوان دەزانن، بە زانیاری قسە دەکەن، دادگەرن، لە پێڕی نەفامان نین و وە دوای هەواو نەفس ناکەون، خۆیان بەری دەکەن لە رێبازی شیعەی رافیزە و ناصبی یەکان، خۆشەویستییان هەیە بۆ مسوڵمانانی پێشینیە یەکەمەکان و رێز و پلە و پایە و خەسڵەتە پەسندەکانی هاوەڵان دەزانن و مافەکانی (اهل البیت) کە خوا بۆی دیاری کردوون لەبەرچاو دەگرن[2].

(إبن تیمیة) زۆر هەڵوێستی بە ویژدانانەی دەرهەق بە نەیارانی هەبووە و مامەڵەی لەگەڵیاندا لەسەر بنچینەی زانیاری بەدادپەروەرانە بووە، جیاوازیی راوبۆچوون لەگەڵیاندا وای لێ نەدەکرد، سوود لەشتە راست و هەقەکانیان وەرنەگرێ و لە کتێبەکانی دا بەبەڵگە نەیانهێنێتەوە و، وەك پاڵپشتێك بۆ شتە هەقەکانی خۆی باسیان نەکات.

### ٨- ئازایەتیی و ئارامگرتن :

(ابن تیمیة) (رەحمەتی خوای لێبێت)، زۆر ئازا و دلێر و بەسەبر و ئارامگر بوو لەبەرانبەر مردن و ئەو بەڵا و موسیبەتانەدا کە تووشی دەبوون، بە شێوەیەك لەلای زانایانی سەردەمی خۆی و پادشا و سەرکردە و سەرباز و ئەفسەرەکانی سوپاش جێی سەرسوڕمان بوو، ئازایەتیی و چاونەترسیی و دڵقایمیی ناوبراو لەبەرانبەر کاولکاریی و مەترسییەکانی (تەتار)دا کەبەسەر مسوڵماناندا هێنای و، سەرکردە و خەڵکی دیکەی ئاساییان هەراسان کرد و ناوی خۆیانی لەبیر بردنەوە، ئەو لە

---

(١) نقض المنطق ٦٠.

(٢) منهاج السنة ١٦٥/١

مەیداندا بەئازایەتیی دەرکەوت و بوو بە سەرمەشق و، خەڵکەکە دەچوونە لای بۆ ئەوەی ئازایەتیی و خۆڕاگرییان لە دڵدا زیندوو بکاتەوە و، ئارامییان فێربکات و هانیان بدات لەسەر رووبەروو بوونەوەی مەترسییەکانیان، لە کاتێکدا کە ترس و بیم زاڵ بوو بوو بەسەر دڵ و دەروونی زۆر کەس لە زانایان و سیاسەتمەدارانی سەردەمی خۆی دا، (إبن تيمية) بە سیفەتی بەرز و سەرسوڕهێنەر لە ئازایەتیی و مەردایەتی باس دەکرا لەو بارەوە ئیمام (ذهبي) دەڵێ:

(... هذا مع ماكان عليه من الكرم الذى لم أشاهده مثله قط، والشجاعة المفرطة التى يضرب بها المثل)[1].

واتە: ئەوە لەگەڵ ئەو سەخاوەتەی هەیبوو، کە کەسم وەك ئەو نەبینیوە، وە ئەو ئازایەتییەی کەنموونەی پێ دەهێنرایەوە. وەدەڵێ: (.. وأما شجاعته فبها تضرب الأمثال، وببعضها يتشبه الأكابر)

واتە: کە ئازایەتییەکەی وێنەی پێ دەهێنرایەوە و پیاوە گەورەکان بە شێکیان لە خۆیان دا دێنایەدی.

وە (شيخ الإسلام ابن تيمية) کاریگەریی زۆری هەبوو لە باش خۆئامادەکردن بۆ جەنگی (مرج الصفر) (شقحب)دژی (تەتار) بەوەی بەشداریی کرد لە ئامادەکردنی خۆبەخشەکان و هاندانی سوڵتان (ناصر) لەسەر جەنگ کردن و، هەر بەوەندەشەوە نەوەستاوە بەڵکو بە نەفس و ماڵ و شیری خۆی لەو جەنگەدا بەشداریی کرد، ئەوە بوو خۆی و سوڵتان بەیەکەوە هاتن و لەسەرەتای رەمەزانی ساڵی (٧٠٢)ی کۆچی گەیشتنە (شقحب) و لەگەڵ دوژمن رووبەڕوو بوونەوە، (شيخ الإسلام) سوڵتانی لەسەر جەنگ هان دەدا، و مزگێنی سەرکەوتنی پێ دەدا وە سوێندی دەخوارد بەو خوایەی کە جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین، کە ئەم جارە سەردەکەوین بەسەریاندا، ئەمیرەکان پێیان دەگوت بڵێ: (ان شاء الله) ئەویش دەیگوت: (انشاء الله تحقيقا لاتعليقا) واتە: ئەگەر خوا بیەوێ و حەز بکات، بەمسۆگەریی نەك بە ئەگەر و ئەگەرو هەڵواسراویی.

---

(١) ثلاث تراجم نفيسة من ذيل تأريخ الإسلام (ص٢٣).

وە لەو جەنگەدا (شيخ الإسلام إبن تيمية) فتوای دا کە مسوڵمانان بەرِۆژوو نەبن و خۆشی بەرِۆژوو نەبوو، وە خۆی بەسەر سەرباز و بەرپرسەکاندا دەگەرا و شتێکی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێ کە بەرۆژوو نەبوونیان بۆئەوەی بەهێزبن لە جەنگدا خێری زیاترە، خەڵکەکەش بەقسەیان کردو بەرِۆژوو نەدەبوون، وە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ی بۆ شامیەکان دێنایەوە کە (أبو سعيد الخدري) گێراویەتەوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە فەتحی مەککە دا فەرمانی بە یارانی کرد بەرِۆژوو نەبن[1].

سەبارەت بە ئازایەتیی ناوبراو لە مەیدانی جەنگدا، لەو بوارەشدا لەنێو هەموو زانا و ئازایانی دیکەدا دەرکەوتوە و ئەم وێنەیە دێنینەوە: یەکێك لە سەرکردەکانی شام دەڵێ: لە رۆژی جەنگی (مرج الصفر) کە ئێمە و دوژمن بەرەو رِووی یەکدی بووین (شيخ الإسلام) پێی گوتم: فلأن کەس چ شوێنێك خەتەرە و لە مردنێ نزیکە لەوێ دامنێ، دەڵێ: منیش بردم بۆ شوێنێك لە بەرانبەر دوژمن دامنا، ئەوان پۆل پۆل دەهاتن و خۆیان پرِ چەك کردبوو تەپ و تۆز بەری ئاسمانی گرتبوو، دوایی پێم گوت: گەورەم ئێستا ئێرە شوێنی مردنە - واتە زۆر خەتەرە - وە ئەوەش دوژمنە بەرەو رِوومان دێن و لەبەر تەپ و تۆز دیارنینە و دەستەو یەخەمان دەبن، فەرموو ئەوەی دەتەوێ بیکە، دەڵێ: رِووی لەئاسمان کرد و بۆماوەیەك چاوی لێك نەنان و لێوەکانی لە جووڵە نەکەوتن و لە خوا دەپارِایەوە، دوایی دەستی کرد بە جەنگ، بەڵام من بە خەیاڵمدا هات کە ئەو دووعای لێ کردوون و دووعاکەشی هەر ئەوکاتی قبوڵ بوو، شەرِ دەستی پێکردو هەردوولا تێك چرِژان، نەمدیتەوە تا سەرەنجام خوا یارمەتی نارد و سەرکەوتنی پێ بەخشین و (تەتار) شکان و روویان کردە شاخێکی گچکە، بە وێوە گیرسانەوە و کاتەکەی ئێوارە بوو، خۆیان لە هێرشی مسوڵمانان دەپاراست، دەڵێ: لەوکاتەدا (شيخ الإسلام) و براکەیم بینی بە هەمو هێزی خۆیان بانگیان

---

(١) البداية والنهاية ١٤/ ٢٥ - ٢٦ حەدیسەکە بەم شێوەیە (... ثم نزلنا منزلا اخر فقال: (صلى الله عليه وسلم) (إنكم مصبحو عدوكم والفطر أقوى لكم فأفطروا) وكانت عزمة فأفطرنا . رواه مسلم برقم (٢٦٢٤)

دەکرد و مسوڵمانانیان لەسەر جەنگ و چۆڵ نەکردنی مەیدان هان دەدا، پێی گوت: گەورەم مزگێنیت لێ بێ خوا سەری خستین و یارمەتی داین، ئەوانەش (تەتار)ن لەسەر ئەو شاخە خۆیان پەنا داوە، انشاء الله سبەینێ هەموویان دەگرین نایانهێڵین، دەڵێ: شیخ الإسلام (رەحمەتی خوای لێبێت) بەوشێوەیەی کە بۆی شایستەیە سوپاسی خوای کرد، هەر لەوێ دوعاشی بۆمن کرد کە ئەوکاتیش و دواتریش پیت و بەرەکەت و بەرهەمی ئەو دووعایەم دەبینی[1].

هەرکاتێ گیروگرفت و نارەحەتیی هاتبێتە پێش، ئازایەتیی و لێبڕاویی (شیخ الإسلام) بەئاشکرا دەرکەوتوە، بۆنموونە لەساڵی (٧٠٧)ی کۆچی دا، کە ڕووبەڕووی قازییەکان بۆوە کە سوڵتان بڕیاری دا (شیخ الإسلام) بگرێ، چونکە لە دژی سۆفییەکان قسەی کردوە، بۆ ئەو مەبەستە داوای لە شەرعزان و قازییەکان کرد کە فتوا بدەن بە گرتنیی، بەڵام زاناکان لە شەرعدا هیچیان دەست نەکەوت کە فتوایەك دەربکەن و ئەو پیاوەی پێ بگرن، نەیاندەزانی چی بکەن، دوایی کە (إبن تيمية) بینی زاناکان سەرگەردان و بێ دەسەڵات ماونەتەوە و ناتوانن بێ باکانە لەڕووی سوڵتان بووەستنەوە، خۆی بۆ حەبس ڕۆیشتە پێشەوە و گوتی: (أنا أمضي الى الحبس وأتبع ماتقتضيه المصلحة)[2].

واتە: من خۆم دەچم بۆ سجن و بەرژەوەندیی گشتی لەچیدا بێ ئەوە دەکەم و بەدوای دەکەوم.

بێگومان ئەو هەڵوێستەی (إبن تيمية) ئەوپەڕی ئازایەتیی بووە، وێڕای ئەدەب و رێز لە مامەڵەی لەگەڵ زانا و قازییەکاندا، ئەو کاتێك ئەوەی گوتوە و خۆی چۆتە حەبسەوە، کە بینیویەتی زاناکان سەرگەردان و بێ دەسەڵاتن و کەوتوونەتە ئیحراجییەوە، بۆئەوەی ئەو حاڵەتەیان لەسەر لابەرێ ئازایەتیی نواندوە و خۆی چۆتە حەبسەوە و بەرژەوەندیی گشتی باو داوە بەسەر بەرژەوەندیی شەخسی دا. وێڕای ئازایەتیی (شیخ الإسلام) لە مەیدانی جەنگ لە دژی (تەتار) و

---

(١) العقود الدرية (ص ١٧٨).

(٢) البداية والنهاية ٢٤/١٤.



جیهاد کردن شان بەشانی خەڵکی شام و بەشداریی لە بەرەکانی جەنگ و هاندانی مسوڵمانان بە وەستان لە دژی زوڵم و زۆر و چەوسانەوە و نەترسان و هەقگۆیی لەبەرانبەر سوڵتان (قازان)، پێویستە لە ڕوویەکی دیکەشەوە باس لە ئازایەتیی و نەترسیی (إبن تیمیة) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بکەین، ئەویش بریتیە لە ئازایەتیی لە بواری سەربەخۆیی فکریی و فتوادان و ڕانواندنی ڕاو بۆچوونەکانی لەمەسەلە شەرعییەکان دا و بەرپەرچ دانەوەی بیدعەت و خورافات و دژایەتیی کردنی بیردۆزەی (وحده الوجود)، و (الحلول والإتحاد) و هێندێك قسە و بۆچوونی دیکەی (سۆفی و رافیزە) و بیروڕای بەناو ئیسلامەوە، کە لەگەڵ قورئان و سوننەت دژ بوون و، هەڵگرتنی ئاڵای بەرەنگار بوونەوەی مەنطیق و فەلسەفەی یۆنانیی، کە لە وتار و دەرس و شەڕە قسەکانی دا روونی دەکردنەوە، هەرچەندە چاوەڕوانی ئازاردان و دژایەتیی کرانیشی دەکرد، بەڵام هەر ئازا و بوێر بووە، هەوڵی داوە ئەوەی بەشەرعیی و ڕاستیی زانیوە و لە رووی زانستیەوە پێی گەیشتوە، بیگەیەنێ، هەرچەندە کەسانێك لە زانا و خەڵکی دیکەش پێیان ناخۆش بووە، کەواتە ئازایەتیی (شیخ الإسلام) لە زۆر ڕووەوە ئاشکرا و رۆشن بووە، لە زۆربەی ڕا و مەسەلەکانیشدا هێندێك لە زانایانی سەردەمی خۆی کە کەسایەتیی زانستییان بەهێز بووە، وە پێشەوا و شارەزا بوون هاوڕای شیخ الإسلام بوون، بەڵام کەمێکیان نەبێ وەك پێویست پشتیان نەگرتوە و وەکو ئەو ئازاو لەخۆبوردوو نەبوون و بۆ ناخۆشییەکان لەگەڵی دا نەبوون و، ویستوویانە سەلامەت بن و وەك وی کاریگەریان نەبووە لە گۆڕانکاری کۆمەڵگە و دەورویەری دا.

### ٩- هەیبەتی (إبن تیمیة):

سام و هەیبەت بەخششێکی خوای گەورەیە دەیبەخشێ بە هێندێك لە دروستکراوەکانی، هەیبەت هێزی ڕووح و کەسایەتیی ئەو ئینسانەیە کە تێیدا بەرجەستە دەبێ و، توانایەکی بۆ دروست دەبێ کە خۆی و قسەکانی کاریگەریی ببێ لەسەر نەفس و عەقڵی ئەوانەی لێ ی دەبیستن و دەیبینن و تێڕوانینەکانی

کاریگەردەبن و ئینسان لە بەرانبەری دا سەریەخۆیی لە دەست دەدا، بێ ئەوەی دەسەڵاتێکی مل پێ کەچکار، یا هێزێکی ماددیی پابەند کار هەبێ، بەڵکو ئەوەی پابەندی دەکا هەیبەتێکە لە نەفسەوە سەرچاوە دەگرێ، خوای گەورە ئەو هێزە ڕووحی یەی بە (إبن تیمیة) دابوو، لەوانەیە ئەو سیفەتانەی باسمان کردن و ئەو توانایەی خۆی هەیبووە، هۆیەك بووبن لە دروست بوونی ئەو هەیبەتەدا، بەڵام ئەوە هەمووی نیە، بەڵکو لەسەرووی ئەوە بە خششێکی خوای زاڵە کە ئەو هێزەی تێدا خوڵقاندوە و هەموو ئەو سەرکردە فکرییانەی ڕێنمایی فکریی خەڵك دەکەن و خەڵکی بەقسەیان دەکەن و، بەپێی ڕێنماییان هەڵوێست دەنوێنن، لەوانەن کە خوای کاربەجێ ئەو هەیبەتەی پێ بەخشیون، نەیارەکانی (شیخ الإسلام) لەزانایان هەستیان بەو سام و هەیبەتەی ناوبراو کردبوو، حەسوودییان پێ ی دەبرد و بە هەبوونی کەسایەتی بەهێزی ناوبراو نارەحەت بوون، بۆیە بەشەو و بەڕۆژ و بە گرنگیی پێدانەوە پیلانیان لە دژی ئەو دەگێڕا، نەدەچوونە لای و نەدەوێران بەشەرە قسەو وتوویژ ڕووبەڕووی ببنەوە، بەڵکو لە پاشەملە بە ناڕەوا قسەیان بۆ هەڵدەبەست و شکایەتیان لێ دەکرد، خۆ ئەگەر سوڵتان یان هەر کاربەدەستێکی دیکە زۆری لێکردبان کە لەگەڵ (شیخ الإسلام)دا یەکدی ببینن و بەیەکەوە قسەی خۆیان ڕووبەڕوو بکەن، ئەوە لەبەر بەڵگەی بەهێز و هەیبەتی زۆری (شیخ الإسلام) ئەوان تێك دەشکان و هیچیان بۆ نەدەمایەوە[1].

**لەگەڵ قــازان بەنموونە:**

یەکێك لەو دیمەنانەی سام و هەیبەتی (شیخ الإسلام) یان تێدا دەرکەوتوە ئەوەیە: کاتێك سوڵتانی تەتار (قازان) زاڵبوو بەسەر دیمەشق دا، مەلیکی (کرج) هاتەلای و ماڵێکی زۆریشی پێدا بۆئەوەی کوشتن و خوێنڕشتنی مسوڵمانانی دیمەشقی پێ بسپێرێ، ئەو هەواڵە بە (شیخ الإسلام) گەیشت، یەکسەر هەستا خەڵکی هاندا بۆ ئازایەتیی و ورە و موژدەی شەهیدیی و بەڵێنی زاڵ بوون و سەرکەوتن و نەمانی ترس و دڵەڕاوکێی پێ دان.

---

(١) ابن تیمیة محمد ابو زهرة (ص ١٠٩ — ١١٠).



خەڵکەکە چەند کەسێکی دیار و عاقڵمەندیان وەك نوێنەری خۆیان دیاری کردن و لەگەڵ (شیخ الإسلام) دا چوون بۆ لای (قازان)، کاتێك سوڵتان چاوی پێیان کەوت گوتی ئەمانە کێن؟ گوتیان: ئەمانە سەرۆك و قسە بەدەستی (دیمەشق)ن، رێی پێدان و چوونە لای، (شیخ الإسلام) لە پێشیانەوە دەڕۆیشت، هەرکە (قازان) چاوی پێ کەوت، خوا سام و هەیبەتێکی زۆری شێخی خستە دڵیەوە، فەرمووی کرد و لەخۆی نزیك خستەوە و داینیشاند.

(شیخ الإسلام) سەرەتا دەستی بەقسان کرد بە پێچەوانەی رای ئەو کە مەلیکی (کرج) زاڵ بکات بەسەر مسوڵمانانی دیمەشقدا، وە پێی راگەیاند کە رژاندنی خوێنی مسوڵمانان حەرامە و لەوبارەوە ئامۆژگاریی زۆری کرد، ئەویش بە قسەی کرد، بەو شێوەیە بەهۆی (شیخ الإسلام) ەوە خوێنی مسوڵمانان نەرژاو ماڵ و منداڵ و ناموسیان پارێزراو بوو[١].

### ١٠- سەخاوەت و بەخشندەیی:

ئیثار[٢] بەرزترین پلەی سەخاوەت و بەخشندەییە، پێچەوانەی رژدیی و چرووکیی یە، ئەو کەسەی ئیثار دەکات کەسێکە ئەگەر پێویستیشی بە شتێك بێت وەلای دەنێ بۆ یەکێکی دیکە، کەسی رژدو چرووکیش ئەو کەسەیە سوورە و هەڵپە دەکات بۆ ئەو شتەی نیەتی، وە ئەگەر شتێکی هەبوو، سوورە لەسەری و چروکیی دەنوێنێ لەوەی بیدات بەکەسی دیکە، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

---

(١) الاعلام العلية ٦٤ - ٦٩.

(٢) إیثار: واتە شتی باشت بۆ خەڵکی بوێ و لە خۆشیی و چاکەدا براکەت بەسەر خۆت دا هەڵبژێری..

(اياكم و الشّحَّ، فان الشحَّ أهلك مَنْ كان قبلكم، أمرهم بالبخل فبخلوا، وأمرهم بالقطيعة فقطعوا)[١].

واتە: خۆتان لە ڕژدی بپارێزن، ڕژدی ئەوانەی پێش ئێوەی فەوتاند، فەرمانی پێ کردن بە چرووکیی چرووکییان کرد و فەرمانی پێکردن بە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی پچڕاندیان.

أ-(الحافظ ابن فضل الله العمری) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەربارەی سەخاوەت و بەخشندەیی (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (كانت تأتيه القناطير المقنطرة من الذهب والفضة، والخيل المسومة والانعام والحرث، فيهب ذلك بأجمعه، ويضعه عند أهل الحاجة في موضعه، لايأخذ منه شيئا الا ليهبه...)[٢].

واتە: زێڕ و زیو و ئەسپ و وڵاخی نیشانە کراو و مەڕ و ماڵات و زەوی و زاری زۆری دەدرایە، بەڵام هەمووی دەبەخشیە شوێنی خۆی و، دەیدایە کەسانی شایستە و خاوەن پێویستیی، هیچی لێ هەڵنەدەگرت، مەگەر بۆ بەخشین و، ئەوەی لای خۆی دەهێشتەوە لەکاتی خۆی دا دەیدایە خەڵکی.

ب- (الحافظ الذهبي)ش باسی ئازایەتیی و سەخاوەتی ناوبراوی کردوە، کە سەخاوەتەکەی بە (حاتەمی طەیی) و ئازایەتییەکەی بە هی (خالد) ناودەبات[٣].

ج- هەر لەبارەی سەخاوەتی ناوبراوەوە، زانای پایە بەرز (ابو محمد عبدالله ابن احمد بن سعيد) دەڵێ: ڕۆژێکیان لای (شیخ الإسلام) دانیشتبووم، یەکێك هاتە لای و سەلامی کرد، (شیخ الإسلام) کە چاوی پێکەوت، بینی پێویستی بە مێزەرێکە لەسەری ببەستێ، بۆیە بێ ئەوەی کابرا داوای لێ بکات مێزەرەکەی

---

(١) اخرجه ابو داود برقم ١٦٩٨.

(٢) الكواكب الدرية (١٥٨)..

(٣) تذكرة الحفاظ (ص ١٤٩٦) / ثلاث تراجم نفيسة (ص ٢٣، ٢٥)..



خۆی دانا و کردیە دوو پارچە و پارچەیەکی دایە کابرا و ئەوی دیکەی لەسەری خۆی نایەوە[1].

د- ئیمام (ابن القیم) کاتێك پلەکانی سەخاوەت باس دەکات لە (مدارج السالکین) دا دەڵێ: چوارەم: سەخاوەت و بەخشندەیی بە زانست، ئەمە بەرزترین پلەی بەخشندەیی و سەخاوەتە، کە لە سەخاوەتی ماڵ گەورەترە، چونکە زانست لەماڵ و سامان بەرز و بەڕێزترە.

وە سەخاوەت و بەخشندەیی بە زانست ئەوەیە: ئەگەر یەکێك پرسیارێکی لێ کردی زۆر بە ڕوونیی و تەواویی وەڵامی بدەیەوە، وەڵامەکەت هەر بەو ئەندازەیە نەبێ کە پێویستە، وەك چۆن هێندێك کەس لە وەڵامدا بە کورتی دەنووسێ (بەڵێ، یان نەخێر) من لە (شیخ الإسلام إبن تیمیة) (قدس الله روحه)م بیستوە، کاتێك پرسیاری حوکمێکی شەرعیی لێ کرابایە، لە وەڵامدا ئەگەر بیتوانیبایە رای هەر چوار مەزهەبەکەی بۆ باس دەکرد، وێڕای شوێنی جیاوازیی ڕایەکانیان، باسی ئەو ڕایەشی دەکرد کە خۆی پێی بەهێزترە، وەباسی ئەو شتانەشی بۆ دەکرد کە پەیوەندیی بەو شتەوە هەبوو، کە لەوانەیە زۆرجار ئەمە گرنگتر و بە سوودتر بووبێ لە ئەسڵی پرسیارەکە و پرسیارکارەکەش دڵی زیاتر خۆش دەبوو، وەڵام و فتواکانی (شیخ الإسلام) سەخاوەت و بەخشندەیی یان تێدا بووە، هەر کەسێك پرسیاری لێ کردبێ ئاوای بینیوە[2].

بێگومان لێبووردەیی و سینە فراوانیش بەرانبەر ئەوانەی خراپەیان لەگەڵیداکردوە جۆرێکە لە سەخاوەت و بەخشتندەیی.

---

(١) الاعلام العلية (ص ٦٣)..

(٢) تهذيب مدارج السالكين ٢/٦٤٤.

## ١١- هێزی پێشبینیی (فراسة):

هەموو ئەوانەی چاکسازیی کۆمەڵگا دەگرنە ئەستۆی خۆیان، پێویستە هێزی پێشبینیی و فیراسەت و دڵڕۆشنییان هەبێ، بە شێوەیەك لە چاوەکانڕا دڵەکان و، لە رووەکاندا جووڵەی نەفسەکان بخوێننەوە، بۆ ئەوەی بتوانن ناخی مرۆڤەکان بدوێنن و، بەوەی دەیانەوێ بگەنە هەست و نەستیان.

خوای گەورە پشکێکی گەورەی لە تێگەیشتنی ڕووحیی و هەستکردنی نەفسیی دابووە (شیخ الإسلام)، هەر بۆیە قسەی لەگەڵ هیچ کۆمەڵێکدا نەکردوە، مەگەر سەرنجیانی ڕاکێشاوە و کاری لە هەست و هۆشیان کردوە. مەگەر یەکێك کە عیناد و کەللە ڕەق بووبێ و، هەموو ڕێگاکانی تێگەیشتن و وەرگرتنی داخستبێ، کە ئەوکات ئەگەر قسەی هەقی پێ نەگەیشت، خەتای خۆیەتی، نەك خەتای ئەوەی دەیدوێنێ و قسەی بۆ دەکا، خەڵکی هاوسەردەمی خۆی و قوتابی و خۆشەویستانی شاهیدی زۆر ڕووداوبوون، کە یاسادڕ - خارق العادة- و کەرامەت بوون لە ژیانی (شیخ الإسلام) دا و زانایانی پاشینیش دانیان پێدا هێناون، وە گوتوویانە ناکرێ ئەوە نەسەلمێنرێ، چونکە لە زۆر ڕێگاوە باسکراوە و گێڕدراوەتەوە، بۆ وێنە:

أ- زانای پایە بەرز (بدرالدين العيني) خاوەنی (عمده القاريء) شەرحی (صحيح البخاري) لە پەسەندکردنەکەی بۆ کتێبی (الرد الوافر) دا دەڵێ: (وهذا الإمام مع جلالة قدره في العلوم، نقلت عنه على لسان جم غفير من الناس كرامات ظهرت منه بلا التباس) واتە: ئەو پێشەوایە (إبن تيمية) لەگەڵ پلە و پایەی بەرزی لە رووی زانستەوە، لەسەر زاری خەڵکێکی زۆر لێ ی گێڕدراوەتەوە، کە چەندان جار کەرامەتی لێ دەرکەوتوە بێ شك و گومان.

ب- زانای پایە بەرز (علي بن سلطان محمد القاري الهروي) کە لە ساڵی (١٠١٤)ی کۆچی دا لە مەککە وەفاتی کردوە، لە کتێبەکەی دا (المرقاة شرح



المشكاة) دا دەڵێ: (من طالع شرح منازل السائرين[١] تبين له أنهما "يعنى شيخ الإسلام ابن تيمية وتلميذه ابن القيم" كانا من أكابر أهل السنة والجماعة ومن أولياء هذه الأمة)[٢].

واته: هەرکەسێك موتاڵای (شرح منازل السائرين) بکات بۆی دەردەکەوێ کە (شيخ الإسلام) و قوتابیەکەی (ابن القيم) لە گەورە زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن و لە ئەولیا و پیاو چاکانی ئوممەتی ئیسلامن.

ج- یەکێکی دیکە لە فیراسەت و پێشبینییەکانی (شيخ الإسلام) ئەوەیە کە (ابن القيم) باسی دەکا و دەڵێ: (بێگومان چەند شتێکی سەیرم لە فیراسەت و پێشبینییەکانی (شيخ الإسلام) بینیوە، ڕووداوەکان لەو بارەوە زۆرن و کتێبێکی گەورە دەبن، جارێکیان لەساڵی (٦٩٩)ی کۆچی هاوەڵەکانی خۆی ئاگادار کردنەوە کە (تەتار) دەگاتە شام و سوپای مسوڵمانان دەشکێ، بەڵام دیمەشق کوشتاری گشتی و ئەسیرکردنی گشتی تێدا ڕوو نادات، شەڕ و خراپەکەی لە ڕووی ماڵ و سامانەوە دەبێت، (إبن تيمية) ئەو قسەیەی پێش ئەوە کردوە کە (تەتار) بیەوێ بە جووڵە بکەوێ بۆ ئەوێ.

دوایی لە ساڵی (٧٠٢)ی کۆچی کە سوپای (تەتار) بەرەو شام بەڕێ دەکەوێ، (شيخ الإسلام) خەڵك و سەرکردەکان ئاگادار دەکاتەوە کە (تەتار) دەدۆڕێ و دەشکێ و بردنەوە و سەرکەوتنیش بۆ مسوڵمانان دەبێ، حەفتا جار لەسەر ئەو قسەیە سوێندی خواردوە کە دێتە دی، پێیان دەگوت بڵێ: انشاءالله دەیگوت: (انشاءالله تحقيقا لاتعليقا) واتە (انشاءالله) کە بە مسۆگەریی خوا دەیەوێ، نەك بە هەڵواسراوی و ئەگەر و نەگەر. وە دەڵێ: کە خەڵکی بەزۆریی دەهاتە لام لەو بارەوە، پێم دەگوتن: پێویست ناکات ئەوەندە بێن و بپرسن، خوای گەورە لە (لوح المحفوظ) دا نووسیویەتی کە ئەم جارە (تەتار) دەشکێ و سەرکەوتن

---

(١) کتێبی: (منازل السائرين) کتێبێکە لە تەزکیە و تەصەووف دا و (إبن القيم) بە کتێبی: (مدارج السالكين) شەرحی کردوە..

(٢) المرقاة شرح المشكاة ٤٢٧/٤، لة کتيبی (ابن تيمية للندوي)ش دا هاتوة ١٦٨ - ١٦٩.

بۆ سوپای ئیسلام دەبێ، دەڵێ: پێش دەرچوونیان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن شیرنایەتی سەرکەوتنم دابوو بە سەرکردە و سەربازەکان. لەو دوو ڕووداوەدا کە باسمان کردن، فیراسەتی (شیخ الإسلام) وەك بەرمەبەیان هاتە دی.

د- کاتێك لە (مصر)داواکرا و ویسترا بیکوژن - دوای ئەوەی بەدرۆ شتیان بۆ هەڵبەستبوو و پیلانیان لە دژی گێڕابوو هاوەڵەکانی بۆ خوا حافیزیی لێ ی کۆبوونەوەو پێیان گوت: هەواڵەکان ئەوە دەگەیەنن، کە دەیانەوێ بتکوژن، ئەویش گوتی: سوێند بەخوا قەت ناگەنە ئەو مەرامەیان، گوتیان ئەی حەبس دەکرێ ی؟ گوتی: بەڵێ حەبسەکەم درێژە دەکێشێ، دوایی دێمە دەرێ و لەنێو خەڵکی بە سوننەت قسە و بانگەوازی خۆم دەکەم.

هـ- دوای ئەوەی (جاشنگیر) - ناحەزی (شیخ الإسلام)- دەسەڵاتی وەرگرت، ئەو هەواڵەیان گەیاندە شێخ و گوتیان ئەمجارە (جاشنگیر) دەربارەی تۆ گەیشتە ئاوات و دەسەڵاتی پەیداکرد، (شیخ الإسلام) سەجدەیەکی درێژی بۆ خوا برد. پێیان گوت: ئەو سەجدەیەت بۆچی برد؟ گوتی ئەوە سەرەتای زەلیلی و نەمانی عیززەتیەتی و، دەسەڵات لە بەین چوونی نزیك بۆتەوە و نایمێنێ، زۆری نەبرد ئەوەی (شیخ الإسلام) گوتی ئاوا هاتە دی.

و- جارێکیان (شیخ الإسلام) دەیگوت: هاوەڵەکانم و خەڵکی دیکەش کە دێنە لام، هێندێك شت لە چاو و ڕوویان دەبینم بەڵام نایدرکێنم.

ز- وە زیاد لە جارێك هەواڵی پێداوم بە چەند شتێك کە تایبەت بەناخی خۆمەوە بووە، لەوەی عەزمم لەسەر بووە و بە زمان نەمدرکاندوە[1].

ی- (الحافظ ابو حفص البزار) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لە کتێبی (الأعلام العلیه) دا کۆمەڵێك لەو ڕووداوانە باس دەکات، کە ئەمە یەکێکیانە:

(زانای چاکەکار (احمد ابن الحریمی) سەفەرێکی خۆی بۆ باسکردم کە بۆ دیمەشق کردبووی و دەڵێ: کە چوومە ئەوێ هیچ شتێکم لە بژێو پێ نەبوو،

---

(١) مدارج السالکین ٢/٥٥٢ - ٥٥٣.



کەسیشم لەوێ نەدەناسی، بەبێ تاقەتیی و نەشارەزایی بە کۆڵانێکدا دەڕۆیشتم، پیاوێکم بینی بە خێرایی بەرەو ڕووم هات و سەلامی لێ کردم و بەڕوویەکی گەشەوە توورەکەیەکی خستە دەستمەوە، کە چەند درهەمێکی تێدابوو، پێی گوتم: ئیستا ئەوانە سەرف بکە و ئەو خەیاڵەی مەشغوڵی کردووی لە مێشکی خۆتی دەربکە، خوای بەخشەر تۆ بەزایە نادات، دوایی بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە، وەك تەنها لەبەر من هاتبێ وابوو، بەوە زۆر دڵ خۆش بووم و دووعام بۆکرد، دوایی لە هێندێك لەو خەڵکەی بینیمن پرسیم: ئەو پیاوە کێ بوو؟ یەکێك گوتی: دەڵێ ی نایناسی! ئەوە (إبن تیمیة) بوو، کە ماوەیەکی زۆرە نەمدیوە بێرەدا بڕوا، وە مەبەستی سەرەکییم لە سەفەرەکەمدا بۆ دیمەشق ئەوە بوو کە بە دیداری ئەو بگەم، بۆم دەرکەوت کە خوای بەرز ئەوی ئاگادار کردۆتەوە لەسەر حاڵ و وەزعی من، دوای ئەوە لەماوەی مانەوەم لە دیمەشق پێویستیم بەکەس نەبوو، بەڵکو خوای بێ وێنە بێ ئەوەی بیری لێ بکەمەوە دەرووی خێری لێ کردمەوە، لەمەولا بەڵگەم بەو دەهێنایەوە، هەرکاتێ ویستبام سەردانی بکەم، دەچوومە لای و ئەویش ڕێزی لێ دەگرتم و لە حاڵ و وەزعی دەپرسیم..»[1].

## ١٢- بەگەورە گرتنی سوننەت و پشتگیریی لێ کردنی:

ئەوەی یەکەم لە هاوەڵانی بەڕێز (ڕەزای خوایان لێ بێ) ڕێ ی دەستگرتن بە کتێبی خوا و سوونەتی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دەگرتەبەر، بە هەمان شێوەی تابیعین و پێشەوایانی ڕێنماییکاریش بەدوای ئەواندا هەنگاویان هەڵێنا، لە هیچ مەسەلەیەکدا هیچ قسە و رای کەس و بۆچوونی عەقڵ و دەمارگیریی مەزهەبییان پێش قورئان و سوننەت نەدەخست، کە لەسەر ئەوە ماوەیەك بەردەوام بوون.

دوای ئەوە گێروگرفت و ڕووداو و بەڵا و بەسەرهاتی سیاسی پەیدابوون، خەڵکیان پارچە پارچە کرد بە چەند دەستە و تاقم و مەزهەبێك، تاوای

---

(١) الأعلام العلية (ص٥٧).

لێهات ئەو پێڕ و تاقم و مەزهەبانە کەوتنە دمبەدمە و دژایەتیی کردنی یەکدی، سەرەنجام قورئان و سوننەتیان وەلا نان، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو حاڵەتە نائاسایی و خەماویانەش دا، هیچ چاخ و سەردەمێك لە پێشەوای سەرڕاست خاڵی نەبووە، کە خەڵکی بانگ دەکەن بۆ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی روون و راست و دەستگرتن بە قورئان و سوننەت و، داکۆکیی کردن لەسەر ئەوە کە تاکە چارەسەر بۆ گیروگرفتەکانی ئەم ئوممەتە و رزگار بوون لەم پارچە پارچە بوونە، پابەندبوونە بەو دوو سەرچاوەوە و، دەستگرتنە بە رێنمایی خوا و دوور کەوتنەوەیە لە بیر و بۆچوونی خوار و خێچ و ئەو مەزهەبانەی رووخێنەری دینن و، هیچ پەیوەندییەکیان بە دینەوە نیە، لە سەدەی حەوتەمی کۆچی دا تاریکیی ئەنگوستەچاو پەرەی سەندبوو، دژایەتیی و لە یەکدی خوێندن و دەمارگیریی مەزهەبیی گەیشتبووە ئەوپەڕی، لەوکاتە ناخۆش و دڵتەنگییەی کە جیهانی ئیسلامی پێیدا گوزەری دەکرد (شیخ الإسلام إبن تیمیة) مەردانە وەك کێو لە بەرانبەر ئەو کارە نادروستانە وەستا و، بانگەوازی دەست پێ کرد و خەڵکی ئاگادار کردەوە و، کاری بۆ ئەوە دەکرد خەڵکی بگەڕێنەوە بۆ دوو سەرچاوەی راست و بێ گەردی ئیسلام - قورئان و سوننەت - و وازهێنان لە دەمارگیریی مەزهەبییو لەسەر کاری بانگەوازی خۆی بەردەوام بوو، کە لەو پێناوەدا چەندین گیروگرفت و ناڕەحەتیی هاتونە رێ، بەڵام ئەو پشتی بە خوا بەست و سەبری گرت و بەردەوام بوو، سەرەنجام ئەو پشت بە خوا بەستن و سەبرگرتنەی بەرهەمی باشی لێکەوتەوە، لە میانی ئەو راپەڕینە زانستییەیدا جووڵەیەکی لە واقیعەکەدا دروست کرد، (شیخ الإسلام) لەو بارەوە دەور و کاریگەرییەکی زۆری هەبوو، کە تا ئەمڕۆش هەر درێژەی هەیە و بەردەوامە، ئەوانەی لەسەردەمی ئەودا ژیاون باسیان لەوە کردوە کە (شیخ الإسلام) زۆر گرنگی بە سوننەت داوە و بە گەورەی گرتوە و هەوڵی سەرخستنی داوە و، لەو پێناوەدا چەندین ئازار و مەینەتی بینیوە و، سەبری لەسەر گرتوە. کە زۆر لە زانایان شایەدی ئەو مەسەلەیەن بۆ نموونە:

أ- زانای گەورە (المزی یوسف بن عبدالرحمن) دەڵێ: (ما رأیت احدا أعلم



بكتاب الله وسنة رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ولا أتبع لهما منه)[1]

واتە: كەسم نەدیوە لە (شیخ الإسلام) زاناتربێ بە قورئان و سوننەت و لەو پێیانەوە پابەندتر بێ.

ب- ئیمام (الذهبي) دەڵێ: (ولقد نصر السنة المحضة، والطريقه السلفية، واحتج لها ببراهين ومقدمات وامور لم يسبق اليها)، واتە: پشتی سوننەتی ساغ و ڕێی پێشینی گرتوە، ئەمەش بە بەڵگە و پێشەكی بۆ هێنانەوە.... دیسان دەڵێ: لەسەر خوا و دەستگرتن بە سوننەتەوە، زۆر ئازا دراوە و ئیهانەی پێ كراوە و بەسووك تەماشا كراوە، تا خوا بەرزی كردەوە و دڵی خەڵكی تەقواداری لەسەر خۆشەویستیی و دووعا بۆ كردنی كۆكردەوە و دوژمنانی نابوت كردن، خەڵكێكی زۆر لە ئاین و نەتەوەكان لەسەر دەستی ئەو هیدایەت دران، وە دڵی مەلیك و فەرماندەكانی بەلای ئەودا ڕاكێشا كە بۆ زۆر شت گوێ ڕایەڵی بن و، كە شام بەڵكو ئیسلامی پێ زیندوو كردەوە، دوای ئەوەی خەریك بوو كەلێنی تێ بكەوێ، بەتایبەتی بەهۆی ڕەفتارەكانی (تەتار)ەوە[2].

## چەند نموونەیەك لە بە گەورەگرتنی (شیخ الإسلام) بۆ سوننەت:

### أ- خۆشەویستیی و گەورەیی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):

لەو بارەوە قوتابی خۆی (ابو حفص البزار) ئاماژەی پێدەكا و دەڵێ: قەت (شیخ الإسلام) ناوی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی نەهێناوە مەگەر سەڵەواتی لەسەر لێداوە، سوێند بەخوا كەسم نەدیوە لەو زیاتر پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) خۆشویستبێ و سوورتر بووبێ لەسەر پابەندیی بەرێ و شوێنەكەی و پشتی گرتبێ... وە دەیگوت: (كل قائل انما يحتج له لا به الا الله ورسوله)[3].

---

(١) الرد الوافر ٢٢٩.

(٢) مجمع شيوخ الذهبى ٨١/٦.

(٣) الاعلام العلية (٢٨، ٢٩).

واتە: هەموو کەس بەڵگە بۆ قسەکەی دەهێنرێتەوە - راستە یا نا؟ - نەك بەڵگە بە قسەکەی بهێنرێتەوە، تەنها خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبێ، کە فەرموودەکانی ئەوان بەڵگەیان پێ دەهێنرێتەوە و بەڵگەیان لەسەر ناهێنرێتەوە.

### ب- گرنگی دانی بە لەبەرکردنی حەدیس و نووسینەوەی:

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، زۆر گرنگی بە حەدیسی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوە، شەش کتێبەکەی حەدیس و موسنەدی ئیمام ئەحمەدی چەند جاران بیستوە و موتاڵای کردوون، وێڕای (المعجم الكبير للطبراني) و چەندین کتێبی دیکەی زۆری جۆراوجۆر و لەگەڵ نووسینەوەی چەند جوزئێك، سەردانی چەندین زانای کردوە و حەدیسی ساغ کردوونەوە و لە ناسین و هەڵسەنگاندنی کەسەکان دا شارەزایی هەبووە و، حەدیسی تاوتوێ کردوە و تێ ی گەیشتوە، بەشێوەیەك ئەوەی ئەو پێ ی گەیشتوە کەسانی دیکە نەیانتوانیوە پێ ی بگەن، ئەو یەکێك بووە لەو پێشەوایانەی رەخنەیان گرتوە لە زۆر تێگەیشتن و بیر و بۆچوون. کەم کەس ئەوەندەی ئەو حەدیسی لەبەر بووە کە بەزنجیرە بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئەصڵەکەی، وە یەکێك بووە کە زۆر زوو لەسەر هەرشتێك مەبەستی بووایە حەدیسی وەك بەڵگە دەهێنایەوە، وە لە فیقهو ڕاجیایی مەزهەبەکان و فتوای هاوەڵان و تابعین لەسەرووی خەڵکی دیکەوە بووە و شارەزاتر بووە، بە شێوەیەك کە فتوای دەدا بە مەزهەبێکەوە پابەند نەدەبوو، بەڵکو پابەند بوو بەو ڕایەی دەلیلی بەهێزتری لەسەر هەبوو.

### ج- سەربەخۆیی لە وەرگرتنی (فقه) لە قورئان و سوننەتدا:

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، قورئان و سوننەت و شوێنەواری پێشینی چاکی بە شێوەیەکی گشتگیر و بەقووڵی توێژیوەتەوە و لێیان ورد بۆتەوە، دوایی ئەوەی هەڵبژاردوە کە بەپێ ی زانیاری خۆی قورئان و سوننەت پاڵپشتییان کردوە و، بەو شێوەیەش ڕای خۆی راگەیاندوە، بێ ئەوەی گوێ



بداتە ئەو پێشەوایانەی پێشوو کە بە پێچەوانەی رای ئەو قسەیان کردوە، ناوبراو دەلیل و بەڵگەی بەهێز لەکوێ بووایە دوای دەکەوت.

(ابن الوردی) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (له باع طويل في معرفة مذاهب الصحابة والتابعين، قل ان يتكلم في مسألة الا ويذكرفيها المذاهب الأربعة، وقد خالف الأربعة في مسائل معروفة، وصنف فيها واحتج لها بالكتاب) هەروەها دەڵێ: (وبقى سنين لا يفتي بمذهب معين، بل بما قام الدليل عليه عنده....)[1].

واتە: (شيخ الإسلام) دەستێکی باڵآ و توانایەکی زۆری هەبووە لە زانینی مەزهەبی هاوەڵان و تابعین دا، کەم وا هەبووە باسی مەسەلەیەکی کردبێ، مەگەر رای هەرچوار مەزهەبەکەی تێدا گوتوە، وە لە چەند مەسەلەیەکی زانراویشدا لەگەڵ هەرچواریان دا ڕای جیاوازی هەبووە، کە رای خۆی لە بارەیانەوە نووسیوە و بەڵگەشی بە قورئان هێناوەتەوە) هەروەها دەڵێ: (ماوەی چەند ساڵێك بە مەزهەبێکی دیاریکراو فتوای نەداوە، بەڵکو فتوای بەوەداوە کە لەلای ئەو بەڵگەی بەهێزی لەسەر بووە).

## د- بانگەشەی گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت:

رێباز و رێڕەوی (شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، رێڕەوێکی زانستی بەو، ئیسلامی بە عەقیدە و بنچینەکان و بنەماو لقەکانی یەوە، بۆ چاخی یەکەم گێڕاوەتەوە، هەرکاتێك قەناعەتی دەهات و مسۆگەر دەبوو لەوەی ئەوەی دەیڵێ و دەیکا ئەوەیە کە هاوەڵان لەسەری بوون، بە بەڵگە و دەلیل بەرگریی لێ دەکرد و ئەوەی لەتوانای دابووبێ لەو رێیەوە بەکاری هێناوە، لەسەردەمی خۆی دا زانایانی سەرسام و ئەهلی بیدعەتی تووڕە کردوە، بە هیوای پاداشت کە لەسەر ئازاردرانی لەو پێناوەدا، دەستی دەکەوێ.

(شيخ الإسلام) دەڵێ: بابزانرێ کە هیچ پێشەوایەکی راست و پەسەندکراو بە شێوەیەکی گشتی لەلای ئوممەت، بە ئەنقەست لە هیچ شتێکدا پێچەوانەی

---

(١) تأريخ ابن الوردي ٢/٤٠٦، ٤١٣.

سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ناجوڵێتەوە، بچووك بێ یان گەورە، بێگومان هەموویان یەك دەنگن لەسەر پێویست بوونی شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وەلەسەر ئەوە کۆکن کە هەموو تاکێك لە ئینسانەکان قسەی لێ وەردەگیرێ و بەسەریدا دەدرێتەوە جگە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)[1].

وە دەڵێ: (ولیس لاحد أن یعارض الحدیث الصحیح عن النبی(صلی الله علیه وسلم) بقول احد من الناس، کما قال ابن عباس (رضی الله عنها) لرجل سأله عن مسألة فأجابه فیها بحدیث، فقال له: قال ابوبکر و عمر، فقال ابن عباس: یوشك ان تنزل علیکم حجارة من السماء، أقول: قال رسول الله (صلی الله علیه وسلم) وتقولون قال أبوبکر و عمر)[2].

واتە: بۆ کەس نیە پێچەوانەی حەدیسی صحیحی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، رەفتاربکا لەبەر قسەی یەکێکی دیکە لە خەڵکی، وەك چۆن دوای ئەوەی پیاوێك پرسیاری مەسەلەیەکی لە (ابن عباس) کردبوو، ئەویش بە حەدیس وەڵامی دابۆوە و کابراش گوتبووی: ئاخر ئەبوبەکر و عومەر ئاوا دەڵێن، (ابن عباس)یش پێی گوتوە: لەوانەیە لە ئاسمانەوە بەردتان بەسەر دا بباری، من دەڵێم پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئاوا دەفەرموێ، ئێوەش دەڵێن ئەبوبەکر و عومەر ئاوا دەڵێن).

### هـ- دژایەتیی کردنی بۆ بیر و باوەڕ و مەزهەبە لادەرەکان رافیزە بە نموونە:

لەسەردەمی خۆی دا (شیخ الإسلام) زۆر شارەزا بوو بە ئاشکراکردنی ئەو مەزهەبانەی لایانداوە، هەموو مەبەستیشی لەوەدا ئەوە بوو پاکیی و رێك و پێکیی بۆ ئیسلام بگەڕێتەوە و، باتڵ وەلانێ و خراپەکەی دەرکەوێ، ئەمەش

---

(١) رفع الملام عن الأئمة الأعلام (ص١٠).

(٢) رفع الملام عن الأئمة الأعلام (ص٥٤).



لە میانەی ئاشکرا بوونی خراپە و لادانی کۆمەڵ و پێرە پووچ و بەتاڵەکان دا، کە دەیانویست عەقیدەی پاکی ئیسلام و شەریعەتە خاوێنەکەی بشێوێنن، بۆیە هێرشی دەکردە سەر هەموو پێڕ و تاقم و مەزهەبە لا دەرەکان کە لە قورئان و سوننەت لایاندا بوو.

لەوبارەوە (الحافظ البزار) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (یەکێك لەو تایبەتمەندییانەی خوای بەرز پێ ی بەخشیبوو، دژایەتیی کردنی ئەهلی بیدعەت، لە کردنی بیدعەت دا و، ئەهلی هەوا لە کاری نابەجێیان دا و، بەرپەرچ دانەوە و پووچاندنەوەی قسە و درۆیەکانی خۆیان و هاوشێوەکانیان و هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەکانیان و وەڵام دانەوەی بۆ گومانە شەیتانیەکانیان بوو، و وەڵامدانەوەی بوو بۆ ئەو دژایەتییەیان کە بۆ شەریعەتی ئیسلام پێ ی هەڵدەستان، ئەوەش بەو هێز و توانای زانستی و سەبر و ئارامگرتن و حیکمەت و لێزانینەی بوو کە خوای بەخشەر پێ ی بەخشیبوو، تا سەرەنجام ڕووی گەشی هەق، زیاتر دەرکەوت و..)[1].

وێڕای سینگ فراوانی و لێبووردەیی (شیخ الاسلام) لەگەڵ زانایان و بە دادگەرانە مامەڵە کردنی لەگەڵ پێڕ و تاقمەکان دا کە چاکەکانی بینیوون، بەڵام لە لایەکی دیکەوە زۆر بە جددی و بێ سازش کردن و بەراشکاوانە بەرپەرچی هەڵوێستە ناشەرعی و خراپەکانیانی داونەتەوە، کەواتە لەلایەکەوە وەک چۆن بەرپەرچی عەقیدەی باطلی نەصرانیەکانی داوەتەوە و ڕاستیەکانی دەربارەی (مسیح، عیسا) و زۆر شتی دیکە بۆ خۆیان و مسوڵمانان ڕوونکردۆتەوە، بەهەمان شێوە سەبارەت بە قسە و تێڕوانینی هەڵەی پێڕ و تاقمە بیدعەتچی و لادەرەکانی وەك شیعەش قسە و ڕای خۆی هەبووە وەك لەم چەند دێڕەدا باسی دەکەین:

دوای ئەوەی زانای شیعە مەزهەب (ابن المطهر الحلي) کتێبێکی گەورەی لە دژی (أهل السنة والجماعة) دانا بەناوی ( منهاج الكرامة في معرفة الامامة) کە ئەوەش بۆ مەرایی و دڵخۆشکردنی مەلیك (اولیجاخدا بندەخان)ی تەتاری

بوو کە بە هەوڵی ((ابن المطهر) ببوو بە شیعە، (ابن المطهر) لە کتێبەکەیدا زۆر بێ ویژدانانە و داخ لە دڵانە لە دژی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)بەگشتی و سێ جێنشینە سەرڕاستەکان نووسیویەتی و باسی بێ گوناهی و مەعصومیەتی ئەهلی بەیتی کردوە و لە کاردانەوەی ئەوە و بۆ دەرکەوتنی راستیەکان، مسوڵمانانی (أهل السنة) داوایان لە (شیخ الاسلام) کرد کە خاوەنی زانیاریەکی فراوان بوو، بەرپەرچی (ابن المطهر الحلی) بداتەوە، هەربۆیە ئەویش وەکو وەڵامێك کتێبێکی نووسی بەناوی (منهاج السنة النبویة في نقض کلام الشیعة والقدریة)[1]. کە تێیدا شیخ الاسلام بەرپەرچی هەموو ئەو درۆ و دەلەسانەی داونەوە کە (ابن المطهر) بە بەڵگە هێناونی و دەری خستوە کە هەموو ئەو ریوایەتانەی (ابن المطهر)بە هی (صحیحین و احمد بن حنبل)ی لەقەڵەم داون، درۆن و (ابن المطهر) هەڵی بەستوون. شیخ الاسلام لەو کتێبەدا لەباسی گەورەیی پلە و پایەی هاوەڵان و هەڵوێستی رافیزە بەرانبەریان دەڵێ: (وهذه الامة خیر الامم, وخیرها القرن الاول..... وهؤلاء المفترون وصفوهم بنقیض ذلك بانهم لم یکونوا یعلمون الحق ویتبعونه, بل کان اکثرهم عندهم یعلمون الحق ویخالفونه)[2]

واتە: ئەم ئوممەتی ئیسلامە باشترین ی هەموو ئوممەتانە باشترینی ئوممەتی ئیسلامیش سەدەی یەکەمە... ئەو شیعە درۆزنانەش بە پێچەوانەی ئەوە باسیان دەکەن و دەڵێن - هاوەڵان - هەقیان نەزانیوە و بەدوای کەوتبن، بەڵکو لای وان زۆربەیان هەقیان ناسیوە و بەدوای نەکەوتوون و پێچەوانەی وەستاون.

هەر لەوبارەوە شیخ الاسلام دەڵێ: (فانهم عمدوا الی خیار أهل الارض من الاولین بعد النبیین والمرسلین والی خیرامة اخرجت للناس فجعلوهم شرار الناس، وافتروا علیهم العظائم وجعلوا حسناتهم سیئاتهم...... لیس في جمیع الطوائف

---

(١) منهاج السنة: چوار بەرگ و نزیکەی (١٢١٤) لاپەڕەیە، الحافظ الذهبي کورتی کردۆتەوە بەناوی (المنتقی).

(٢) منهاج السنة ج١ ص٥٢



المنتسبة الى الاسلام مع بدعة وضلالة شر منهم, ولا أجهل ولا اكذب ولا أظلم ولا أقرب الى الكفر والفسوق والعصيان وابعد عن حقائق الايمان منهم)[١]

واتە: شیعەی رافیزە دەربارەی باشترینی خەڵکی سەرزەوی دوای پێغەمبەرانی خوا و دەربارەی باشترین کۆمەڵ کە بۆ خەڵکی پەیداکراون دەڵێن خراپترینی خەڵکن و درۆی گوناهی گەورە یان بۆ هەڵدەبەستن و چاکەکانیش بە خراپە و گوناح دەزانن.. لە تێکرای ئەو کۆمەڵ و دەستانەی پاڵدراونە لای ئیسلام و بیدعە و گومراییان هەیە لەوانی خراپتر تێدا نی یە، وەکەس لە شیعە نەزانتر و درۆزنتر و زاڵمتر و نزیکتر لە بێ باوەڕیی و گوناهو لەرێ دەرچوون و دوور کەوتنەوە تر لە راستی یەکانی ئیمان نی یە.

شیخ الاسلام قسەیەکی (الامام الشعبی) دێنێتەوە کە دەڵێ:لە یەهودیانیان پرسی کێ لە شوێنکەوتوانی دینی ئێوە لە هەموو کەس باشترە؟ وتیان هاوەڵانی موسا. وە لە (نصرانییانیان) پرسی کێ لە شوێنکەوتوانی دینی ئێوە لە هەموو کەس باشترە؟ وتیان هاوەڵانی عیسا. لە رافیزەیان پرسی کێ لە شوێنکەوتوانی دینی ئێوە لە هەموو کەس خراپترە؟ وتیان هاوەڵانی (محمد) کە داوایان لێکراوە داوای لێخۆشبوون بکەن بۆیان بەڵام جنێویان پێ دەدەن.[٢]

بەهەمان شێوە (شیخ الاسلام) باسی هەڵوێستی خراپی شیعە دەکات کە لە دژی مسوڵمانان هاوکاری جولەکە و نصرانیەکان بوون، دەڵێ: (وهذا دأب الشيعة دائما يتجاوزون عن جماعة المسلمين الى اليهود والنصارى و المشركين في الأقوال والموالاة والمعاونة والقتال وغير ذلك, ومن أضل من يقوم يعادون السابقين الاولين من المهاجرين والانصار ويوالون المنافقين والكفار)[٣]

واتە: وە هەموو کات ئەوە عادەتی شیعە بووە کە بە قسە و دۆستایەتی و یارمەتی دان و جەنگ و ... ریزی مسوڵمانانی جێ هێشتووە و چونە بەرەی



جولەکە و نصرانی و هاوبەشدانەران. ئایا کێ لەوکەسە گومرا و سەرلێشێواوترە کە دژایەتی پێشینە یەکەمەکان لە کۆچکەران و پشتیوانان دەکەن و پشتی دەغەڵ و کافران دەگرن. کەچەند نموونەیەکی زیندوو لەو بارەوە دێنێتەوە وەك: هاوکاریکردنی نەصرانی یەکان لە شام و ...

ئەوەی ڕابرد چەند سیفەتێکی (شیخ الإسلام إبن تیمیة) بوون، کە وێنەیەکی ڕۆشنمان دەداتێ لە کەسایەتیی ئەو پێشەوا گەورەیە و، ئەوە دەسەلمێنێ کە قسە و کردەوەی ناوبرا و یەکیان گرتۆتەوە و خو و ڕەوشت و هەڵوێستەکانیشی بە پێ ی شەریعەت بوون، وە دەردەکەوێ کە (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، باشترین نموونەی زانای خاوەن کردەوەیە بە پێی شەریعەت و ویستوویەتی لە قورئان و سوننەت لانەدا و، بۆ تێگەیشتن لێیان ڕێ ی پێشینی چاکی گرتوە.





بەشی پێنجەم

# ڕێبازی (شیخ الإسلام) لە بانگەواز و چاکسازیی لە نێوان تیۆر و جێ بەجێ کردندا

لە کاتێکدا (شیخ الإسلام) هاتە دنیاوە کە خەریك بوو، مسوڵمانان نیشانە و قوچکەکانی سەر ئەو ڕێیەی کە ڕێنماییان دەکات بۆ هەق و ڕاستیی، لەنێو بەڵا و گرفت و ناخۆشییەکاندا ون بکەن، ئەو بە ئەرکی گرانی چاکسازیی لە هەل و مەرجێکی ئاوا تفت و تاڵ دا کە ئوممەتی ئیسلامی پێیدا تێدەپەڕی، هەستا، دوای ئەوەی تووشی ڕاوەستاویی و دۆگمایی بوون بوو بوو، گیانی بەبەر بیر و هزری ئیسلامیی دا کردەوە کە خەریك بوو نیشانە و درووشمەکانی بکوژێنەوە.

(إبن تیمیة) وەك یەکێك لە زنجیرەی پیاوچاکانی مێژووی ئیسلامیی هاتە ژیانەوە و ئەوکات کۆمەڵگەی ئیسلامیی گەیشتبووە ئاست و قۆناغێك کە قەڵەم ناتوانێ وێنای بکا، لەبەر ئەو گەندەڵیی سیاسی و کۆمەڵایەتیی یەی تێی کەوتبوو، وێڕای پارچە پارچە بوون لە رووی مەزهەبییەوە، چەند سەرکردەیەك دەستیان بەسەر کاروباری خەڵکی دا گرتبوو،لە سێبەری نەزانیی خەڵکەکەدا بۆ تێرکردنی هەوا و ئارەزووی خۆیان دەژیان، بەو شێوەیە بەڵا و ناخۆشیەکان هەموو لایەکیان گرتبۆوە، وای لێهاتبوو خەڵکی هەستی بەرەنگاربوونەوەیان نەمابوو، دەیانبینی، بەڵام عەقڵیان پێی نەدەشکا، دەیانبیست، بەڵام تێینەدەگەیشتن، لێیان

دەخوڕین و بەخۆیان نەدەزانی، لە هەلومەرجێکی ئاوا خراپدا، کە (تەتار)یش هێرشی کردبووە سەر وڵاتانی مسوڵمانان و داگیری کردبوون و، لە بارودۆخێکی رووخاوی ئابووری ئاواو و تێکچوونی کۆمەڵایەتییدا، کۆمەڵگا پێویستی بە بانگخوازێکی لێهاتوو هەبوو، کە بتوانێ سەرپەرشتی بارودۆخەکە بکات و، پێش ئەوەی دەست بکات بەو کارە چاکسازییانە، هەڵیبسەنگێنێ و تێی بگا و بیتوێژێتەوە، چونکە رێ کردن بە پێچەوانەی رێڕەوی ڕاستی و چارەسەری وەزعەکە، دەبێتە هۆی درووست بوونی پەرچ و لەمپەر، ئەگەر نەبێتە مایەی بە زایە چوونی هەوڵ و کرد و کۆششەکان.

(إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئەو بانگخوازە لێهاتوو و ئینسانە چاکسازە هەڵکەوتووە بوو، کە توانی جووڵەیەکی بەهێز لە ژینگەی وەستاوی سەردەمی خۆیدا بەرپا بکا، وە ژینگە خێزانییەکەشی کە لە بنەماڵەیەکی زانستیی و دینیی دا پەروەردە بوو بوو، یاریدەدەری بوو لەو بوارەدا، وێڕای چەند سیفەت و توانایەکی دیکەش کە خوای کاربەجێ پێ ی بەخشیبوون، لە زانیاری و توانای زۆر لەبەرکردن و ئازایەتیی و نەترسان و هەقبێژیی و چەسپاویی و ئارامگرتن لەسەر وەئەستۆگرتنی بەرپرسیاریەتی و ئەو دەرهاویشتانەی تووشیان بووە لەو رێیەدا لە ئەزیەت و ئازار و ئەشکەنجە و دەربەدەریی کە لە پێناو ڕەزامەندیی خوادا سەبری لەسەر گرتوون، وێڕای خۆ یەکلاکردنەوەی و سینگ فراوانیی و هەبوونی تەقوا و دنیا بە کەمگرتن و عیبادەتی زۆر و ... هتد، کە هەموو ئەوانە پاش چاکە و یارمەتی خوا، ئامادەیان کرد کە ببێتە چاکەخوازێك و چاکسازێك بۆ ئەو هەلومەرج و بارودۆخە خراپ و ناهەموارەی کە مسوڵمانان لەو کاتەدا تێیدا دەژیان.

(شيخ الإسلام) هەستا بە پشتگرتنی دینی خوا و گێڕانەوەی متمانە بۆ دڵی مسوڵمانان و، دژایەتیی کردنی ترس و دڵەڕاوکێ کە دڵەکانی پڕکردبوو، وە سەرلەنوێ درووستکردنەوەی ئەوەی کە خەریك بوو سەرلەبەری هەڵتەکێ، لە بینای فکریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریی، بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، وە ئەوەی لە توانایدا بوو لەو پێناوەدا کردی، بەڵام با بزانین چۆنی کرد و بنچینەکانی پڕۆژەچاکسازیەکەی چی و چی بوون.



## یەکەم: بنچینەکانی بەرنامەی بانگەوازیی لای ئیبنوتەیمییە:

خوای میهرەبان (إبن تيمية)ی سەرخست بۆ کارکردن لەسەر زیندوو کردنەوەی بانگەواز لە دەروونی خەڵکی دا، بەرەو هەق و ڕاستیی، وە بۆ لابردنی ئەو پەڵە و تەم و مژەی لە حاڵ و وەزعیان ئاڵابوو، کە بنەماکانی ئیسلامی بەپێزیان لە زۆر کەس ونکردبوون، هات و چەند بنچینەیەکی بۆ بزووتنەوە بانگخوازییەکەی لە نێویاندا داناو، لەوێوە دەستی پێ کرد، بۆ ئەوەی بگاتە مەبەستەکانی، لە گێڕانەوەی متمانەی خەڵکی بە پەروەردگاریان و پەیوەندیی پچڕاویان لەگەڵی دا چاك بکەنەوە، دەستیان بگرێ بەرەو سەربەرزیی دنیا و قیامەت بیانبات. لەو بنچینانەی پشتی پێ دەبەستن:

### ١- دەست گرتن بە قورئان و سوننەت:

(إبن تيمية) یەکێك بوو لە داکۆکیکارترین کەس لەسەر دەستگرتن بە قورئان و سوننەتەوە، بانگەشەی بۆ دەکرد و هەرشتێك پێچەوانەی ئەوان بوایە، وەلای دەنا و یەکێك بووە لەو کەسانەی کە باشترین شوێنکەوتەی قورئان و سوننەتن، لە هەموو هەڵسوکەوتێکیاندا.

(الحافظ أبو حفص البزار) دەڵێ: (كان اذا وضح له الحق يعض عليه بالنواجذ، والله مارأيت احدا أشد تعظيما لرسول الله (صلى الله عليه وسلم) ولا احرص على اتباعه ونصر ماجاء به، منه...)[1].

واتە: (هەرکاتێك هەقی بۆ دەرکەوتبایە بە ددانان دەیگرت - واتە بە توندی دەیگرت - سوێند بەخوا کەسم نەدیوە لەو زیاتر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)ی بە گەورە گرتبێ و داکۆکی کارتر بووبێ لەسەر شوێن پێ هەڵگرتنی و پشتگرتنی

ئەوەی هێناویەتی). هەروەها دەڵێ: (واذا نظر المنصف اليه بعين العدل، يراه واقفا مع الكتاب والسنة لايميله عنهما قول أحد كائنا من كان...).

واتە: (ئەگەر یەکێك بە چاوی دادگەرانە سەیری (شيخ الإسلام) بکات، دەبینێ کە ئەو لەگەڵ قورئان و سوننەت راوەستاوە و قسەی هیچ کەسێك هەر کەسێك بووبێ لە قورئان و سوننەتی لانەداوە و گوێی نەداوەتە کەس و لە هیچ ئەمیر و سوڵتان و هەڕەشەیەك نەترساوە و، بۆ قسەی کەس وازی لەوان نەهێناوە دەستگرتوو بووە بە ئیسلام). وەدەڵێ: (وما سمعنا انه اشتهر عن احد منذ دهر طويل، ما اشتهر عنه من كثرة متابعته للكتاب والسنة..)

واتە: ماوەیەکی زۆرە نەمان بیستوە کەس ناوبانگی زیاتر بووبێ لە (إبن تيمية) لەزۆر بەدوا کەوتنی قورئان و سوننەتدا.

لە قسەکانی خۆی و ئەوەش دا،کە ڕابرد، دەردەکەوێ کە (شيخ الإسلام) شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت و فەرمانبەریی تەواو بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، بە فەرز و پێویست زانیووە، وە بڕوای وابووە هیچ کەس دوای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پارێزراو نیە لە هەڵەو کەموکوڕیی، بۆیە لەدوای ئەو پێویست نیە هیچ کەس لە هەموو شتێکدا فەرمانبەریی بۆ بکرێ، چونکە فەرمانبەری رەها تەنها بۆ خوا و پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) لە ئەمر و نەهی دا.

### ٢- داکۆکیی کردن لەسەر یەکپارچەیی ئوممەت :

ئەو داکۆکیی کردنە لە چەند شتێکدا لە (شيخ الإسلام) دەرکەوتوون، لەوانە:

### أ- گرنگیی (یەک دەنگیی) لە ئیسلام دا:

لەوبارەوە (شيخ الإسلام) دەڵێ: (وەك دەزانن یەکێك لە بنچینە گرنگەکانی دین، یەکخستنی دڵەکان و یەکدەنگیی و چاککردنی پەیوەندیی نێوان خەڵك و کەسەکانە، خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ الأنفال: ١



واتە: پارێزلە خوا بکەن و نێوانی خۆتان چاك بکەن. وەدەفەرموێ:

﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴾ ال عمران (١٠٣)

واتە: (هەمووتان دەست بگرن بە ڕێسمانی خواوە و پەرتەوازە مەبن). وەدەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ ال عمران (١٠٥)

واتە: (وە وەکو ئەوانە مەبن -لە جوولەکە و گاورەکان- کە پەرتەوازە بوون و ناکۆکییان کەوتە نێوان، دوای ئەوەی بەڵگە و نیشانەی ئاشکرایان بۆ هاتن، وە ئەوانە سزای گەورەیان بۆ هەیە).

وە وێنەی ئەو دەقانە زۆرن کە فەرمان بە کۆمەڵ بوون و یەکڕیزیی دەکەن و، نەهی دەکەن لە پارچە پارچەیی و ناکۆکیی، بێگومان شوێنکەوتوانی ئەم بنچینەیە ئەهلی کۆمەڵ و جەماعەتن، هەروەك دەرچوان لێ ی ئەهلی پەرتەوازەیی و لێکترازانن[1].

## ب- دەستپێکردنی لە (یەکبوونی قسە و یەکخستنی دڵان)ەوە:

(شیخ الإسلام) لەوبارەوە دەڵێ: (یەکەم شت کە دەمەوێ لەم بنچینەیە دەستی پێ بکەم، ئەوەیە کە پەیوەندیی بە خۆمەوە هەیە، ئێوە دەزانن — خوا لێتان ڕازی بێ- من پێم خۆش نیە و نامەوێ هیچ کەس لە مسوڵمانان — چ جای هاوەڵانمان- قەت بە هیچ شتێك ئازاربدرێ، نە ئازاردرانی ئاشکرا نە پەنهان، وەمن ڕەخنە و گلەییم لە هیچ کەسێك نیە، بەڵکو ئەوان چاکە و خۆشەویستی و گەورەییان بەسەرمەوە هەیە، هەر کەسە بەپێ ی خۆی، وە ئینسان یان موجتەهیدێکە و پێکاویەتی، یان بە هەڵەدا چووە، یان گوناهبارە، یەکەمیان خاوەن پاداشتە و سوپاسکراوە، دووەمیان لەگەڵ هەبوونی پاداشت لەسەر ئیجتهادەکەی عەفوو کراوە و خوا لێ ی خۆش دەبێ، سێیەمیان خوا لە

ئێمە و ئەو و باقی مسوڵمانان خۆش بێ و، قسە کردن لەسەر پێچەوانەی ئەم بنچینەیە دەپێچینەوە و کۆتایی پێ دێنین[1].

## ۵- بە ناهەق قسەکردن لە دژی یەکدی بنچینەی پارچە پارچەبوونە:

(شیخ الإسلام) دەڵێ: (قسەکردن لەسەر پێچەوانەی ئەم بنچینەیەش دەپێچینەوە، وەکو ئەوەی یەکێك بڵێ: فلان کەس کەمتەرخەم بوو، فلانکەس ئیشی نەکرد بەهۆی فلانکەسەوە، (شیخ الإسلام) تووشی ئازاربوو، فلانکەس هۆکاری ئەو مەسەلەیە بوو، فلانکەس قسەی لە دژی فلان دەکرد، لەو جۆرە قسانە کە زەمم و رەخنەی تێدایە بۆ هێندێك لە برایان و دۆستان، من رێ نادەم کەس ئازاری یەکدی بدات[2].

## ٣- رەچاوکردنی فیقهی لە پێشترەکان - فقه الأولويات- و پلە پلەیی - تدرج - لە پەروەردەکردندا:

پێشینی چاك(رەزای خوایان لێ بێ) بەهۆی تێگەیشتنی راستیان لە دین، چاك دەیانزانی لە پێشترەکان چۆن دیاری بکەن، وە چۆن ژیانیان رێك بخەن لە میانەی ئەو دیاریکردنەدا، ئەگەر یەکێك لە نێویان پەیدا بوویایە و چۆنیەتی رێکخستنی لە پێشترەکانی چاك نەزانیبایە، دەچوونە لای و دڵسۆزییان بۆ دەنواند و بۆیان ڕووندەکردەوە کە دەقە شەرعییەکان هێندیك جار- بەرواڵەت- لەلای مسوڵمانان دژایەتییان لەگەڵ یەکدی دا هەیە، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ تێگەیشتنی لە پێشترەکان، زانینی گرنگتر دوایی گرنگ، پێویستر و پێویست، ئاسان دەبێ، بەڵام بەهۆی نەبوونی تێگەیشتنی راست و دروست بۆ ئیسلام و، تێنەگەیشتنی چاك لە فیقهی لە پێشترەکان ناکۆکیی پەیدا دەبێ و ئەوە بە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکان دەژمێردرێ، کە سەر دەکێشێ بۆ دروست بوونی ناکۆکیی لە نێو مسوڵمانانندا.



بێگومان ڕێکخستنی لە پێشترەکان لەلای مسوڵمانان و ڕیزبەندیی و دیاریکردنی گرنگتر ئنجا گرنگ، ئەرکێکی گرنگە و کاری مسوڵمانی ئاسایی نیە، بەڵکو ئەرکی زانایانی متمانە پێکراوی ئەم ئوممەتەن، هەر بۆیە زانای گەورە (عبدالوهاب خلاف) دەڵێ: (ان تقدير الضرورة التي يعدل به عن حكم النص, وتقدير المصلحة التي يبنى عليها الحكم فيما لانص فيه يجب أن يكونا من اختصاص الجماعة التشريعية في الأمة المكونة من العدول ذوي البصيرة النافذة بأحكام الشريعة ومصالح الدنيا ولا يوكل أمر واحد منهما الى فرد أو أفراد, فان الهوى قد يغلب على العقل فيقدر الكمالى ضروريا, ويقدر المتوهم قطعيا ويقدر المفسد مصلحة).

واتە: بێگومان دیاریکردنی حاڵەتی ناچاری کە بەهۆیەوە لە ڕواڵەتی حوکمی دەق لادەدرێ، وەدیاریکردنی ئەم بەرژەوەندییەی کە لەسەر شتێك کە دەقی لەسەر نیە بنیات دەنرێ، هەردووکیان مافی تایبەتی دەسەڵاتی یاسادانانن لە نێو ئۆممەت، کە دەبێ لە کەسانی دادگەر و شایستە و بەرچاوڕوون و شارەزا بە یاساکانی شەریعەت و بەرژەوەندیەکانی دنیا پێك بێت. وە هیچ کام لەو دووانەش بە کەسێك یان چەند کەسێك ناسپێردرێن، چونکە زۆرجاران ئارەزوو بەسەر عەقڵ دا زاڵ دەبێ و، ئەوەی کە تەواوکەرە بە پێویست و، شتی وەهمی بە یەقین و خراپە بە بەرژەوەندی دادەنرێ.

(شيخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، یەکێکە لە گەورەترین کەسایەتییەکان بە درێژایی مێژوو کە لە ئامانجەکانی شەریعەت و ریزبەندیی لە پێشترەکان (مقاصد الشريعة و ترتيب الأولويات) لە کارەکاندا بە باشی تێگەیشتوە، وێڕای ئەو زانیارییە زۆر و ئاگادارییە فراوانەی خوای زانا پێی بەخشیوە لەبارەی شەریعەت و راجیایی مەزهەبەکان و قسەی پێشەوایان، کە بۆتە مایەی پەیدا کردنی توانایەکی زۆر لەسەر ڕێکخستنی شتە لە پێشترەکان بۆ کارە بانگەواز و هەوڵە چاکسازییەکانی، هەر بۆیە کارکردن بە فیقهی لە پێشترەکان، گرنگییەکی زۆری هەبووە لەلای ئەو وەك لە داهاتوودا کەمێك باس لەو مەسەلەیە دەکەین.



## أ- گرنگیی تێگەیشتن لە (مقاصدالشريعة) ئامانجەکانی شەریعەت:

(شيخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (هەر کەسێك بیەوێ شەریعەت وەك خۆی و لە چوارچێوەی دەقەکان و ئامانجەکاندا بیخوێنێتەوە، دەزانێ کە شەریعەت لەسەر ئایەتی:

﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ البقرة (١٧٣).

واتە: (هەرکەسێ بەڕاستیی ناچاربێ و بەئەندازەی زەرورەت و بێ زێدەڕۆیی حەرام بخوات، ئەوە گوناهی ناگاتێ). وەئایەتی:

﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ المائدة (٣).

واتە: (هەرکەسێك ناچاربێ لە برسان، بێ ئەوەی مەبەستی زیادەڕۆیی و گوناه کردن بێ، بۆی هەیە حەرام بخوا و لێی حەڕام نیە، خوا لێخۆشبووی بەبەزەییە). بنیات نراوە، کەواتە هەرشتێك ئینسان بۆ پاراستنی ژیانی خۆی لە مردن پێویستی پێ ی هەبێ، و مەبەستی کردنی گوناهیش نەبێ - وەك نەکردنی واجبێك، یان کردنی حەڕامێك- ئەوە حەرام نابێ لەسەری، چونکە ئەوکات لە حوکم و مانای تێگیراو (مضطر) دایە کە بە ناچاریی و بە پێی پێویست دەیکات)[1].

## ب- وردیی (شیخ الإسلام) لە ڕیزبەندیی کردنی لە پێشترەکان دا:

پێشەوا (ابن القيم) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کەمێك لە تێگەیشتنی قووڵی (شيخ الإسلام) بۆ ئیسلام و وردبینییەکەی لە ریزبەندییکردنی لە پێشترەکان، باس دەکا و دەڵێ:

(سمعت شيخ الإسلام ابن تيمية يقول: مررت أنا وبعض أصحابي في زمن التتار بقوم منهم يشربون الخمر، فأنكر عليهم من كان معي، فقلت له: انما حرم الله الخمر لأنها تصد عن ذكر الله وعن الصلاة، وهؤلاء تصدهم الخمر عن قتل

---

(١) مجموع الفتاوى ٣/٢٩٤.



النفوس وسبي الذرية وأخذ الأموال، فدعهم)[١].

واتە: (گوێم لە "شيخ الإسلام إبن تيمية" بوو دەیگوت: من و هێندێك لە هاوەڵانم لەسەردەمی تەتارەکاندا بەلای خەڵکێکی ئەواندا تێپەڕین کە شەڕابیان دەخواردەوە، ئەوەی لەگەڵمدا بوو ویستی نەهێڵێ ئەوکارە خراپە بکەن، منیش پێم گوت: خوا ئارەقی بۆیە حەرام کردوە چونکە لە یادی خوا و نوێژ بێئاگایان دەکات، بەڵام ئەوانە ئارەقخواردنەوەکەیان لە کوشتنی خەڵك و بردنی ماڵ و بەدیل گرتنی خەڵکی بێ ئاگایان دەکات، لێیان گەڕێ با بخۆنەوە). هەر لەوبارەوە (ابن كثير) دەڵێ: (خەڵکی باسی ئەوەیان دەکرد کە جەنگ لەگەڵ (تەتار) چۆنە و چ حوکمێکی هەیە؟ چونکە ئەوان خۆیان بە مسوڵمان دەزانن و لە ئیمامیش هەڵنەگەڕاونەوە، کە پێشتر گوێ رایەڵی بووبن و دوایی بەقسەیان نەکردبێ؟ (شيخ تقي الدين ابن تيمية) گووتی: ئەوانە وەك (خەواریج) وان، کە دژایەتی (علي و معاوية)یان دەکرد و پێیان وابوو خۆیان چاکترن لەوان و لە هەردووکیان شایستەترن بۆ کاروبار بەڕێوەبردن، وە ئەمانەش (تەتار) وادەزانن لە مسوڵمانان شایستەترن، لە پیادەکردنی هەق و ڕاستیی دا، وە بەشتێك ڕەخنە و عەیبە لە مسوڵمانان دەگرن، کە خۆیان پێوەی گیرۆدەبوون، لە گوناهو زوڵم و ستەم، بەڵکو لە مسوڵمانان زۆر زیاتر زوڵم و تاوانیان هەیە، زانایان و خەڵکی بە گشتی ئاگادارن و ئەو شتە دەزانن.

وە بەخەڵکی دەگوت: ئەگەر منتان بینی لەبەرەی ئەوان دا بووم و قورئانێکم لەسەر سەربوو، بمکوژن، بەوە خەڵك هاندەدرا بۆ جەنگ کردن لە دژی تەتار و نیەت و دڵیان بەهێز دەبوو)[٢]. هەر لەو بارەوە (ابن اكثير) باس لە هاندانی (شيخ الإسلام) بە شکاندنی ڕۆژوو دەکات لە ڕەمەزاندا، کە لە جەنگ دابوون لەگەڵ (تەتار)دا، بۆ ئەوەی هێز و پێزیان هەبێ و بێهێز نەبن، بە هەمان شێوە وەك پێشترباسمان کرد (شيخ الإسلام) لە جەنگی (شقحب) دژی (تەتار) ڕازی

نەبووە لە ژێر ئاڵای سوڵتاندا بجەنگێ و چاکتر لەلای ئەو ئەوە بووە، کە لەگەڵ شامیەکان و لە ژێر ئاڵای شام دا بێ[1]، هەموو ئەمانە زانایی (شیخ الإسلام) لە ریزبەندیکردنی لە پێشترەکان دا دەسەلمێنێ.

## ج- نەکردنی واجبێک لە پێناو کردنی واجبترێک، یان بێدەنگی لە خراپەیەک لە پێناو لابردنی خراپترێک دا:

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (ئەگەر دوو شتی واجب کۆبوونەوە و نەدەکرا هەردووکیان بەیەکەوە بکرێن، ئەوەی واجبترە پێش دەخرێ و، ئەوەی دیکە لەو کاتەدا واجب نابێ، وە ئەو کەسەی ئەو واجبەی تەرك کردوە لە پێناو کردنی شتێکی واجبتردا نابێتە چوێنەری واجب، . بەهەمان شێوە ئەگەر دوو شتی حەرام بەیەکەوە کۆبوونەوە و، بەکردنی حەرامە کەمەکە نەبووایە حەرامە گەورەکە وازی لێ نەدەهێنرا، ئەوە لەوکاتەدا کردنی حەرامە بچووکەکە بە حەرام دانانرێ، هەرچەندە ئەوەی پێشوو پێی دەگوترێ نەکردنی واجب و ئەمەش پێی دەگوترێ کردنی حەرامکراو، وە لەم حاڵەتەدا گوتراوە: نەکردنی واجب لەبەر هەبوونی عوزر و، کردنی حەڕام لەبەر بەرژەوەندییەکی مسۆگەر یان پێویست یان بۆ لابردنی شتێکی حەڕامتر)[2].

## د- یەکخستنی دڵەکان لە پێشترە لە ناکۆکیی لەشتە فەرعییەکان دا:

پێشتر باسمان کرد کە (شیخ الإسلام) چەند داکۆکی کردوە لە کۆکردنەوەی قسەو گوتاری مسوڵمانان و یەکبوونی بەیداغ و یەکخستنی دڵەکانیان، وەکاتێك قسە لە تێگەیشتنی لە پێشترەکان (فقه الأولويات) لەلای (شیخ الإسلام) دەکەین، دەبینین ئەو زۆر داکۆکی لەسەر ئەو مەسەلەیە دەکات و رێگاکانی وەدەستهێنانی روون دەکاتەوە، ئەگەر سەریش بکێشێ بۆ نەکردنی چەند سوننەتێکیش، ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن لەوبارەوە:

---

(١) البداية والنهاية ١٤/ ٢٥ - ٢٦.

(٢) مجموع الفتاوى ٥٧/٢٠.



*** نەکردنی هێندێک سوننەت لە پێناو یەکخستنی دڵەکان دا:**

(شیخ الإسلام) دەڵێ: (ويستحب للرجل أن يقصد الى تأليف هذه القلوب بترك هذه المستحبات، لأن مصلحة التأليف في الدين أعظم من مصلحة فعل مثل هذا، كما ترك البنى (صلى الله عليه وسلم) تغيير بناء البيت لما رأى فى ابقائه من تأليف القلوب، وكما أنكر ابن مسعود على عثمان إتمام الصلاة في السفر ثم صلى خلفه متما وقال: الخلاف شر)[1].

واتە: (پەسەند ئەوەیە پیاو کار بۆ بەیەکەوە جۆشدانی ئەو دڵانە بکات، بە نەکردنی هێندێك شتی چاك و پەسەند، چونکە بەرژەوەندیی یەکخستنی دڵەکان لە دیندا گەورەترە لە بەرژەوەندیی کارێکی لەو شێوەیە، وەك چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینای کەعبەی نەگۆڕی و نەیخستەوە سەر بناغەی ئەسڵی خۆی، نەوەکو ناکۆکیی بکەوێتە نێوان خەڵکەکە کە تازە مسوڵمان بوو بوون، چونکە زانی بە هێشتنەوەی بەم شێوەیە یەکخستنی دڵەکانی تێدایە، وە وەك چۆن (ابن مسعود) ناڕازی بوو (عثمان) (ڕەزای خوای لێبێت) لەسەفەرێ دا نوێژەکان بە تەواویی (بێ کورت کردنەوە) بکات، بەڵام دوایی لە دوایەوە نوێژی بەتەواویی کرد و گوتی: ناکۆکیی خراپە.

*** ناکۆکیی لە وردە بابەتی عەقیدەیی دا نابێتە مایەی پەرتەوازەیی:**

لە چـوار چـێوەی دیاریکردنی لە پێشترەکان، ناکۆکیی و ڕاجیایی لە مەسەلە ورد و فەرعییەکانی عەقیدەدا، نابێ پەرتەوازەیی و دژایەتی لە نێوان مسوڵماناندا دروست بکات، وەنابێ سەر بکێشێ بۆ دروست بوونی کێشە و فیتنە، بەڵکو پێویستە زمانەکان لە قسەی خراپ خۆ بگرنەوە و، دڵەکان یەك بن و، نەفسەکان یەك ڕیز بن، بە شێوەیەك لەو نامەیەی دا کە ئاڕاستەی ئەهلی (بەحرەین) ی کردبوو دوای ئەوەی ڕاجیاییان کەوتبووە نێو لە مەسەلەیەکی بچووکی عەقیدەیی دا، کە بریتی بوو لە (بینرانی خوا لە لایەن کافرانەوە) و کێشە و دەمبەدەمە لە نێویاندا دروست بوو بوو، تاوای لێهات قسەیان لە یەکدی دابڕی و هێندێکیان نوێژیان

لە دوای هێندێکیان نەدەکرد، (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (ئەوەی پێویستیکرد ئەم نامەیە بنووسم بریتی بوو لەوەی کاتێك نێردراوەکەتان هێندێك شتی بۆ باسکردم، لە تەفرەقە و ناکۆکیی نێوانتان، باسیان لەوە کرد کە کار گەیشتۆتە نزیك شەڕکردن بەیەکەوە، و گوتیان: کە هۆی ئەو تەفرەقە و ناکۆکییەش مەسەلەی (بینرانی خوا لە لایەن کافران) وەیە، وە ئێمە نەماندەزانی کە کار لەو مەسەلەیەدا دەگاتە ئەو رادەیە، چونکە ئەوە شتێکی بچووکە، بەڵکو ئەوەی گرنگە و پێویستە هەموو مسوڵمانێك باوەڕی پێی هەبێ ئەوەیە کە (أن المؤمنین یرون ربهم في الدار الاخرة في عرصة القیامة و بعدها یدخلون الجنة) واتە: بێگومان ئیمانداران لە رۆژی دوایی دا لە گۆڕەپانی وەستاندا پەروەردگاریان دەبینن و ئنجا دەچنە بەهەشتەوە. دوایی دەڵێ: بەکورتی مەبەستم ئەوە نیە لەم نامەیەدا قسەی تەواو لەسەر ئەو مەسەلەیە بکەم، چونکە ئەوە زۆر هەڵدەگرێ، بەڵکو مەبەستم روونکردنەوەی ئەوەیە کە ئەم مەسەلەیە لەو مەسەلە گرنگانە نیە کە زۆر باسی بکرێ و، بخرێتە سەر زاری هەموو کەس لە خەڵکی گشتی و تایبەتی و ببێتە دیاردەیەك و مایەی لێکترازانی دڵەکان و پارچە پارچە بوونی ویست و ئارەزوو مەبەستەکان[1].

*** راجیایی لە وردە بابەتە فیقهی یەکان دا نابێتە مایەی پەرتەوازەیی:**

ئەگەر راجیایی لە وردە بابەتی عەقیدەدا نەبێتە مایەی پەرتەوازەیی و لێکترازانی مسوڵمانان، ئەوە راجیایی لە وردە بابەتە فیقهی یەکاندا، زیاتر ئەو حوکمەی بەسەردا دەچەسپێ و (ابن تیمیة) لەوبارەوە دەڵێ: (وأما الإختلاف في الإحکام فأکثر من أن ینضبط ولو کان کلما اختلف مسلمان في شيء تهاجرا لم یبق بین المسلمین عصمة ولا اخوة)[2].

واتە: بەڵام راجیایی لە حوکمە فقهییەکان دا لەوە زیاترە کۆنترۆڵ بکرێ، خۆ



ئەگەر هەرکاتێك دوو مسوڵمان لە دووشت دا راجیاییان هەبوو، لێکدابڕان دروست ببێ، ئەوە لە نێوان مسوڵمانان دا، یەکڕیزیی و برایەتیی نامێنێ.

(شیخ الإسلام) زۆر دژی ئەوە بوو کەلەسەر راجیایی هێندێك بابەتی فیقهیی، ناکۆکیی و لێکدابڕان دروست ببێ و لەوبارەوە دەڵێ: (چۆنیەتی نوێژکردن کە یەکێك لە درووشمەکانی مەسەلەی (بسم الله الرحمن الرحیم)ە خەڵکی لەوبارەوە کە ئایا ئایەتێکە لە قورئان یان نا، ناکۆکن؟ وە لە خوێندنەوەی لە نوێژدا بە هەمان شێوە، لە هەرلایەك چەند شتێك لەو بارەوە نووسراون، کە لە هێندێکیان بەرانبەر ئەوی دیکە جۆرێك لە نەزانیی و زوڵمی تێدایە، لە کاتێکدا کارەکە بچووك و ئاسانە[1].

*** راجیایی بەبێ لێکترازان:**

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (مەسەلەی ڕاجیایی-وەك من بزانم- لەو شتانەدا نیە، کە ببنە هۆی لێك دابڕان و پەیوەندیی پچڕاندن لەگەڵ یەکدی دا، ئەوانەی پێش ئێمە قسەیان لەوە کردوە، هەموویان لە ئەهلی سوننەت و شوێنپێ هەڵگری شەریعەت بوون، زۆر کەس راجیایی لە مەسەلەیەکدا هەبوە و لێکیش نەترازاون و پەیوەندیشییان لەگەڵ یەکدی نەپچڕاندوە، وەك چۆن هاوەڵان (رەزای خوایان لێ بێ) و خەڵکیش دوای ئەوان، راجیاییان هەبووە لەوە دا کە ئایا پێغەمبەر لە دنیادا خوای بینیوە یان نا؟ کە هێندێکیان قسەی توندیا لەوبارەوە کردوە، بۆ نموونە دایکی ئیمانداران (عائشە) (رەزای خوای لێبێت) لەوبارەوە دەڵێ:

(من زعم ان محمداً رأى ربه فقد أَعظم على الله الفرية)[2]

واتە: هەرکەسێك وا بزانێ کە محمد (صلى الله علیه وسلم) پەروەردگاری لە دنیادا بینیوە، ئەوە قسەیەکی زۆر ناڕاستیی لەسەر خوا کردوە، لەگەڵ ئەوەشدا

---

(١) القواعد النورانية الفقهية (ص٤٣).

(٢) رواه البخاري برقم (٣٢٣٤) ومسلم (١٧٧).

ئەو ناکۆکییە سەری نەکێشاوە، بۆ پەیوەندیی پچڕان و لێکدابڕان. بەهەمان شێوە (ئیمام احمد) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، موناقەشەی لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لە ئەهلی سوننەت دا کردوە لەسەر شایەدیی دانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بۆ (١٠)دە کەسەکە (کەدەچنە بەهەشتێ) هەتا موناقەشەکە گەیشتۆتە راددەیەك دەنگ بەرز کردنەوەی بەسەر یەکدی دا تێیدا پەیدابووە، کە ئیمام احمد و خەڵکێکی دیکەش ئەو شایەدیەییان بەراست زانیوە و دەنگ و پەیوەندیشییان دانەبڕیوە و نەپچڕاندوە، لەگەڵ ئەوانەی ئەوەیان نەسەلماندوە، وە زۆر نموونەی دیکەش لەو شێوەیە هەن[1].

*** راجیایی لە سێبەری خۆشەویستی دا:**

(شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: زانایان لە هاوەڵان و تابیعین و دوای ئەوانیش، ئەگەر لە شتێکدا ناکۆکییان هەبووایە، دەگەڕانەوە بۆ فەرمانی خوا کە دەفەرموێ:

﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾ النساء(٥٩).

واتە: (ئەگەر لە شتێکدا ناکۆك بوون، حوکمەکەی بگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر - بزانن ئەوان چی دەڵێن لە قورئان و سوننەتدا- ئەگەر ئێوە ئیمانتان بە خوا و رۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترە و باشترین سەرەنجامە. دواتر (شیخ الإسلام) دەڵێ: (وکانوا یتناظرون فی المسألة مناظرة مشاورة و مناصحة، و ربما اختلف قولهم في المسألة العملية والعلمية مع بقاء الألفة والعصمة وأخوة الدين).

واتە: (زانایان کە مشتومڕیان دەبوو لە مەسەلەیەکدا مشتومڕی ڕاوێژ و دڵسۆزیی بوو بۆ یەکدی، وە ئەوان جاری وا هەبووە لە مەسەلەیەکی زانستی یان کردەیی دا، راجیاییان هەبووە لەگەڵ مانەوەی خۆشەویستیی و برایەتیی



دینیی و پەروەشیی دا بۆ یەکدی. دیسان دەڵێ: بەڵێ هەرکەسێك پێچەوانەی قورئان وسوننەت رەفتار بکات، یان ئەوەی پێشینی چاك لەسەری كۆك بوون، بە شێوەیەك هیچ عوزریشی نەبن، ئەوە ئەوکاتە وەك چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەهلی بیدعەت دەکرێ، لەگەڵ ئەویش بەهەمان شێوە مامەڵە دەکرێ[١].

## هـ- جیاوازیی پلەی کردەوە، بە پێی جیاوازیی بارودۆخ:

(شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (یەك کردەوە هێندێ جارکردنی سوننەت و پەسندە، هێندێك جاریش نەکردنی سوننەت و پەسندە، ئەوەش لەبەر ئەو بەرژەوەندییەی بە پێ ی دەلیلی شەرعیی لە کردنی یان نەکردنی دا دێتە ئاراوە، مسوڵمان هێندێك جار شتێکی پەسەند ناکات، ئەگەر بە کردنەکەی خراپەیەك دروست ببێ بۆسەر بەرژەوەندیی یەکی شەرعی، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دروستکردنەوەی کەعبەی لەسەر بناغەی (ئیبراهیم) ی علیه السلام، واز لێ هێنا و بە (عائشە)ی (رەزای خوای لێبێت)، فەرمووو:

(لولا حداثة قومك بالكفر لنقضت البيت ثم لبنيته على اساس ابراهيم....)[٢].

واتە: (ئەی عائیشە) ئەگەر قەومەکەت - قورەیش- تازە مسوڵمان نەبوویان و لەسەردەمی بێ باوەڕی و جاهیلیی نزیك نەبوونایە، ئەوە کەعبەم هەڵدەوەشاند و لەسەر بناغەی ابراهیم دامدەنایەوە و دروستم دەکردەوە.. کەواتە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) ئەوکارەی نەکرد، کە لەلای ئەو نەکردنی باشتر بوو، چونکە قورەیش تازە مسوڵمان بوو بوون و ئەگەر وای کردبا و دەستکاریی کەعبە کرابایە، ئەوە لەدین دوور دەکەوتنەوە، هەر بۆیە هێشتنەوەی لەسەر حاڵەتی خۆی و نەگێڕانەوەی بۆ سەر بناغەی (ابراهیم)ی تەرجیح دا بەسەر دەستکاریی کردنیدا، کە بەهۆی تازە مسوڵمان بوونیانەوە دەستکاریی کرانی کێشەی لێ دەکەوتەوە.

هەر بۆیە پێشەوایان بە باشیان زانیوە - ئەحمەد و خەڵکی دیکەش- کە ئیمام واز لەوە بێنێ کە لەلای خۆی چاکترە، ئەگەر لەوەدا یەکڕیزیی مسوڵمانان هەبێ، بۆ نموونە: ئەگەر بەلایەوە جیاکردنەوەی یەك ڕکات وەتر، بەوەی کە دوو ڕکات بکات و سەلام بداتەوە و، دوایی یەك ڕکات بکات، باشتربێ، بەڵام ئەو پێشنوێژی بۆ خەڵکێك دەکرد کە پێیان باشتربوو یەك رکاتەکەش لەگەڵ دوو رکاتەکە بەیەکەوە بن، جا ئەگەر نەیتوانی ئەوەی خۆی پێی باشترە پێیان بسەلمێنێ، ئەوە بەرژەوەندیی لەوە دایە بە قسەی ئەوان بکا و، هەرسێك رکاتی (وتر) بەیەکەوە بکات، کە ئەوکات ئەوە باشترە لەوەی لێکیان جیابکاتەوە و سەرەنجام خەڵکەکە پێیان ناخۆش بێ و نوێژی لەدواوە نەکەن. وەدەڵێ: (ئەو شتانە هەرچەندە یەکێکیان باشترە لەوی دیکە، جا ئەگەر یەکێك (مرجوح)ە کەی کرد ئەوە بۆی دروستە، جاری واش هەیە کردنی ئەو (مرجوح)ە چاکترە لەبەر ئەو بەرژەوەندییە زۆرەی تێیدایە، هەروەك جاری واش هەیە نەکردنی باشتر، باشترە لەبەر بەرژەوەندییەکی گەورە، وە لەهەمەوو کردەوەکان دا ئاوایە، کردەوەی وا هەیە باشترینە، بەڵام لە هێندێك شوێن و کاتی دیکەدا شتێکی دیکە لەو باشتر دەبێ[1].

## و- جووڵانەوە بەپێچەوانەی بێ بڕوایان لە هەڵسوکەوتی ڕواڵەتییان دا بە پێی کات وشوێن وهاتنەدی ئامانجەکانە:

(شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: پێچەوانەکردنی کافران تەنها کاتێك دەکرێ کە دین لە بەرزی دابێ و سەرکەوتوو بووبێ بە سەر یاندا و مسوڵمانان ملکەچیان کردبن بەدانی سەرانە (جزیة)، کاتێك مسوڵمانان لەسەرەتای کاریاندا بوون و لاواز بوون، پێچەوانە جووڵانەوەی مسوڵمانان بۆ کافران واجب نەکرابوو، بەڵام دوای ئەوەی دین زاڵ بوو و سەرکەوت، ئەوکات ئەوە واجب کرا، ئەمڕۆش بەهەمان شێوەیە، ئێستا ئەگەر مسوڵمان لە (دارالحرب یان دارالکفر) نشتمانێك، کە شەڕی تێدابێت لە نێوان مسوڵمان و کافران یان لە

---

(١) مجموع الفتاوی ٢٤/١٩٥ - ١٩٨.



نیشتمانی کافران دابێ، ئەوە فەرمانی پێنەکراوە بە دژایەتیی کردنی کافران لە هەڵسوکەوتی رواڵەتییان دا چونکە ئەوە بە زیان دەگەڕێتەوە بۆ سەری، بەڵکو هێندێك جارپەسندە،یان واجب دەبێ، ئەگەر مسوڵمان بەشدارییان بکات لە هەڵسوکەوت و رەفتاری ئاشکرایان دا بە مەرجێك لەوەدا بەرژەوەندییەکی دینی تێدابێ، بەوەی بەرەو دین بانگیان بکا، یان بۆ ئەوەی شارەزابێ بەکار و کردەوە و ئیش و پیشەیان و، دوایی مسوڵمانانی لێ ئاگادار بکاتەوە، یان ببێتە مایەی دوورخستنەوەی زەرەر و زیانیان لە مسوڵمانان، یان شتێکی دیکەی وەك ئەو ئامانجە پەسندانە.

بەڵام لە وڵاتی ئیسلامیی (دار الإسلام)دا کە خوای دادگەر دینی خۆی تێدا باڵادەست کردوە و کافرانی بێ دەسەڵات کردوە، بەدانی، سەرانە (جزية)، لە وێدا پێچەوانە جووڵانەوەی کافران بڕیاری لەسەر دراوە.[1] کەواتە بەپێی زەمان و کات و شوێن دەگۆڕێ.

## ٤- گشتگیر بوونی بەرنامەی بانگخوازیی و چاکسازیی (شيخ الإسلام) :

بەرنامەی بانگخوازیی (شيخ الإسلام) بە گشتگیریی پێناسە کراوە، کە هەموو لایەنە جیاوازەکانی ژیانی گرتۆتەوە، (شيخ الإسلام) خاوەنی عەقڵێکی کراوە و بیرێکی ناوازەی هەڵکەوتووی فراوان بووە، بە فیراسەت و پێشبینیی تەماشای شتەکانی دەکرد، لەومیانەدا ئەوەی، کە لە رۆژانی داهاتوودا رووی دەدا، دەیبینی، ئەو لەژیانی دا یارمەتی لەو پەیوەندییە بە هێزەی وەردەگرت، کە لەگەڵ خوادا هەیبوو، رۆژەکەی بە بانگەوازی بۆ لای خوا بەسەردەبرد و شەوەکەشی تەرخان دەکرد بۆ خوا پەرستیی، خوای زانا زانیاری و سەر ڕاستیی پێ بەخشیبوو، دڵی بێدار کردبۆوە و بەرچاو ڕوونیی پێ دابوو، زۆر شتی شاراوەی بۆ دەردەکەوت، ئەوەی ئەو دەیبینی لە حاڵ و وەزعی مسوڵمانان،

کەسانی دیکە دەرکیان پێ نەدەکرد، بۆیە بڕیاری دا کە گۆڕانکاریی و چاکسازیی لەنێو کۆمەڵدا بکات، کە بەروبوومەکەی بریتی بوو، لەو بەرنامە تێر و تەواوەی کە هەموو لایەك و کایە جیاوازەکانی ژیانی گرتبۆوە، تا خراپەکانی چاك کردن و خوار وخێچییەکانی ڕاست کردنەوە و، بە رووحی ئیسلامی بێ هەڵە و پەڵە مسوڵمانانی زیندوو کردنەوە[١]. کەهەوڵە چاکسازییەکانی هەموو لایەنەکانی گرتبۆوە، وەك:

## یەك: بواری سـیـاسی

**کە لەو بارەوە هەوڵە چاکسازییەکەی، دوو لایەنی لەخۆ گرتبوو:**

**أ- دروستکردنی تێڕوانینێکی ڕاست بۆ حوکمڕانیی:**

ئەمەش لە میانەی روونکردنەوەی ڕاستییەکی گرنگ، کە بریتیە لەوەی ئەوەندە بەس نیە دەوڵەت بە تەنیا لە لایەنی ئیداریی و بەڕێوەبردنەوە بە هێز بێت، بەڵکو پێویستە ئەو ئیدارەدانە لەگەڵ مانا و تێڕوانینە شەرعییەکان و بنچینە نەگۆڕەکان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بگونجێن. (شيخ الإسلام) دوو کتێبی (الحسبة) و (السياسة الشرعية) ی نووسیون کە زۆر لە ڕاو بۆچوونەکانیانی تێدان، سەبارەت بە مافەکانی بەرپرسان و جەماوەر، وە چۆن دەوڵەتی ئیسلامی دروست بووە، وێڕای یاسای ڕاوێژ و لێپرسینەوە و دژایەتیی کردنی بەرتیل، کە لەسەردەمی ئەوان دا زۆر لە نێو فەرمانبەرانی دەوڵەتدا بڵاو بوو بۆوە[٢].

لە پێناو هێنانە دی ئەو مەبەستەی دا، بڕیاری دروستکردنی پەیوەندییەکی بە هێزی لەگەڵ سوڵتان دا و ڕێنمایی دەکرد و شتی فێر دەکرد، هێندێك شتی بۆ ڕوون دەکردەوە، کە لەلای ئەو شاراوە و نەزانراو بوو، وە داوای لێ دەکرد



ئەوەی والی و ئەمیرەکان خراپیان کردبوو چاکیان بکاتەوە، وە خۆی سەرپەرشتی هێندێك گۆڕانکاریی کرد و بەدەستی خۆی خراپەکانی لادەبردن[1].

**ب- هەوڵدانی بۆ بنیاتنانی حکوومەتێکی بەهێز:**

هەر لەو پێناوەدا پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئەمیرە کۆیلەکان (أمراء المماليك) و سوڵتان ناصردا بەهێز کرد و، هەوڵی دا قەناعەتیان پێ بێنێ بە پابەندیی بە قورئان و سوننەتەوە لە حوکمڕانییی دا، تا وای لێهات بە هێندێك لەو ئەمیرانە بگوترێ قوتابیی و شوێنکەوتەی (شیخ الإسلام) لەوانە: (زين الدين كاتوبغا المنصوری) کە دەسەڵاتداری (حماه) بوو، وە (ارغون الناصری) کە پلەی جێگری سوڵتانی، لە میسر و حەڵەب و دیمەشق پێدرابوو، وە ئەمیر (سلار) کە ئەویش جێگری سوڵتان بوو، وە ئەمیر (حسام الدين مهنا ابن عيسى الطائي) کە عەرەب بوو لە ساڵی (٧٠٧)ی کۆچی دا وەك بە گەورەزانین و رێز لێ گرتن (شیخ الإسلام) ی لە بەندیخانە هێنایە دەرێ، وە سوڵتان (ناصر محمد بن قلاوون) کە لە ساڵی (٧٠٩)ی کۆچی دا گەڕایەوە بۆ سەر تەختی دەسەڵات، دوای ئەوەی (جاشنگیر) کوژرا، یەکەم ئیشی ئەوە بوو (شیخ الإسلام) کە نەفی کرابوو بۆ (ئەسکەندەرییە)، ئازادی کرد[2].

**دوو: بواری ئـــابووریی**

دوای کشانەوەی (تەتار) کە لەسەردەمی ئەواندا خراپە و گەندەڵییەکی زۆر بڵاو بوو بۆوە (شیخ الإسلام) خۆی سەرپەرشتیی بەرەنگار بوونەوە و نەهێشتنی ئاسەواری ئەو خراپیی و گەندەڵییەی دەکرد، چونکە ئەوکات لە دیمەشقدا هیچ حاکم و کار بەدەستێك نەما بوو کە لە لایەن سوڵتانەوە دانرابێ، بۆیە (شیخ الإسلام) خۆی بە حاکم و بەرپرسی وڵات دانا و بەرەنگاری ئەو فەساد و خراپانە

بۆوە، بارِ و مەیخانە و شوێنی فرۆشتنی شەراب کە زۆر بڵاو بووبوونەوەو لە گرنگترین سەرچاوەی داهاتی حوکمڕانی پێشوو بوون لە وڵاتدا، (إبن تيمية) دانی بەوەدا نەهێنا و بڕیاری دا کە ئەوانە ماڵی حەرامن و ناکرێ ببنە سەرچاوەی داهاتی (بيت المال)ی مسوڵمانان، بۆیە خۆی و ئەوانەی لەگەڵی دا بوون، هەستان بە داخستنی ئەو شوێنانە و شکاندنی ئەو کوپ و گۆزانەی کە شەرابیان تێدابوو و ڕژاندنی شەرابەکەیان، هەرچەندە بەمە وڵات بێ بەش بوو لە سەرچاوەیەکی گرنگی داهات و هاوکاری[1].

ئەوکات دانیشتووانی شاخەکانی (الجر و كسروان) یارمەتی (تەتار) یان دابوو بۆ داگیرکردنی شام، دوای ئەوەی سوپای شام شکا، و ئەوان زاڵ بوون، هەرچی ماڵ و سامان و وڵاغ و سیلاح بوو لێیان ستاندن و زۆر لە مسوڵمانانیان کوشتن، ئنجا دوای ئەوەی بارودۆخەکە ئارام بۆوە، (شيخ الإسلام) ویستی ئەو خەڵکە خراپ و هەڵگەڕاوانە تەمبێ بکات، خۆی و خەڵکێکی زۆری خۆبەخش بۆیان چوون و بەسەریاندادان و تۆبەی پێ کردن و ناچاریی کردن بە گێڕانەوەی هەموو ئەو سەروەت و سامانەی کە لە مسوڵمانانیان بردبوو، ماڵ و سامانێکی زۆریشی لەسەر پێویست کردن کە بۆ (بيت المال)ی مسوڵمانانی بێنن[2].

کاتێك بۆ جارێکی دیکە (تەتار) رویکردەوە شام، خەڵکەکە تۆقرمیان لێ هەڵگیرا و ناڕەحەت بوون و بیریان لە هەڵاتن و ڕۆیشتنیان لە شام دەکردەوە، لەوکاتەدا (شيخ الإسلام) بەچڕی دەستی کرد بە وتاردان و دەرس گوتنەوە لەو بارەوە و ورەی دەدایە بەر خەڵکەکە و ترسی لە دڵیان دەڕەواندەوە، وە تێی گەیاندن کە هەڵاتن عەیب و شوورەیی یە و بیرۆکەیەکی ئابووریی بۆ پێشنیار کردن، کە لەو باوەڕەدام شتی لەو بابەتە پێشتر نەکرابێ، کاتێك پێ ی گوتن: ئەوەی ئێمە خەرجی دەکەین لە کرێی هەڵاتن، ئەگەر خەرج بکرێ لە موجاهیدەکان و

---

(١) رجال الفكر والدعوة ٢/ ٥٤ استمرارية الدعوة ٩٥.

(٢) استمرارية الدعوة ٩٥ - ٩٦.



سیلاحی پێ بکرێن و شەڕی پێ بکەن لەگەڵ دوژمناندا، ئەوە لای خوا باشترە و پاداشتی گەورەترە و مایەی سەرکەوتنی مسوڵمانە موجاهیدەکانە بەو شێوەیە دڵەکان ئارام وجێگیر بوونەوە و بارودۆخەکەش هێور بۆوە[1].

## سێ: بواری فکریی و پەروەردەیی

لەبەر گرنگیی و بایەخی ئەو بوارە(شیخ الإسلام) هەوڵەکانی چڕ کردنەوە بۆ قووڵکردنەوەی مانا و مەبەستەکانی فکری ڕاست و دروست، وە روونکردنەوەی قوچکە و نیشانەکانی کە چڵك و چەپەری تەقلید و چەواشەکاریی و فەیلەسووف و هێندێك لەوانەی زۆر بە زانستی کەلامەوە خەریك بوو بوون و پیڕ و تاقمە گومڕاکان، داپۆشیبوون، هەر بۆیە ڕووی کردە دوو لایەنی گرنگ:

### أ- چاکسازیی عەقیدە و نوێکردنەوەی نیشانەکانی ڕێبازی ڕاست:

ئەم مەسەلەیە بەشێکی زۆری لە فیکری (شیخ الإسلام) داپۆشیبوو، چونکە ئەوە ئامانجی یەکەمە لە نێررانی پێغەمبەران(علیهم السلام) و بناغەی کاری ئیسلامیی لە بەرنامەی ئیسلامیی دا پێك دێنێ، وە لەبەر ئەوەی ڕوونیی و خاوێنیی عەقیدە بەهۆی هەبوونی زۆر تەوژمی (عیلمی کەلام) کە بە هەق وناهەق دەربارەی دەدوان تەمومژی لێهاڵابوو، (شیخ الإسلام) هەوڵەکانی چڕ کردبوونەوە لەسەر دەرخستن و باسکردنی هەڵەی (المتکلمین) ئەوانەی قسەیان لەسەر عەقیدە کردبوو، وە لە چارەسەرکردنی مەسەلەکانی عەقیدە دا، بە ئەرکی روونکردنەوەی بنچینەکانی عەقیدەی راست، کە دین باسیان دەکات، هەڵنەستابوون، وە ئەوەندەیان کەرەسە و زانین نەدابووە مسوڵمانان، کە بتوانن بەربەرچی خوانەناسانی پێ بدەنەوە، نە ئیسلامیان سەرخستبوو نە دوژمنانیشیان تێکشکاندبوون، لە بەرانبەردا (شیخ الإسلام) بەرنامەی زانایانی پێشینی دانا لە خستنەڕووی مەسەلە عەقیدەییەکان دا، چونکە ئەوان لە بەڵگە هێنانەوە دا ڕێی

قورئان دەگرنە بەر و دەقەكان لەسەر مانای ئاشكرای خۆیان كە شیاوە دێنن، بەبێ چۆنیەتی و لادانی ماناكەیان (من غیر تكییف ولا تأویل)[1].

**ب- نوێكردنەوەی زانستە شەرعییەكان لە میانی هەڵوێستیی لە كۆششكردن (اجتهاد) و لاساییكردنەوە(تەقلید)دا:**

هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی زانستییانەیەوە (شیخ الإسلام) پشتی بەو بناغانە دەبەست كە ئەهلی حەدیس لە ئیجتهاد كردندا لەسەری دەوەستان، كەبریتیە لە هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ قورئان و سوننەت دا وەك خوودی ئایین و پێشخستنیان بەسەر غەیری خۆیان دا، ئنجا فتوای هاوەڵان كە ئەوانەی لێ هەڵدەبژاردن كە قەناعەتی وابوو نزیكترینیانن لە قورئان و سوننەتەوە و لەكاتی ناچاریی دا نەبووایە، پەنای نەدەبردە بەر(قیاس)، وە لە كاتێكدا كە دەقێكی ڕاست (صحیح) یان باش (حسن) نەبووایە كاری بە قیاس دەكرد.

لە سەرەتاوە (شیخ الإسلام) پشتی بە مەزهەبی حەنبەلیی دە بەست و پێشی دەخست لەسەر راو مەزهەبەكانی دیكە، چونكە قەناعەتی وابوو كە لە هەموویان لە قورئان و سوننەت نزیكترە و، لەوبارەوە چاوی لە بنەماڵە و باب و باپیرانی خۆی دەكرد، بەڵام زۆری نەخایاند پێگەیشت و لە كۆتی تەقلید دەرچوو، دەستی گرت بە دەقی وەحی یەوە، مادام لە یەكێكی پارێزراوەوە - پێغەمبەر-(صلی الله علیه وسلم) وەرگیراوە و لەوە لای نەدەدا بۆ قسەی هیچ كەسێك، هەركەسێك بووبێ، وە لەبانگەشە كردنی بۆ كردنەوەی دەرگای ئیجتهاد و وەلانانی لاسایی كردنەوەدا، ڕێیەكی هاوسەنگی گرتەبەر كە دەڵێ: (وتقلید العاجز عن الاستدلال للعالم یجوز عند الجمهور)[2]. واتە: وە لاسایی كردنەوە - تقلید-ی یەكێك كە بێ توانایە لە بەڵگە هێنانەوەدا، بۆ زانا دروستە لەلای زۆربەی زانایان.

وە دەڵێ: (واتباع شخص لمذهب شخص بعينه لعجزه من معرفة الشرع من غير جهته انما هو مما يسوغ له ليس هو مما يجب على كل أحد اذا امكنه معرفة الشرع بغير ذلك الطريق، بل كل احد عليه ان يتقي الله ما استطاع، ويطلب علم ما أمر الله به ورسوله، فيفعل المأمور، ويترك المحظور، والله اعلم)[١].

واتە: بەدواکەوتن -اتباع-ی یەکێك بۆ مەزهەبی یەکێکی تایبەت بەهۆی ئەوەوە کە نەتوانێ شەرع لە کەسێکی دیکە وەربگرێ و بیزانێ، ئەوە ڕێ بەو دەدرێ، بەڵام ئەوە لەسەر هەموو کەس پێویست نابێ، ئەگەر بتوانێ شەرع لە ڕێیەکی دیکەوە وەربگرێ، بەڵکو هەموو کەسێك پێویستە لەسەری بەپێ ی توانا پارێز لە خوا بکات، وە ئەو زانیارییەی خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان پێ کردوە، داوابکات، وە ئەوەی فەرمانی کردنی دراوە بیکا و، ئەوەی قەدەغەشکراوە نەیکات، خواش زاناترە.

دەربارەی هۆ و پاساوەکان کە دروستە زانا و پێشەوا تەقلید بکات، (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ: (بۆ ئەو حوکمانەی زۆر لە خەڵکی نایانزانن، دەگەڕێنەوە بۆ لای یەکێك -ی شارەزا- کە فێریان بکات، چونکە ئەو کەسە زاناترە بەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیڵێ و مەبەستیەتی، پێشەوا و زانایانی مسوڵمانان کە خەڵك دوایان کەوتوون هۆکار و بەڵگەی نێوان خەڵك و پێغەمبەرن(صلى الله عليه وسلم)، ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموێ ئەوان بەخەڵکی ڕادەگەیەنن و لە مەبەستەکان تێیان دەگەیەنن، ئەوەش بەپێی توانای زانستی و ئیجتهادی خۆیان. بێگومان خوای زانا زانایەك شارەزا دەکات بە زانیارییەك کە لای یەکێکی دیکە نیە، کە لەوانەیە زانیاری مەسەلەیەکی دیکە لای یەکێکی دیکە هەبێ، کە لای ئەمیان نەبێ)[٢].

دەربارەی بۆچوون و تێڕوانینی خەڵك و مەزهەبەکانیان لەسەر ئیجتهاد و تەقلید، (شیخ الإسلام) دەڵێ: (من غالبية المتكلمة والمتفقهة من يوجب النظر

والإجتهاد في المسائل الفرعية على كل احد حتى على العامة، وهذا ضعيف لأنه لوكان طلب علمها واجبا على الأعيان فانما يجب مع القدرة، والقدرة على معرفتها من الأدلة التفصيلية تتعذر أو تتعسر على أكثر العامة. و بازائهم من أتباع المذاهب من يوجب التقليد فيها على الجميع من بعد الأئمة: علمائهم و عوامهم، والذى عليه جماهير الأمة ان الإجتهاد جائز في الجملة، والتقليد جائزفى الجملة، ولايوجبون الإجتهاد على كل أحد و يحرمون التقليد، ولا يوجبون التقليد على كل احد ويحرمون الإجتهاد، وأن الإجتهاد جائز للقادر على الاجتهاد، والتقليد جائز للعاجز عن الاجتهاد)[1].

واتە: هەندێك لە تێپەڕێنەران لە زانایانی کەلام و لەشەرعزانان تێڕامان و ئیجتهاد لە مەسەلە فەرعییەکان دا لەسەر هەموو کەسێك بە پێویست دەزانن، هەتا لەسەر خەڵکی نەخوێندەواریش، کە ئەمە رایەکی لاوازە، چونکە ئەگەر ئەو زانینە لەسەر هەموو کەسێك واجب بێت، ئەو واجب بوونە لەگەڵ توانا هەبوونە، بە زانیاری لەبارەی سەرچاوە و بەڵگە شەرعییەکانەوە و بێگومان ئەوەش نەك هەر قورس بگرە زۆر زەحمەتە بۆ زۆربەی خەڵکی گشتی.

ئنجا لەبەرانبەر ئەو رایەدا کە باسمان کرد، بەپێچەوانەوە هێندێك لەوانەی بەدوای مەزەب کەوتوون، لاسایی کردنەوە و تەقلید لەسەر هەموو کەس بە پێویست دەزانن، لەدوای پێشەواکان، زاناکان و خەڵکی دیکەش، بەڵام ئەوەی جەماوەری ئوممەت لە زانایان لەسەریەتی ئەوەیە کە بە شێوەیەکی گشتی ئیجتهاد دروستە و تەقلیدیش بە شێوەیەکی گشتی دروستە، زانایان ئیجتهاد بە پێویست نازانن لەسەر هەموو تاکێك و تەقلید حەرام بکەن، وە تەقلیدیش بە واجب نازانن لەسەر هەموو کەسێك و ئیجتهاد حەرام بکەن، بەڵکو ئیجتهاد دروستە بۆ کەسێك کەتوانای ئیجتهادی هەبێ، تەقلیدیش دروستە بۆ یەکێك توانای ئیجتهادی نەبێ.

(إبن تيمية) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، ئەوەی هەڵبژاردوە کە لەگەڵ بەڵگە و دەلیل بێ لەهەر کوێ بێ، وە لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت دا دەهات و دەچوو، لە عەقیدە و حوکمەکانی حەلاڵ و حەرام و.. هتد دا، بێ ئەوەی پابەندبێ بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە، وەك دەڵێ: (من لە ژیانمدا تا ئەم کاتەی ئێستام هیچ کەسێکم بانگ نەکردوە لە بنچینەکانی دیندا بۆ پابەندبوونی بە مەزهەبی حەنبەلییەوە، یان بۆ غەیری حەنبەلیی، پشتی ئەوەش ناگرم و لە قسەکانیشم دا باسم نەکردوە، شتێك ناڵێم جگە لەوەی پێشینی چاك و پێشەوایانی ئومەت لەسەری کۆکن، زیاد لە جارێك پێم گوتن: من سێ ساڵان مۆڵەتی ئەو کەسە دەدەم کە پێچەوانەی ڕایەکانی منە، ئەگەر یەك پیتی هێنا لە یەکێك لە پێشەوایانی سێ سەدەکان و پێچەوانە بێ لەگەڵ ئەوەی من گوتوومە، ئەوە دانی پێدا دێنم و دەیسەلمێنم، بەلام ئەوەی من دەیلێم ئەوەیە کە پێشەوایانی سێ سەدەکە گوتوویانە بە لەفز و وشەی خۆیان و لەفزی ئەو کەسەی کۆدەنگی ئەوانی گواستۆتەوە لە تێکڕای کۆمەڵەکان[1].

وە لە پێناو هاتنەدی ئەوەدا چەندان خوێندنگای کردوونەوە و دەرسی گوتوونەوە و وتاری داون، وە ڕێی بە عەقڵەکان داوە باس و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ئەنجام بدەن و، لە دەرگای داخراوی ئیجتهاد بدەن و بیکەنەوە، وە لەو بارەوە بگەنە ئەو شوێنەی دەشێ عەقڵی بەشەر پێ ی بگات، لە کاتێکدا (شیخ الإسلام) دەور و قورسایی عەقڵی لە شەرعدا دیاری کردوە، بەلام بە شێوەیەکی هاوسەنگ و بێ بەزایەدان و تێپەڕاندن -إفراط وتفريط- نەك وەك کەسانێك کە دەربارەی عەقڵ تێیانپەڕاندوە و بە ئەسڵیان داناوە و، شەرعیش بەفەرع و پاشکۆی ئەو، بە پێچەوانەوە خەڵکێکیش عەقڵیان وەلاناوە و هیچ بەهایەکیان بۆ دانەناوە، بەلام (شیخ الإسلام) بە پێ ی خۆی هەقی پێداوە و ڕێزی لێ ناوە، کە عەقڵ هەموو شتێك نیە و، ناکرێ هیچ حیسابیشی بۆ نەکرێ، وەك دەڵێ: (العقل شرط في معرفة العلوم، و كمال وصلاح الأعمال، وبه يكمل العلم والعمل، لكنه ليس مستقلا بذلك، فهو غريزة في النفس، وقوة فيها بمنزلة قوة

---

(١) مجموع الفتاوى ٣/٢٢٩.

البصر التي في العين، فان اتصل به نور الإيمان والقرآن، كان كنور العين اذا اتصل به نور الشمس)[١].

واتە: (عەقڵ مەرجی زانینی زانیارییەکان و چاکیی و تەواویی کردەوەکانە، وە بە عەقڵ زانیاری و کردەوەکان تەواو دەبن، بەڵام لەوبارەوە سەربەخۆ نییە، عەقڵ غەریزەیەکە لە نەفس دا و هێزێکە، لە شوێنی هێزی بینینە لە چاودا، ئەگەر ڕۆشنایی ئیمان و قورئان پەیوەندیی بە عەقڵەوە کرد، ئەوە وەك ڕۆشنایی چاو وایە ئەگەر ڕۆشنایی خۆر پەیوەندیی پێوە بکا. وە هەر سەبارەت بە عەقڵ دەڵێ: (لكن المسرفون فيه قضوا بوجوب أشياء وجوازها وامتناعها، لحجج عقلية بزعمهم اعتقدوها حقا وهي باطل، وعارضوا بها النبوات وما جاءت به، والمعرضون عنه صدقوا بأشياء باطلة، ودخلوا في أحوال واعمال فاسدة، وخرجوا عن التمييز الذى فضل الله به بني ادم على غيرهم، وقد يقترب من كل من الطائفتين بعض أهل الحديث تارة بعزل العقل عن محل ولايته، وتارة بمعارضة السنن به)[٢].

واتە: ئەوانەی زیادەڕۆیی دەکەن دەربارەی عەقڵ و بڕیاری واجب بوون یان دروستی یان قەدەغەبوونی هێندێك شت دەدەن، بە گومانی خۆیان لەبەر چەند بەڵگەیەکی عەقڵی کە بەڕاستیان دەزانن، بەڵام پووچن، بەو بەڵگانە دژایەتیی پێغەمبەرایەتیی و ئەوەی پێ ی هاتووە، دەکەن.

ئەوانەش کە دژایەتیی عەقڵ دەکەن، باوەڕ بە شتی پووچ دێنن و کەوتوونەتە کاروکردەوە و حاڵ و وەزعی هەڵە و ناڕاستەوە و لەو جیاوازی و پلەو ئیمتیازە،چوونە دەرێ،کە خوا نادەمیزادی پێ بەرز کردۆتەوە بەسەر غەیری خۆیدا کە - عەقڵە- وەلەوانەیە زۆرجار هێندێك لە (ئەهلی حەدیس)یش لەو دوو ڕاو بۆچوونە - لەسەر عەقڵ- نزیك ببنەوە، جارێکیان بە لادانی عەقڵ لە شوێن و پلەی خۆی و، جارێکیش بە عەقڵ دژایەتیی کردنی سوننەتەکانی ژیان.

---

(١) مجموع الفتاوى ٣/٣٣٨.

(٢) مجموع الفتاوى ٣/٣٣٩.



**چوار: بواری جەنگ و جیهاد:**

(شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، گرنگیی زۆری بەو لایەنە داوە، کە لە ئیسلامدا جیهاد و بەرەنگاربوونەوەی ستەمکار و دوژمنانی ئیسلام، لە پێناو بەرقەراریی حوکمی خواو لابردنی ستەم و چەوساندنەوەدا، پلە و پایەیەکی گەورەی هەیە، بەتایبەتی لەو هەلومەرج و قۆناغەدا کە ئەوی تێدا ژیاوە و ئوممەتی ئیسلامیی تووشی هێرشی یەك لەدوای یەکی (تەتار) و صەلیبییەکان و هاوپەیمانانیان لە (اهل الجبل) و (نصیریە شیعەکان) بوو بوو، وەسەرو ماڵ و نامووسی مسوڵمانان کەوتبۆ بەر هەرەشەی دوژمنان، بۆیە زۆر باسی پاداشتی موجاهیدان و ئەوەی خوا بۆ شەهیدانی ئامادە کردوە، دەکرد. وێڕای ئەوەی خۆشی بەکردەیی بەشداریی لە جیهاد و جەنگ دژی لەشکری (تەتار) دا کردوە و بەقسە و بەکردەوە بێ باکانە و پشت ئەستوور بەخوا، ئەوەی لەدەستی هاتبێ کردوویەتی، و ویستوویەتی لە بەرنامەی کاری ئیسلامیی دا گشتگیرانە رەفتار بکا و بڕوانێتە هەموو لایەنەکانی و هیچ لایەنێك فەرامۆش نەکات. یەکێك لەو هەڵوێستە جوامێرانەی ئەوە بوو کاتێك ساڵی (٦٩٩)ی کۆچی سوڵتانی تەتار(قازان) هێرشی کردە سەر دیمەشق و مسوڵمانانی کوشتن و خستنە سەغڵەتیی یەوە و لێ ی بەدیل گرتن، (شيخ الإسلام) لەگەڵ چەند زانا و کەسایەتییەك چۆتە لای (قازان) و زۆر بەتوندیی و بێ باکانە قسەی لەگەڵ کردوە و داوای لێ کردوە کە ئازاری مسوڵمانان نەدات و نیشتمانیان چۆڵبکا و دیلەکانیان بەربدات، کە یەکێك لە قسەکانی ئەوە بووە کە بە تەرجومانەکەی گوتوە (بە (قازان) بڵێ: تۆ وادەزانی مسوڵمان و زانا و قازی دیندارت لەگەڵن و هاتووی وڵاتمان داگیر دەکەی؟ باب و باپیرت کە کافر بوون، بەڵام ئەوەی تۆ دەیکەی ئەوان نەیانکردوە، ئەوان کە وەعدیان دابایە دەیانبردە سەر، بەڵام تۆ وەعدت دا و نەتبردە سەر و ئەوەی گوتت جێ بەجێت نەکرد). دوایی قازان قسەکەی لێ وەرگرت و خەڵکێکی زۆری ئازاد کرد.

(قاضي القضاة ابوالعباس) کە لەو سەردانەی (شیخ الإسلام) بۆ لای (قازان) لە گەڵدابووە دەڵێ: کە چووینە لای (قازان) کاتێك خواردنیان بۆ هێناین، هەموومان خواردمان جگە لە (إبن تیمیة) پێیان گوت بۆ ناخۆی؟ (شیخ الإسلام) گوتی: چۆن خواردنی ئێوە بخۆم کە گۆشتەکەی مەڕی خەڵکە تاڵانتان کردوە و، بە ئاگرێك لێتان ناوە کە دار و درەختی خەڵکی یەو بە زوڵم بڕیوتانە و ئاگرتان پێکردۆتەوە.

## پێنج: بواری خوو و ڕەوشت (اخلاق):

(شیخ الإسلام) هاوەڵەکانی هەڵدەنا و هان دەدا بۆ خۆڕازاندنەوە بە خووڕەوشتی بەرزی ئیسلامیی، لە سنگ فراوانیی و لێبوردەیی و هەڵس و کەوت و مامەڵە کردنی باش لەگەڵ خەڵکی دا، و سوور بوون لەسەر یەکبوونی مسوڵمانان و یەکخستنی دڵەکان و یەکدەنگیی و.. ئەو گشتگیریی (شمولیی) یەی (شیخ الإسلام) لە بەرنامەی کاری بانگەوازی خۆی دا پیادەی کردوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خوای بەخشەر چاکەی خۆی بەسەردا ڕشتوە و دوور بینیی و تێگەیشتنی زۆر و فراوانی ئاسۆی بیر و هۆشی پێ بەخشیوە کە شایستەی ئەوەبێ نوێکەرەوەی تێگەیشتن لە دین بێ لەسەدەی هەشتەمی کۆچی دا.



## دووەم: کاری بە کۆمەڵ و فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و شوێنیان لە بەرنامەی چاکەخوازیی (شیخ الإسلام) دا:

بێگومان فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە کاکڵی خواپەرستییە، پێناسەی تەواویش بۆ خواپەرستیی بریتی یە لە: کردنی هەرشتێك کە خوا پێی خۆش بێ لە قسە و کردەوەکان، وە سەرەنجام خوا پەرستیی ئەو ئامانجەیە کە خوا ئینسانی لە پێناودا دروستکردوە و ئەو ئەمانەتەیە ئاسمانەکان و زەوی و شاخەکان دەستەوستان بوون و نەیانتوانی هەڵی بگرن و ئینسان هەڵیگرت، وە لەبەر ئەوەی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە گرنگیی خۆیان هەیە، مەودایەکی گەورەی لە بەرنامەی بانگخوازیی ئەودا داگیر کردوە، وە لەمەولا ئەو گرنگیی پێ دانەی لە میانی قسە و هەڵوێستەکانی دا زەق دەکەینەوە:

### ١- گرنگی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە:

(شیخ الإسلام) دەڵێ: (ئەگەر چاك بوونی بەندەکان، بە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە بێ، ئەوە چاکبوونی ژیان و بەندەکان، لە فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) دایە، کە ئەمەش نایەتە دی مەگەر بە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە، وە هەر بەویش ئەو ئۆممەتە - ئوممەتی ئیسلام- بۆتە باشترین ئۆممەت کە بۆ خەڵکی پەیدا بوون، خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ .. ﴾

ال عمران (١١٠).

وە دەفەرموێ:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ ال عمران (١٠٤).

وە دەفەرموێ:

﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ التوبه(٧٩).

وە دەربارەی بنی ئیسرائیل دەفەرموێ:

﴿ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾ المائدة (٧٩).

وەدەفەرموێ:

﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾ الاعراف (١٦٥).

لێرەدا خوای بەرز و مەزن هەواڵ دەدا کە کاتێك عەزابی خوا دابەزیوە، ئەوانەی رزگارکردوون و نەجات داون، کە ڕێگرییان لە خراپە کردوە و، ستەمکارانیش -کە خراپەیان کردوە و ڕێگر نەبوون لە خراپە سزا و عەزابێکی بە ئێشی داون[1].

وە دەڵێ: (ئاشکرایە کە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و تەواو کردنی بە جیهاد، لە گەورەترین چاکەکانە کە خوا فەرمانی پێ کردووین، وەك گوتراوە: (لیکن أمرك بالمعروف ونهيك عن المنكر لا بالمنكر)، واتە: با فەرمانکردنت بەچاکە بەشێوەیەکی چاك بێ و ڕێگرییت لە خراپە بە شێوەیەکی خراپ نەبێ.

جا ئەگەر فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە لە گەورەترین واجب و شتە پەسەندکان بێ، پێویستە واجب و شتە پەسەندەکان بەرژەوەندییان تێدا ڕەچاویکرێ و باوبدرێ بەسەر زیان و خراپەدا، چونکە پێغەمبەران (عليهم السلام) هەر بۆ ئەو مەبەستە نێردراون و کتێبەکانیش هەر بۆ ئەوە هاتوونە خوار و، خوای دادگەر خراپەی خۆش ناوێ (والله لايحب الفساد) و هەرچی فەرمانی پێ دەکات چاکەیە[2].

---

(١) مجموع الفتاوى ٣٠٦/٢٨.

(٢) مجموع الفتاوى ١٢٦/٢٨.



## ٢- پلەکانی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە:

(شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لەو بارەوە دەڵێ: (هێندێك جار فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە بەدڵ دەبێ و، هێندیك جاریش بە زمان و، هێندێك جاریش بە دەست دەبێ، ئەوەی بە دڵ دەکرێ، پێویستە هەموو کاتێك هەبێ، چونکە لە کردنیدا هیچ زیانێك روونادات، وە ئەوەی نەیکا ئیماندار نیە، وەك پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ (وذلك أضعف الإیمان)، لێرەدا دوو جۆر لە خەڵکی بە هەڵەدا دەچن:

### جۆری یەکەم:

ئەوەی کە پێویستە لە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە وازی لێ دێنن، کە ئەم ئایەتە تەئویل دەکەن، وەك (ابوبکر الصدیق) (ڕەزای خوای لێبێت)، لە وتارێکیدا دەڵێ: ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە:

﴿عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ﴾ المائدة (١٠٥).

واتە: ئاگاتان لە خۆتان بێ ئەگەر ئێوە رێ ی راست بگرن ئەوەی سەر گەردان و رێ لێ تێکچووە، زیانتان پێ ناگەیەنن. بەڵام ئێوە لە شوێنی خۆی دا داینانێن، وە من گوێم لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە دەیفەرموو:

(ان الناس اذا رأوا المنكر فلم يغيِّروه، أوشك ان يُعِمَّهم الله بعقاب منه)

واتە: ئەگەر خەڵکی خراپەیان بینی و هەوڵی گۆڕینیان نەدا، نزیکە خوا هەموویان تووشی سزابکات.

### جۆری دووەم:

یەکێك کە بیەوێ فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە بکات بەزمانی یان بە دەستی بە شێوەیەکی رەها، بەبێ تێگەیشتن و نارامیی و تێڕوانین، لەوەدا کەچی باشە و دەگونجێ و چی ناگونجێ، وە ئایا توانای بەسەری دا هەیە، یان توانای بەسەری دا نیە، دەست دەکا بە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و قەناعەتی وایە لەو رووەوە فەرمانبەریی خوا و پێغەمبەری خوای (صلی الله

علیه وسلم) کردوە، لە کاتێکدا کە سنورەکانی شکاندوون[1].

### ٣- چۆنیەتی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە :

(شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: سەرەتا و بەر لە هەرشتێك پێویستە زانیاری هەبێ بە چاکە و خراپە و جیاوازیی نێوانیان، وە پێویستە زانیاری ببێ بەوەی فەرمانی پێ دەکرێ و ڕێگریی لێ دەکرێ، وە چاك وایە بە ڕێیەکی ڕاست و ڕوون فەرمان و ڕێگرییەکە بکات، کە نزیکترین ڕێ ی گەیشتنە بەمەبەست، وە پێویستە لەوەدا نەرمیی و بەزەیی بنوێنێ، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(ماکان الرفق في شيء الا زانه، ولا کان العنف في شيء الاّ شانه)[2].

واتە: نەرمیی و نیانیی لە هەرشێکدابێ جوانی دەکاو، توندوتیژییش لە هەرشتێکدابێ، ناشیرینی دەکات، وەدەفەرموێ:

(ان الله رفيق يحب الرفق فى الأمر كله، و يعطي عليه ما لا يعطى على العنف)[3]

واتە: خوا نەرم ونیان و بەبەزەییە و نەرم و نیانیی لە هەموو شتێك دا خۆش دەوێ، وە ئەوەی بەهۆی نەرم و نیانیی یەوە دەیدات بە هۆی توندوتیژیی یەوە نایدات.

هەروەها پێویستە زۆر هێمن و ئارامگربێ لەسەر ئازار و ناخۆشییەکان، چونکە بێگومان ئینسان لەو ڕێیەوە تووشی ناخۆشیی دەبێ، خۆ ئەگەر هێمن و ئارامگر نەبێ، ئەوەی خراپی دەکا زۆرتر دەبێ لەوەی چاکی دەکات، وەك لوقمان بە کوڕەکەی خۆی گوت، کە خوا بۆمان دەگێڕێتەوە:

﴿ وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ وَاصْبِرْ عَلَىٰ مَا أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾

لقمان (١٧)



واتە: وە فەرمان بکە بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە بکە و ئارامگربە لەسەر ئەوەی تووشت دێت، کە ئەوە لەو کارانەیە کە پێویستی بە عەزم و ئیرادەی بەهێزە، هەر بۆیە خوا فەرمانی ئارامگرتنی بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کردوە کە پێشەوایانی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپەن، کەواتە بۆ فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە، ئەو سێ شتە پێویستن:

**أ- زانیاری:** پێش فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە.

**ب- بەزەیی و نەرم و نیانی:** لەکاتی فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگریی لە خراپەدا.

**ج- ئارامگرتن:** دوای ئەنجامدانی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە.

هەرچەندە دەشگونجێ هەرسێکیان لەیەك کاتدا بەیەکەوە کۆببنەوە.

## ٤- کاری بە کۆمەڵ، دیمەنێکە لە دیمەنەکانی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە:

کاری بە کۆمەڵ شتێکی پێویستە بۆ ئەنجامدانی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە و بانگەواز بۆ لای خوا، وە هیچ مسوڵمانێك ئەوەی پێویستە بۆی ناکرێ بۆ بەرزکردنەوەی وشەی خوا مەگەر لەگەڵ کۆمەڵێکی ئیمانداردا بیکا، لەو بارەوە (شیخ الإسلام) دەڵێ: (پێویستە بزانرێ کە سەرپەرشتیی کردن و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی لە گەورەترین پێویستییەکانی دینە، بەڵکو کاری دینیی و دنیایی بەو نەبێ ڕاوەستاو و مەیسەر نابێ، وە خەڵك بەرژەوەندییەکانیان نایەنە دی مەگەر بە کۆك بوون و کۆبونەوەیان، لەبەر پێویستی هێندێکیان بە هێندێکیان، وە پێویستە لەکاتی کۆبونەوەیاندا، سەرێکیان هەبێ، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(اذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم) [1] رواه ابوداود.

واتە: ئەگەر سێ کەس چوونە سەفەرێ، بایەکێکیان بکەنە گەورەی خۆیان لە

نێوخۆیاندا. وە ئیمام (احمد) لە (مسند)ی خۆی دا لە (عبدالله بن عمرو) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(لايحل لثلاثة يكونون بفلاة من الأرض الاّ أَمَّروا عليهم أحَدَهم).

واتە: دروست نیە سێ کەس لە دەشت و دەر - یان سەفەر- بن، مەگەر یەکێکیان لەسەرخۆیان بکەن بە بەرپرس و براگەورە .

لێرەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە کۆمەڵێکی کەمدا و لەسەفەرێدا پێویستی کردوە کە یەکێکیان بەرپرس بێ، کە ئەوە ئاگادارکردنەوەیە بۆ هەموو کۆمەڵ بوونێك، کە زیاتر و گەورەتر بێ، چونکە خوای کاربەجێ فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپەی واجب کردوە، ئەوەش بە هێز و دەسەڵات و کۆمەڵبوون نەبێ نایەتەدی[1].

## ٥- داکۆکیی کردنی ئیسلام لەسەر کاری بە کۆمەڵ، لە هەموو حاڵەتەکان دا :

باشترین کردەوە لە هەموو کاروبارەکاندا ئەوەیە کە بە کۆمەڵ بێ، ئەوەتا نوێژی بە کۆمەڵ خێری زیاترە لە نوێژی بە تەنیا، حەج لەگەڵ مسوڵمانانی زۆر دەکرێ، نوێژی جومعە بە کۆمەڵ نەبێ دروست نیە، هەرچەندە لێپرسینەوە لەسەر تاعەتەکان و سەرپێچییەکان تاکە کەسیین، بەڵام کە کارێکی خێر بە کۆمەڵ بکرێ، چاکە و پاداشت زیاد دەکا، کە ئەوە گەورەیی کۆمەڵبوون دەگەیەنێ لە ئیسلامدا. ئەگەر بە وردیی تەماشای هەموو عیبادەتەکان بکەین، مەسەلەی کۆمەڵبوون بە ئاشکرا هەستی پێ دەکرێ وە مەسەلەی کۆمەڵبوون لەوە فراوانترە کە بەتەنیا لە خواپەرستییەکاندا بێ، بەڵکو ئەوە سوننەتێکی خوایە لە دروستکراوەکان دا، شتێکە بەرژەوەندیی دین و دنیا دەیخوازێ، هەربۆیە گیانی کۆمەڵبوون ئاشکرایە لە هەڵس و کەوتەکان و عاداتەکاندا، لەوبارەوە (شیخ الإسلام) دەڵێ: (وەچەی ئادەم لە دنیا و قیامەتدا بەرژەوەندییەکانیان نایەنە

---

(١) مجموع الفتاوى ٣٩٠/٢٨.



دی بە کۆمەڵبوون و یارمەتی و پشت گرتنی یەکدی نەبێ، یارمەتی دانی یەکدی بە مەبەستی وەدەستهێنانی سوود و قازانج و پشتی یەکدی گرتنیش لە پێناو لادانی زەرەر و زیانیان، هەر بۆیە گوتراوە: ئینسان بە سروشت -مدنیی- شارستانیی یە، ئنجائەگەر کۆبوونەوە دەبێ کارێك بکەن کە بەرژەوەندییەکی پێ وەدەست بێنن، هێندێك کاریش لێ ی دوور دەکەونەوە کە خراپەی تێدایە بۆیان، گوێ رایەڵن بۆ فەرمانی یەکێکیان بە کردنی ئەو ئامانجە چاکانە و نەکردنی ئەو شتە خراپانە، کە هەموو وەچەی ئادەم فەرمان بە کردن و نەکردنی شت دەکات لە ژیانی دا[1].

### ٦- هەبوونی بەرپرس (الإمارة) پایەیەکە لە پایەکانی کاری بە کۆمەڵ:

کۆمەڵ بوون بەبێ بەرپرس و سەرکردە نایەتە دی، ئەمە سوننەتێکی خوایە لە هەموو دروستکراوەکانی دا، سەبارەت بە دیاری کردنی بەرپرسان و کاربەدەستان لەسەر خەڵکی و شێوازی رەفتاریان و کار و پیشە و دەسەڵاتیان کە بەرپاکردنی دادپەروەرییە لە نێو خەڵکی دا، (شیخ الإسلام) لە زۆر شوێن دا باسی ئەو مەسەلەیەی کردوە، جا نەگەر هەبوونی گەورە و سەرکردە یان پێشەنگ، سوننەتێکی خوایی بێ، بۆ هەموو دروستکراوەکانی خوا هەر لە مەڕ و ماڵاتەوە کە بەدوای یەکێکیان دەکەون و رێ دەگرنە بەر، تا ماسییەکان لە دەریا دا و باڵندەکان لە ئاسمان و هەنگ لە (خەڵێف) و مێروو لە شانە مێرووڵەدا و هتد.. کە بەپێی ئەو سوننەتە و بەهۆی هەبوونی گەورەیەك کارەکانیان رادەپەڕێنن، بە هەمان شێوە دەبێ ئەو سوننەتە کەونیە لەسەر ئینسانەکانیش جێ بەجێ ببێ، بە هەموو رەنگ و زمان و مەزهەبەکانەوە، کە پێویستە هاوکاریی و پشتگرتنی یەکدی هەبێ، بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ فەرمانکردن -أمر- و رێگریی کردن -نەهی، - هەبێ، کە پایەی هەبوونی سەرکردە و ئامانجی دانانی فەرماندەیە.

(شیخ الإسلام) لەو بارەوە دەڵێ: (هەموو ئینسانێك لەسەر زەوی (ئەمر و نەهی) هەیە و دەبێ فەرمان بە کردن و نەکردن بکات، تەنیاش بێ، فەرمان بە نەفسی خۆی دەکات بە کردن یان نەکردن، بە چاکە یان بە خراپە، وەك خوای مەزن دەفەرمووێ:

﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ﴾ یوسف(٥٣).

وە وەچەی ئادم بە کۆبوونەوە و کۆمەڵبوونیان لەگەڵ یەکدی نەبێ، ناژین، جا ئەگەر دوو کەس یان زیاتر بەیەکەوە کۆبوونەوە، دەبێ یەکێك لەوانە گەورە بێ و فەرمانی هەبێ، بە کردن یان نەکردن، هەربۆیە کەمترین نوێژی بەکۆمەڵ دوو کەسە، وەك گوتراوە (دووکەس بەسەرەوە دەبێتە نوێژی بە کۆمەڵ)، بەڵام لە کاروباری دیکەی رۆتینی دا لە سوننەتدا هاتوە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرمووێ: (دروست نیە سێ کەس لە سەفەرێ دا بەرپرسێکیان نەبێ)[1].

## ٧- گوێ رایەڵیی و فەرمانبەریی پایەی دووەمی کاری بە کۆمەڵ:

ئەگەر هەبوونی بەرپرس بنچینە بێ بۆ کاری بە کۆمەڵ و کۆمەڵبوون، کە فەرمانبەری بۆ نەکرێ، پاساوی بوونی نامێنێ، فەرمانبەرییش لە شەریعەتی ئیسلام دا تەنیا لە شتی چاکە دایە، وە لە بارەی واجب بوونی فەرمانبەریی بۆ سەرکردە و براگەورە حەدیسی زۆر هەن، جا چ لەسەفەردا بێ، کە کردەوەکانی بانگەوازی بۆ هاتنە دی فەرمانبەریی خوا، لەسەر قیاس دەکرێن، یان لە غەیری سەفەردا بۆ ئەوەی هەموو کار و بارەکان لەسەر یەك ڕاو ڕچە برۆن، لەگەڵ ئەوەشدا ئایەت و حەدیس زۆرن لەسەر واجب بوونی فەرمانبەریی ئەمیر لە کردەوە بانگخوازییەکاندا، لەوبارەوە (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (کاربەدەستان: ئەوانەن کە خاوەنی فەرمانن، وە ئەوانەن کە فەرمان بەسەر

---

(١) مجموع الفتاوى ٢٨/ ١٦٨ - ١٦٩.



خەڵکی دا دەکەن، کە ئەمە (دەسەڵاتدار و بەتواناکان و ئەوانەی زانا و شارەزان) تێیاندا بەشدارن.

کەواتە کاربەدەستان دوو چین و توێژن: زانایان و حوکمڕانان، جا ئەگەر ئەوان چاك بن، خەڵکیش چاك دەبن، ئەگەر خراپیش بن خەڵکیش خراپ دەبن، وە هەر کەسێك خەڵکی دوای بکەوێ، ئەوە کاربەدەستە، جا پێویستە هەریەك لەوانە فەرمان بە شتێك بکا کە خوا فەرمانی پێ کردوە، وە ڕێگریی و پێشگیریی لە شتێك بکا کە خوا ڕێگریی لێ کردوە، وە لەسەر ئەوانەش پێویستە کە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی دەکەن فەرمانبەریی لە شتێکدا بکەن کە فەرمانبەریی خوای تێدایەو، لە پێچەوانەی فەرمانی خوادا گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی نەکەن[١].

**(شیخ الإسلام) بە کردەوە کاری بە کۆمەڵی کردوە:**

هەر کەسێك بە وردیی ژیانی (شیخ الإسلام) بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە ئەو هەر بەلایەنی تیۆریی و دانانی بەرنامە و بنچینەکانی شەرعیی بۆ کاری بە کۆمەڵ و، باسکردنی لایەنە باش و جوانەکانی و داکۆکیی کردنی ئیسلام لەسەر ئەوشتانە، وازی نەهێناوە، بەڵکو بەکردەوە سەرکردەی کۆمەڵێك بووە، کە ئەو کۆمەڵە بە قسەی کردوە و بە ڕاوێژی ئەو کاری کردوە و لە خۆشیی و ناخۆشییەکاندا لەگەڵی دا ژیاون، لە نامەیەکدا کە لە بەندیخانەی (اسکندریة) وە ئاراستەی کۆمەڵەکەی کردوە دەڵێ: (... من خۆشیی و کامەرانییم بۆیان دەوێ و ئەو نیعمەتانەی چاویان پێیان ڕووناك دەبنەوە، وە دەمەوێ دەرگای ناسینی خوایان بۆ ببێتەوە، وێڕای فەرمانبەرێتیی خوا و تێکۆشان لە ڕێی ئەودا، کە پێ ی دەگەنە بەرزترین پلەکان[٢].

وە دەڵێ: (مەبەستم هەواڵ دانە بە کۆمەڵ و جەماعەتەکەم کە ئیستا نیعمەتەکانی خوا لەسەرمان زۆر زیاترن لە پێشوو، وە سوپاس بۆ خوا نیعمەتەکانی

ئەو بۆ ئێمە لە زیاد بووندان، وە ئەگەر نەشگونجێ پێیان بگەم و لە نزیکەوە خزمەتی جەماعەت بکەم، ئەوە بە شەو و بە رۆژ دووعایان بۆ دەکەم، کە بەرانبەر هەقی ئەوان کەمێك بە ئەرکی خۆم هەستاوم، وە بەمەبەستی نزیك بوونەوە لە خوا، کە بەرانبەر بەوان دەیکەم[1].

ئنجا (شیخ الإسلام) ڕێنماییان دەداتێ و ئەمریان پێ دەکاو دەڵێ: (والذي أأمر به کل شخص منهم أن یتقي الله ویعمل لله مستعینا بالله، مجاهدا في سبیل الله، ویقصد بذلك ان تکون کلمة الله هی العلیا، وأن یکون الدین کله لله، ویکون دعاؤه وغیره بحسب ذلك کما أمرالله به ورسوله)[2].

واتە: وە ئەوەی من فەرمانی بە هەموو کەسێك لەوان پێ دەکەم، ئەوەیە کە پارێز لە خوا بکا و کار بۆ خوا بکا و داوای یارمەتی لە خوا بکا، تێکۆشەربێ لەرێی خوا، مەبەستی بەس ئەوەبێ، کە وشەی خوا بەرز بێ، وە ملکەچیی تەنیا بۆ خوابێ، وە دووعاو پاڕانەوەی و شتی دیکەی بەو شێوەیەبێ، کە خوا و پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمانیان پێ کردوە.

## ٨-جەماعەتی (شیخ الإسلام) هێندێك جار لابردنی خراپەیان بە دەست جێ بەجێ دەکرد:

زانای گەورە (ابن کثیر) لە ڕووداوەکانی ساڵی (٦٩٩)ی کۆچی دا دەڵێ: (لە بەرەبەیانی ڕۆژی جومعەی (١٧)ی (ڕەجەب) ی ئەوساڵەدا (شیخ الإسلام) و هاوەڵەکانی بەسەر شەراب فرۆش و نادی و شوێنی خراپیان دادا و قاپ و گۆزە و کووپەی شەڕابیان لێ شکاندن و شەڕابەکانیان ڕشتن و خاوەنەکانیان - کە ئەو کارە خراپەیان دەکرد- تەمبێ کردن و سزایان دان، کە خەڵك بەو ڕەفتارەی (شیخ الإسلام) و هاوەڵانی زۆر دڵخۆش بوون)[3].

---

(١) مجموع الفتاوی ٤٤/٢٨.

(٢) مجموع الفتاوی ٤٤/٢٨ - ٤٥.

(٣) البدایة والنهایة ١٦/١٤.



ئەوە دەقێکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە (شیخ الإسلام) خۆی و هاوەڵانی بە دەستی خۆیان سزای خەڵکێکی سەرپێچی کار و خراپەکاریان داوە و تەعزیریان کردوون، وە ئەو کارەیان سەلمێنەری ئەوەیە کە (شیخ الإسلام) کۆمەڵ و یارمەتیدەر و پشتیوانانی خۆی هەبوون، کە بەدوای کەوتوون و فەرمانیان جێ بەجێ کردوە، بێگومان هەموو خەڵك بەوەی (شیخ الإسلام) دەیکرد ڕازی نەبوون، کە وایاندەزانی ئەو تەنها زانایەکە وەك چاودێرێك و، لە دەوڵەتدا فەرمانبەر نیە و سەر بە هیچ ئەمیرێکیش نیە، چۆن ئەو کارانە دەکات؟ هەر بۆیە لەو زانایانەی لە رووی زانیاری و کردەوە و بەخشیندا لاواز بوون، حەسودییان پێ دەبرد، وێڕای کەسانی خراپەکار و تێکەڵ و پێکەڵ کە بە هەموویانەوە پیلانی خراپان لە دژی دادەڕشت بۆ لاوازکردنی پلە و پایە و کەسایەتیی ناوبراو و زیان پێ گەیاندنی، وەك (ابن کثیر) لە رووداوەکانی ساڵی (٧١٠)ی کۆچی دا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (لە مانگی (شەووال)دا کۆمەڵێك لە خەڵکی حەسوود لە دژی (شیخ الإسلام) هەستان و نارەزاییان دەردەبڕی بەوەی (شیخ الإسلام) سزا شەرعییەکان (حدود) بەسەر خەڵکی دا جێ بەجێ دەکا و تەعزیریان دەکات و..... هتد، ئەویش قسەی خۆی دەکرد و وەڵامی دەدانەوە و هەڵەکانی بۆ ڕووندەکردنەوە، دوایی کۆتایی بە شتەکە هات)[1].

ئەو دەقەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە (شیخ الإسلام) جێ بەجێ کردنی سزا شەرعییەکان (حدود)ی بە شەرعیی و پێویست زانیوە، وێڕای تەعزیز کردنی ئەوانەی لە حوکمی قورئان و سوننەت دەردەچن، بێگومان ئەوەشی لە کاتێك دا کردوە کە زۆر لە خەڵکی ئەوەیان قبووڵ بووە و کۆمەڵێکی زۆری هەبووە کە بە قسەیان کردوە و ئەو کارانەیان ئەنجام داون و خۆشی سام و ڕێز و هەیبەتێکی زۆری لای هێندێك لە دەسەڵاتدارەکان هەبووە، لەوانەی لەسەر مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوون، یان مەیلیان بۆی هەبووە[2].

### ٩- هێندێك لە هەڵسوكەوتەكانیی لە گۆڕینی خراپە و بێ شەرعیی دا:

أ- لە ساڵی (٧٠٤)ی كۆچی دا رۆژێكیان (شیخ الإسلام) بانگی (محمد الخباز البلاسي) كرد و تۆبەی پێ كرد لە خواردنی شتی حەرام و تێكەڵ بوونی بە (أهل الذمة) و بڕیاریشی دا كەنابێ لەمەولا قسە لەسەر لێكدانەوەی (خەون) بكات، هەرشتێكی دیكەش كە زانیاری دەربارەی نەبێ[١].

ب- لە مانگی (رجب)ی ساڵی (٧٠٤)ی كۆچی دا، پیاوێكی پیر هاتە لای (شیخ الإسلام) بەناوی (المجاهد ابراهیم القطان)، كەوڵێكی گەورەی لەبەردابوو، دیمەنێكی نا ئاسایی هەبوو، (شیخ الإسلام) فەرمانی كرد ئەو كەوڵەی لە بەردا بدڕێنن، خەڵكەكە لە هەموو لاوە تێ ی هاڵان و لە بەریاندا دڕاند، فەرمانی كرد سەریشی بتاشن و نینۆكەكانیشی كورت بكەنەوە كە زۆر درێژ بوون، سمێڵیشی كە زۆر درێژ بوون و هاتبوونە نێو زاری كورتیان كردنەوە، تۆبەشی پێكرد لە قسەی خراپ و ناقۆڵا و خواردنی ئەوەی عەقڵ تێك بدا، وەك (حەشیش) و هەر شتێكی دیكەی حەڕامیش[٢].

ج- لە هەمان مانگ دا (شیخ تقي الدین ابن تیمیة) چوو بۆ مزگەوتی (النارنج) فەرمانی بە هاوەڵانی كرد كە بەردتاشیان تێدابوو بە شكاندنی بەردێك لەوێ لە ڕووباری (قلوط) كە بۆ پیرۆزیی دەچوونە لای و، نەزریان بۆ دەكرد و حەیوانیان بۆ سەردەبری، بەردەكەی شكاند و مسوڵمانان لە دەستی حەسانەوە، كە بەهۆیەوە خەڵكێك تووشی (شرك) بوو بوون، ئەو بەڵا گەورەیەی لە كۆڵ كردنەوە كە شەڕ و خراپەكەی زۆر گەورەبوو[٣].



د- شکاندنی بتەکانی دەرگای بچووك لە (درب النافدانیین) وە بتی (قبە اللحم و فراش الطاحون).. بەوە گومانی لە دڵی مسوڵمانان لابرد کە خەریك بوو ئیمان و عەقیدەیان هەڵوەشێنێ[1].

هـ- قسە کردنی (شیخ الإسلام) لەگەڵ سوڵتاندا بۆ لابردنی ئەو باجەی لەسەر ملّك و ماڵ و وەقفەکانی خەڵکی شام دانرابوو، وە لابردنی (والی) ئەوێش، سوڵتانیش ڕەزامەندیی لەسەر داوایەکەی (شیخ الإسلام) دەربڕی و جێ بەجێ ی کرد[2].

## سێیەم: سیفەتەکانی بانگخوازی سەرکەوتوو، تاچەند لە (شیخ الإسلام) دا هاتوونە دی:

بانگەواز بۆ لای خوا و بەرنامە تێر و تەواوەکەی، ئەرك و کارێکی گرنگە، خوای گەورە خستوویەتە سەر شانی بەندە باشەکانی خۆی، ئەوانەی بەهرە و توانای پێ بەخشیون، کە دڵ گەورە و عاقڵمەند و هیمەت بەرز و وره بەهێزەکان نەبن، ناتوانن بەو کارە هەستن و ئەنجامی بدەن، هەربۆیە ئەو کارە گرنگە کاری پێغەمبەران (علیهم السلام) و جێنیشنە ڕەسەنەکانیانە، لە زانایان و ئەوانەی خاوەنی فیکر و تێگەیشتنن و، سەرڕاست و خاوێنن، چونکە پەیامی بانگەواز بۆ لای خوا کە تایبەتمەندییەکی گرنگی هەیە، شتێکی ئاساییە کە تەنیا، کەسانێك هەڵی دەگرن و پێ ی هەڵدەستن، کە شایستەی ئەو ئەرکە بن و بتوانن بەباشیی جێ بەجێ ی بکەن و بەرەو پێشی بەرن.

بێگومان (شیخ الإسلام) کە زۆر لەو سیفەتە بەرزانەی تێدابوون، شایستەی ئەوە بووە ببێتە نموونەیەکی زیندوو و سەرکەوتوو بۆ بانگخوازانی رێ ی خوا،

---

(١) شذرات الذهب ٦/٩

(٢) البداية والنهاية ١٤/٦٢.

لەو چاخە وشك و چەقبەستوە فكریی و دینیی یەدا و لەو بوارەدا (شیخ الإسلام ابن تیمیة) وەك كەسایەتییەكی ئیسلامیی هەڵكەوتووی بیر فراوان، شارەزا و لێزان، دادپەروەری لێبوردە، دڵسۆز و خۆشەویست، بە پەرۆش و فێركار، دەبینرێ، و وەك بانگخوازێكی سەركەوتوو خاوەنی چەندین سیفەت بووە لەوانە:

### ١- پەیوەندیی بەهێزی بە خواوە:

پەیوەندیی بەهێز و توندوتۆڵ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، یەكەم پایە و بنچینەی پتەوی هەڵسوكەوتی بانگخوازانە، كە لێیەوە دەست بە بانگەوازەكەیان دەكەن و هەنگاوی بۆ دەنێن، كە ئەوە پێویستی بە ناسینێكی باشی خواو ئیمان پێبوونی هەیە، چونكە ناسینی خوای پەروەردگارو ئیمان پێبوون بە شێوەیەكی راست و دروست، بنچینەی بانگەوازە، خۆ ئەگەر ناسینی بانگخواز بۆ خوای پەرەوەردگار لاواز و وەك پێویست نەبێ، ناتوانێ ئەركی بانگەوازی بۆ لای خوا وە ئەستۆ بگرێ، با لێرە دا سەرنجێكی ژیانی (شیخ الإسلام) بدەین:

لەگەڵ ئەوەدا كە (شیخ الإسلام) بەردەوام سەرقاڵی دەرس گوتنەوە و پەروەردەكردن و تێگەیاندنی خەڵك و چاككردنەوەی وەزعی نالەباری كۆمەڵگا و، جیهادكردن بوو بە دڵ و زمان و قەڵەم و دەستی، بەڵام پەیوەندیی توندوتۆڵی بە پەروەردگاریەوە بەردەوام بووە و پشتی هەر بەو بەستووە و، یارمەتی لەو خواستوە بە جۆرێك هەركاتێ مەسەلەیەكی نەزانیبا یان تێی نەگەیشتبایە بە نیازێكی ڕاست و ساغ دەڕۆیشتە مزگەوتێكی لاچەپی ئاوەدانی و نێوچەوانی لەسەر خۆڵ دادەناو دەیگوت: (یامعلم ابراهیم فهمي) وەك لە دەقەكانی پێشووتری زانایان دا هێنامانەوە كە (شیخ الإسلام) لە طاعەت و عیبادەتە فەڕزەكان و لە شەونوێژ و ڕۆژووی سوننەت و چاكەخوازیی و فەرمان بە چاكە و ڕێگریی لە خراپە و تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵك و ڕوونكردنەوەی مەسەلە شەرعیی یەكان و ڕازانەوە بە سیفەتە جوان و بەرزە ئیسلامییەكان دا نموونەی كەم بووە، وە ئەو تێگەیشتن و پاڕانەوە و حاڵە ڕووحییە بەهێز و بەرز و جوانەی وای لێ كردبوو كە هەمووكات هەست بەوە بكات لە پەنای خوا دایەو ئەو حاڵەتە بەسەر



هەموو ژیانی دا زاڵ بوو بوو، بە شێوەیەك خۆشی و چێژی ڕاستەقینەی لە ناسینی ڕاست و ساغیی پەروەردگار و پەرستنی دا دەبینی، هەر بۆیە لە بەندیخانەدا بێزار و ماندوو نەدەبوو، بەڵكو كە لە پێناو خوادا تووشی دەبوو پێشوازیی و بەخێرهاتنی لێ كرد، ئەوكات یەكلا دەبۆوە بۆ زیكر و طاعەت و بیركردنەوە و ملكەچیی زیاتر، ئەو قەناعەتی وابوو ئەو كەسە زیندانی و حەپسە كە لە یادكردنی خوا بێ بەشە، ناوبراو وێڕای ئەوە كە خۆی زۆر گرنگیی بەلایەنی رووحیی و پابەند بوون بە قورئان و سوننەت دەدا، فەرمانیشی دەكرد بە خەڵكی بە گشتی و شوێنكەوتووەكانی بە تایبەتی، كە ئەو مەسەلەیە لە ژیانیاندا بە زەقی ڕەنگ بداتەوە.

**٣- زانایی و ڕۆشنبیریی:**

یەكێكی دیكە لەو سیفەتانەی وای كردبوو كە (شیخ الإسلام) ببێتە نموونەیەكی ناوازە و لێهاتووی سەركەوتوو لە بانگەواز بۆلای خوا دا، بریتی بوو لە زانایی و بەئاگا بوونی لە هەموو زانستەكان و هەبوونی بیر و هۆش و تێگەیشتنێكی فراوان، بە شێوەیەك لە زانیارییەكان دا پێهەڵچوو بوو، كە ئیجتیهادی دەكرد و ڕاو توێژینەوەی تایبەتی خۆی هەبوو بۆ زۆر مەسەلە و چاك و خراپی لە یەكدی جیادەكردەوە و لە زانستە ئیسلامییەكان و زمانی عەرەبی دا بە ئەندازەیەك شارەزابوو كە مێژووی زانستی ئیسلامی شانازی پێوە دەكا و چەندین زانای گەورە شاهیدیی زانایی ئەویان داوە وەك (ابن دقیق العید، ذهبي، ابن سیدالناس، الزملكاني) و چەند زانای دیكە، وەك پێشتر باسمان كردن.

**بە شێوەیەكی گشتی زۆرشارەزابوون و بەرزبووەوەی توانای زانستیی و فكریی و ڕۆشنبیریی لەسەر ئەم پایە زانستییانە دەوەستێ:**

* زانیاریەكی چاك و فراوان بەهەموو زانستەكانی قورئان و سوننەت.
* ئاگاداربوون بە مێژووی ئیسلامیی و ئینسانیی.
* توێژینەوەی ڕێڕەوەكانی زانستەكانی دەروونناسیی و لقەكانی.



* شارەزایی بە زانستەکانی بوونەوەر و جوگرافیا و ژیان.
* زانیاری تەواو بە مەزهەبە فەلسەفییە جیاوازەکان.
* ئاگاداربوون بە زانستەکانی زمان و ئەدەبی عەرەبی.

کە (شیخ الإسلام) لەو بارانەوە خوای بەخشەر پشکێکی گەورەی پێ بەخشیبوو.

### ٣- ساغ بوونەوە بۆ فیکرە و بیروباوەڕ:

بێگومان ساغ بوونەوە و دڵسۆزیی تەواو بۆ بیر و باوەڕ، نهێنی سەرکەوتن و بەرگرتنی بانگەواز و بزووتنەوە چاکسازییەکانە، چونکە ساغیی و نیەت پاکیی بۆ پەروەردگار، کار و کردەوەکان بەرز دەکاتەوە و دەیانکاتە عیبادەت، وەك چۆن دڵ و دەروون پیسیی، خواپەرستییەکان دێنێتە خوارێ و دەیانکاتە گوناهو، خاوەنەکەی دوای ماندوو بوون جگە لە زەرەرمەندیی و خاکەساریی هیچی دیکەی دەست ناکەوێ!

پێشتر دەربارەی خووڕەوشتی ناوبراو هێندێك شتمان باس کرد، کە نیشانەی ساغیی و دڵسۆزیی و نیەت پاکیی (شیخ الإسلام) بوون بۆ خوا و دینەکەی، ئەو ناحەزی زۆری هەبوون کە فشاریان دەخستە سەری و ئازاریان دەدا، دەیانویست لە گوتنی قسەی هەق بێ دەنگی بکەن و دەنگی بیستراوی کپ بکەن، بە چەندان شێوە پیلانیی ناڕەوایان بۆ دادەڕشت، زۆرجاران توانای بەرپەرچ دانەوەی هەبوون، و دەیتوانی زەرەریان لێ بدات، بەڵام بەخشندەیی بەرانبەر دەنواندن و چاکەی لەگەڵ دا دەکردن، بەرگریی لێ دەکردن و عوزری بۆ دەهێنانەوە، نامەی بۆ قوتابییەکانی دەنووسی و ئاگاداری دەکردنەوە، کە بەهۆی ئازاردرانی ئەوەوە کەس ئازار نەدەن، دەیگوت: نامەوێ کەس لەبەر ئەوەی درۆی لە دژی من کردوە، یان زوڵمی لێکردووم و ئازاری داوم، تۆڵەی لێ بکرێتەوە و ئازاری بدرێ، من گەردنی هەموو مسوڵمانێکم ئازاد کردوە، خێر و چاکەم بۆ مسوڵمانان دەوێ، بێگومان ئەو ساغیی و دڵسۆزیی یە بۆ دین و بیروباوەڕ لە بەرزترین ئەو سیفەتانەیە کە خوو و ڕەوشتی بانگخوازانی پێ پێناسە دەکرێ، خوو ڕەوشتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەچە



(جیل)ی یەکەمی لەسەر پەروەردە کردوە، کە پێشبڕکێیان بۆ ئیسلام و بەرگریی لێ کردنی کردوە و، چاوەڕوانی هەموو ئێش و ئازارێك بوون لەو پێناوەدا[1].

## ٤- ئازایەتیی و بەردەوامی لەگوتنی هەق دا:

ئیسلام دژی ترسنۆکیی و ڕاڕایی یە، لەگەڵ ئازایەتیی و ورە بەرزیی و لێبڕانە، بەرنامە و پایەمە گەورە و پیرۆزەکان خەڵکی ئازا و خاوەن ورە و ئیرادەی بەرز نەبێ، پشتی ناگرن و سەری ناخەن، ترسنۆکیی بەرنامە و مەبدەئە باڵاکان بێ نرخ دەکا و، هەق دەمرێنێ و ژێر گڵی دەخا و، زوڵم و ستەم سەردەخا و مەرامە پەستەکانی دێنێتە دی، (شیخ الإسلام) بە ئازایەتیی زۆر بەناوبانگ بوو، لە هەڕەشە و گوڕەشەی کەس نەدەترسا و هەقی ڕادەگەیاند و بانگەشەی بۆ دەکرد، سەبری دەگرت لەسەر ئەو ناخۆشییانەی دەهاتنە ڕێی، ئەو هەر لەسەرەتای گەنجییەوە هەستی بە بەرپرسیاریەتی دینیی کردوە و بە پەرۆش بووە بۆ ئوممەتی ئیسلامیی، کە لە زۆر ڕووەوە تووشی گرفت و ناخۆشی و نارەحەتی بووە، هەر بۆیە خەمی لێ خوارد و کاری کرد بۆ لادانی لەمپەرەکان و وەك سەرکردەیەکی دیاری دینی بوو بە پێشەنگ بۆ گێڕانەوەی کۆمەڵگا بۆ سەر ڕاستە شەقام و، ئەو ڕاستیانەی لە نێو ناخۆشیی و نەزانیی و ئەفسانە و خورافاتدا ون بوو بوون، (إبن تیمیة) هەر بەوەندە نەوەستا کە کارەکەی تەنها بریتی بێ لە دەرس گوتنەوە لە مزگەوت و خوێندنگاکان دا، بەڵکو قەناعەتی وابوو کە دینەکەی داوای لێ دەکا هەنگاوی کردەیی بنێ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو زانیارییەی هەیەتیی و چاکسازیی پێ بکات لەنێو کۆمەڵدا، بەتایبەتی لە بواری عەقیدەدا، چونکە بنچینەی هەموو کردەوەیەکی ئینسانەکانە، بەو پێیە بانگەشەی بۆ چەسپینی عەقیدەی ساغ و کارە باشەکان کردو ویستی زۆر شت کە بەناوی ئیسلامەوە دەکراو ئیسلامیش لێی بەری بوو، لای بەرێت و زۆر شتیش کە خۆی بەشەرعیی و ڕەوای دەزانی، هەرچەندە پێچەوانەی ڕای زانایانی دیکە بوو، بەتایبەتی ئەوانەی کەوتبوونە نێو چوارچێوەی

---

(١) من نماذج الدعاة / مجلة الوعی الإسلامی عدد ٨٨.

تەقلید و لێی دەرنەدەهاتن، بێ گوێ دانە قسەی ئەوان وخەڵکی دیکە و دەسەڵاتی مەلیك و سوڵتانەکان، بە خەڵکی ڕادەگەیاندو بەعەزمەوە دەلیلی ئەوانی بەدەلیل وەلادەنا و، بەرپەچی گومان و رەخنەی لاوازیانی بەبەڵگەی قورئان و سوننەت دەدایەوە، هەرچەندە ناحەزەکانی بەژمارە زۆرو بەدەسەڵات و - چونکە لەگەڵ سوڵتان بوون- لەو بەهێزتر بوون، بەڵام لەمەیدانی وتووێژو موناقەشەی زانستی دا هیچیان لەبەرانبەر(شیخ الإسلام) دا پێ نەدەکرا، تا سەرەنجام بەناڕەوا لای سوڵتان شکایەتیان لێی کردو بەگرتنیان دا، هەرچەندە دەگیراو زۆر لە بەندیخانەدا دەمایەوە بەڵام زانیارییەکەی بەند نەدەکرا، و ڕاو سەرنجەکانی لەوێوە دەگەیاندە زۆر کەس لەدەرەوە، دوای هاتنە دەرەوەی لە سجن گەڕایەوە بۆ دەرس گوتنەوەو ئەمجار لەگەڵ فەیلەسووفەکان و شیعەی باطینی و ڕافزەو سۆفی و هێندێك لە زانایان کەوتە دەمبەدەمەو موناقەشە، بەرانبەرەکانی لە مەیدانی وتووێژی زانستیی دا شکستیان دەهێنا، بۆیە پەنایان دەبردە بەر قسە هەڵبەستن و ئازاردانی، بەڵام ئەو لە هەموو حاڵەتەکاندا ڕەچاوی لایەنی شەرعیی دەکردو وەڵامی خراپەی بە خراپە نەدەدایەوەو بەورەی بەرزو دڵێکی ئارامەوە بەرانبەریان دەوەستایەوە.

## ٥- تێگەیشتنی ورد لە دین و شارەزایی لە واقیع:

بانگخواز کاتێك بەڕاستگۆو لێبڕاو بۆ کاری ئیسلامیی و بانگەوازەکەی دادەنرێت، کە ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە کارو بەردەوام تێبکۆشێت لەسەر تێگەیشتنی کاکڵ و نێوەڕۆکی دین و، دەقەکانی و ئامانجەکانی. دەبێت بانگخواز بتوانێت لە ژیان و حاڵو وەزعی خەڵکی بگات و ئاگاداری گۆڕانکارییەکان و پێشهاتەکان بێ، وە واقعی ژیان و دەوروبەری وەك خۆی ببینێ، چونکە چوونە ژوورەوە لە دەروازە ڕاستەکان بۆ گۆڕانکاریی لە کۆمەڵدا بە ئاگاداربوون و بەدواداچوونی کێشەکانی خەڵك و دڵسۆزی نواندن و بەشداریی کردن لە چارەسەرکردنیان دا دێتە دی، کاتێك کە خەڵك هەست بە دڵسۆزیی و خەمخۆریی بانگخواز دەکات، متمانەیان زیاتر پێی دەبێت و چاکتر گوێی بۆ دەگرن و بەقسەی دەکرێت.



بانگخوازی لێزان و هەستیار ئەو کەسەیە کە دەتوانێ نەخۆشییەکانی کۆمەڵگا دەست نیشان بکاو دەرمانی پێویستی بۆ دیاری دەکات، (شیخ الإسلام) ئەو بانگخوازە زاناو شارەزایە بوو کە بەوردیی و قووڵیی و بە شێوەیەکی گشتگیر لە دین تێگەیشتبوو، وەك (الزملکاني) دەڵێ: خوا زانستەکانی بۆ نەرم کردبوو، وەك چۆن ئاسنی بۆ داوود (علیه السلام) نەرم کردبوو، وێڕای ئەوە زانیاری هەبوو بە کێشەو گیروگرفتەکانی خەڵك و ئاگاداری بارودۆخی هەمەلایەنەی سەردەمی خۆی بوو، کە ئەوە وای کردبوو بتوانێ دەرمانی پێویست بۆ چارەسەری نەخۆشییەکان دیاری بکات و وەك مامۆستایەکی کارامەو خەمخۆرێکی ڕاستەقینە بناسرێ، هەموو مەزهەبەکانی عیلمی کەلامی موتاڵا کردبوون، کە مەترسییەکانی لە ژیان و واقیعی مسوڵماناندا دەرکەوتبوو، بەوەی عەقیدەی خاوێنی خەڵکەکەیانی تێك دابوو، یەك ڕیزی مسوڵمانانیان نەهێشتبوو، (شیخ الإسلام) بە زانایی خۆی دەیویست نێوەڕۆك و نهێنی شتەکان بزانێ و بەرپەرچی گچکە و گەورەی کارە نارەواکانیان بداتەوە و، بە دەلیل و بەڵگەی بەهێز درۆ و دەلەسەکانیانی پووکاندەوە، ناوبراو چەندان کتێب و نووسراوی نووسیون کە چارەسەری پێویستییان بۆ گرفت و نەخۆشییەکانی کۆمەڵگا لەخۆ گرتوون.

## ٦- گرنگیی دان بە بـارودۆخی مسـوڵمـانـان و ژیـان لەگەڵ ڕووداوەکان دا:

بانگخوازی ڕاست و بەجێ نابێت خۆی دورە پەرێز بگرێ و دوور لە مسوڵمانان بژی، بەڵکو پێویستە گرنگیی بدات بە حاڵ و وەزعیان و، ئەوە یەکێك بێ لە کار و مەبەستە گرنگەکانی و، کاکڵی بەرنامە بانگخوازییەکەی کە گۆڕانکارییەکان کاریان تێناکەن، (شیخ الإسلام) چاوەکانی کراوە بوون، ئەو کێشانەی دەبینین کە خەڵکی بەدەستیانەوە دەیانناڵاند، لە ئێش و ژانیان بەشداربوو، لەگەڵ خەم و خولیای کۆمەڵگاکەیدا دەژیا، لە خۆشیی و ناخۆشیی دا لە گەڵیاندا بوو، لە ساڵی (٦٩٩)ی کۆچی دا کە (تەتار) دەوری دیمەشقی دابوو خەڵکەکە دەترسان، کاربەدەست و سەرکردە و زۆربەی زانا و کەسە دیارەکان

هەڵاتن، دیمەشق بێ سەرۆك و دەسەڵات مایەوە، تاوانبار و خراپەکارەکان بەندنخانەکانیان شکاندن و هاتنە دەرێ و کاری خراپ و نا قۆڵایان ئەنجام دا، لەو کاتەدا (إبن تیمیة) قارەمانانە هەڵوێستی نواند کە کەسانی قسە ڕۆیشتووی ئەوێی کۆکردنەوە و ڕێککەوت لەگەڵیان کە خەم لە کاروبارەکانی وڵات بخۆن و بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەنەوە، دواتر ڕۆیشت بۆ لای (قازان) و داوای لێکرد ئەو ترسەی لەسەر خەڵکی دیمەشق درووستی کردوە نەیهێڵێت و دەوری شار چۆڵ بکا و مەبەستەکەی هاتە دی، ئەمەوچەندان هەڵوێستی دیکەی (شیخ الإسلام) وەك بەشداریی لە جەنگ و کۆکردنەوەی خەڵك و مەشق پێ کردنیان و بەدواداچوونی بۆ کاروباری مسوڵمانان لە زۆر شوێندا، بەڵگەی گرنگی دانیەتی بە بارودۆخی مسوڵمانان بە شێوەیەکی کردەیی.

### ٧- دنیا بەکەمگرتن:

یەکێکی دیکە لەو سیفەتانەی بانگخواز دەخاتە دڵی خەڵکەوە و قسەکانی کاریگەرییان دەبێ و لێ ی وەردەگرن، دنیا بەکەمگرتن و خۆ دوورگرتنە لێ ی، بە شێوەیەك عەقڵ و دڵ و ئەندامەکانی یەکلا بکاتەوە بۆ زانست و زانیاری و ئەو مەبەستە گەورەیەی هەیەتی، ئنجا هەموو خەڵکی سەردەمی خۆی یەك دەنگ بوون لەسەر دنیا بەکەمگریی (ابن تیمیة) و گوێ نەدانی بە لەززەت و خۆشییەکانی دنیا، کەس هەستی پێ نەکردوە بۆ وەدەست هێنانی سەروەت و سامان، سەرقاڵی کاری دنیایی بێ، نەزانراوە کارێکی ڕەسمیی دەوڵەتی بووبێ و کرێی لەسەر کارەکانی وەرگرتبێ، بەڵکو هەموو ژیانی خۆی لەگەڵ زانیاری و لە ڕێی بانگەواز بۆلای خوا بەسەر بردوە، خاوەنی (الکواکب الدریة) دەڵێ: (شیخ الإسلام) کڕین و فرۆشتن و شەریکایەتیی و بازرگانیی و. هتد یی نەکردوە و دینار و درهەم و خواردن و کەل و پەلی پەزمەندە نەکردوە، لەماوەی ژیانی دا و، لە دوای مردنیشی میراتەکەی بریتی بووە لە زانست و زانیاری، وەك شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە فەرموویەتی:

(ان العلماء ورثة الأنبياء والانبياء لم يورّثوا ديناراً ولا درهما ولكن ورّثوا العلم

فمن أخذ به، فقد أخذ بحظ وافر)[١].

واتە: بێگومان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، پێغەمبەرانیش دینار و درهەمیان بە میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانیاریان بە میرات بەجێ هێشتووە وە هەرکەسێك زانیاری بە میرات بگرێ ئەوا پشك و بەشی باشی پێبڕاوە.

## چوارەم: بوارەکانی کاری بانگەوازیی (إبن تیمیة)

(شیخ الإسلام) وای دەبینی کە بوارەکانی کارکردن زۆرن و جیاوازن، گۆڕەپانەکەش هیچ سوارچاکی تێدا نین و دوژمنانیش رمبازێنی تێدا دەکەن، هەستی بەوە دەکرد کە هەموو ئەو شتانەی لە دەوروبەرنی، پێوستییان بە چاکسازیی هەیە:

* خەڵکی بە گشتی پێوستییان بە پەروەردە و فێرکردن هەیە .
* زانایان پێوستییان بە وەبیر هێنانەوە و وشیاربوونەوە هەیە.
* کاربەدەستان پێویستییان بە هەستانەوە و ئامادەکاریی هەیە.

لەکاتێکدا دوژمنان لە (تەتار و صەلیبییەکان) خراپە و فەسادیان لە زەویدا دەکرد بەبێ ئەوەی رووبەڕووی هیچ پەرچ و بەرەنگارییەك ببنەوە، (شیخ الإسلام) قەناعەتی وابوو کە لەچەند لاوە لەنێو کۆمەڵگەدا گۆڕانکاریی پێویستە، زەحمەت و گەورەیی و فراوانی کارەکەی هەست پێ دەکرد، بەڵام ئەوە لە عەزم و ئیرادەی کەم نەدەکردەوە، دڕندەیی دوژمنانی لەلا ڕوون بوو، بەڵام سوور بوو لەسەر رووبەڕووبوونەوە و بەرەنگاریی، قەناعەتی وابوو مادام ئەو کار و بانگەوازە بۆ خوایە، خوای گەورە پشتی بەرنادا و یارمەتی دەدا، داوای یارمەتی بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە سەختە بە زیکر وخوا پەرستیی لە پەروەردگار دەکرد، لەدوای نوێژی بەیانی لە شوێنی خۆی دەمایەوە و تا چێشتەنگاو هەر

---

(١) اخرجه الترمذی و ابن ماجه ،من نماذج الدعاة لعرجون ص٩١.

یادی خوای دەکرد. (شيخ الإسلام) قەت کاتی بەزایە نەداوە، یان چاوەڕوانی هاوکارێك نەبووە، ئەو باوەڕی وابووە کە کات ژیانە، هەر ساتێك کە بەبێ کار ڕادەبرێ زیانبارییە و قەرەبوو ناکرێتەوە، چونکە ئەوکاتەی ژیان دەڕوا و بەسەر دەچێ و ناگەڕێتەوە، وە باوەڕی وابوو کە هەر خوا یارمەتی دەریەتی، جگە لەو شتەکانی دی هەموو هۆکاری ڕواڵەتیین، خوای کاربەجێ مەیسەریان دەکات بۆ هەر کەسێك لە بەندەکانی کە خۆی بیەوێ، لە ڕاستیشدا یارمەتی و سەرکەوتن هەر لە خواوەیە[1].

### ١ - چاکسازیی خەڵکی بە گشتی:

(شيخ الإسلام) زۆر داکۆکیی لەسەر چاکسازیی لەنێو خەڵك بە گشتی کردوە، ئەویش لە ڕێ ی فێرکردنێکی ڕاست و دروستی دین و، باسکردنی ئیسلام بەگشتی و، ڕوونکردنەوەی حەڕام و حەڵاڵ و پێشخستنی لە پێشترەکان، ئەوەش لە میانی چاندنی عەقیدەیەکی ڕاست و ساغ و دروست لە دڵ و دەروونی خەڵك دا و پووچەڵ کردنەوەی گومانی لاڕێکان و بەرپەرچدانەوەیان، باسی عیبادەتی ساغ و حوکمەکانی جیهادی بۆ دەکردن و بە قسە و کردەوە تێ ی دەگەیاندن و بەکردەوە بەشداریی هەر کارێکی خێری دەکرد کە سوودی هەبوو بێ، وێڕای ئەوە داکۆکیی دەکرد لەسەر ئیسلامی گشتگیر، کە هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، هەوڵی دەدا ئەو مانایە لە خەڵکەکە بگەیەنێ و ویژدانیان بەخەبەر بێنێ، بۆ ئەوەی بە جووڵە بکەون بۆ کار و ڕایانپەڕێنێ بۆ جیهاد، کە سەرەنجام دوای هەوڵ و تێکۆشانێکی بێ پسانەوە، توانی بە یارمەتی خوا بگاتە ئەو مەبەستەی کە کاری بۆ دەکرد و دەیویست، کە کارێك بوو وەستاوی بە جووڵەخست و، نووستوی بە خەبەر هێنا و لە نێو جەرگەی وەستاویی و چەقبەستوویی دا کە هەردووکیان لەسەر دڵی بانگخوازی دڵسۆزدا قورسن، جووڵەی دروست کرد.



ئەو زۆر داکۆکیکار بوو لەسەر پتەوکردنی ریزی برایەتی و، دڵ بەیەکەوە جۆش دانی مسوڵمانان و یەك هەڵوێستی و کردنی هەر شتێك کە سوودی بۆ مسوڵمانان بوویێ، زۆر چاکەکار بوو، خۆی بە قوربانی دوورخستنەوەی مەترسییەکان لەسەر ئوممەت، دەکرد.

## ٢- چاکسازیی زانایان:

ئەمەش لە میانی بیرهێنانەوەیان بەوەی دەبێ بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن، کە خوای پەروەردگار پێ ی راسپاردوون و فەرمانی پێ کردوون، زانا زۆر بوون بەڵام لە بواری زانیاری بۆ بانگەواز و چاکسازیی لە خەڵکی دیکە جیا نەدەکرانەوە، زانیاری عەقڵیانی پڕکردبوو بەڵام ویژدان و دەروونیانی بە جووڵە نەخستبوو، سەرقاڵبوون بە پلە و پایەی ژیانیان و لە جووڵەی خستبوون، نزیکییان لە سوڵتان و کاربەدەستان شانازیی بۆ دروست کردبوون و زمانیانی لە گۆ خستبوو، بۆیە لە هیچ شتێکدا لە خەڵکی باشتر نەبوون .

زانایان قسەیان یەك نەبوو، لە یەکدییان دەخوڕێند و دژایەتی یەکدییان دەکرد، بوغز و پەرتەوازەیی دەروونیانی پڕ کردبوو، هۆی ئەوەش ئەمانە بوون:

**أ- دەمارگیریی مەزهەبیی:** کە زاڵ بوو بەسەر عەقڵ و هۆشیاندا و تووشی نەتوانینی کردبوون بەوەی لە پێناو شوێن کەوتنی حەقدا لە دەلیلەکان بفکرن و لێی ورد ببنەوە .

**ب- بیرو و ڕای سیاسی:** کە بوو بەهۆی زیاتر لێك هەڵوەشانی یەکێتییان و فراوان بوونی درزی ناکۆکیی لە نێوانیان دا، بە جۆرێك دەوڵەت دەیویست لە هەر مەزهەبێك قازییەك دیاری بکات، کە ئەوە هاندان بوو بۆ دەمارگیری و پەرتەوازەیی، وە هەر وەزیرێك زانایەکی هەڵدەبژارد و لەخۆی نزیك دەکردەوە، لە هەرشتێکیش گلەیی و ڕەخنەی لێ ی ببووایە دەری دەکرد و لەخۆی دووری دەخستنەوە، تاوای لێهات زۆربەی زانایان بوونە داردەستی کاربەدەستان و رێز و حورمەتی زانستییان پێوە نەدەما و هەیبەت و سامی زانایانیان لێ دادەڕنین .

ج- زۆر لەوان ڕای لادەرانیان وەردەگرت لە سۆفیەکان کە باوەڕیان بە (وحدة الوجود) هەبوو، وە دانیان دێنا بە بیردۆزەی (الحلول والإتحاد) دا، وە زانایان ئەوکات شوێنەوار و کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لێ نەدەبینرا، (إبن تیمیة) ئەو هەڵوێستە ناشایستانەی لە زانایان بینیوە کەوازیان لە فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە هێناوە، بۆیە داوای لێ کردوون کە بە چاکیی نوێنەرایەتیی ئیسلام بکەن و، دوور لە بەرژەوەندیی شەخسیی و هەوا و نەفس ئەوەی لەسەر شانیانە پێ ی هەستن[1].

(شیخ الإسلام) دەیویست زانایان دوور بکەونەوە لە سوڵتان و پلە و پایەی ڕەسمیی، بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەریی ئەوان و ڕەخنەی دەگرت و نارەزایی دەردەبڕی لە دەست ماچکردنی کاربەدەستان و چەمینەوە لە بەردەمیان، بەهەرشێوەیەك لەبەر ترس بێ یان تەماع، کە توانی تا رادەیەك تەنگ بەو زانایانە هەڵبچنێ و وابکا خەڵکی خۆیان لێ بەدوور بگرن، ئەوانەی بەرتیلیان لە خەڵکی وەردەگرت کە کار بۆ خەڵکی راهی بکەن لای سوڵتان و بەوە خۆیانیان دەوڵەمەند کردبوو، تا کار گەیشتە ئەوەی فتوای حەلاڵیی بەرتیلیان دا بە مەبەستی کار ڕۆیشتن، (شیخ الإسلام) لە مزگەوت دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیگوت: (پێویستە بۆ هەر کارێك چاکترین کاربەدەست دابنرێ کە دەتوانێ بیکا، ......).

بەو پێیە هێندێك لەو زانایانە بە دەنگیەوە هاتن و بەوەی لەسەر شانیانە هەستان و بەشدارییان کرد لە فەرمان بەچاکە و ڕێگریی لە خراپە و جیهاد کردن لە پێناو بەرزکردنەوەی دینی خوادا، بەڵام بەشێکی دیکە بە حەسەد و کینە و خراپە و پیلانگێڕیی و درۆ و ئیفتیرا و دژایەتیی کردنی لەلای کاربەدەستان، وەڵامی (إبن تیمیة)یان دایەوە، بۆ ئەوەی بە گرتنی بدەن و وشەی هەق و دەنگی زوڵاڵی کپ بکەن، هەرچەندە توانیان بە غەدر و تاوان لاشەکەی بخەنە بەندیخانەوە، بەڵام نەیانتوانی قسە و ڕاو سەرنج و فتوا و ڕێنماییەکانی بەند

بکەن لەکار و ئامۆژگاریی، لە کاتی توانا و دەسەڵاتیش دا وەڵامی شیخ الاسلام لێبوردەیی و سینگ فراوانیی بوو لە بەرانبەر ئەوانەدا کە خراپە و دژایەتی ئەویان کردبوو.

## ٣- چاکسازیی لە هەڵسوکەوتی کاربەدەستان:

(شیخ الإسلام) لە سەردەمی خۆیدا بە مەبەستی کارتێکردنیان و پەلکێشکردنیان بۆ کردنی کاری خێر، پەیوەندیی بەهێز و پتەوی لەگەڵ سوڵتان و بەرپرسەکان دا دروستکردبوو، کە کەسانێك لە نێوياندا خۆشیاندەویست و ڕێزیان لێ دەنا و شەرمیان لێ دەکرد و، سەرسام بوون، بە فەرمان بە چاکە کردنی و ڕێگریی لە خراپە کردنی و بە پەرۆش بوونی بۆ زیندوو کردنەوەی سوننەتی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم)، لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستی و پەیوەندیە بە تینەی لەگەڵیاندا هەیبوو، ئینسانێکی دنیا نەویست و زاهید بوو، قەت شتی بۆخۆی داوا نەدەکرد و ڕۆژێك لە ڕۆژانیش تەماعی لە پلە و پایەدا نەبووە، کە ویستبایان شتی بدەنێ وەلای دەنا و نەیدەویست، (شیخ الإسلام) خەڵکی بانگهێشت دەکرد بۆ فەرمانبەریی کاربەدەستانیان لە هەرکوێیەك بن، بەڵام ئەگەر سەرپێچیی فەرمانی خوایانکرد، ئەوە نابێ بەگوێیان بکرێ، (مەمالیك) کە دەسەڵاتداری وڵات بوون، ئەویان خۆشدەویست چونکە (شیخ الاسلام) باوەری بەوە نەبوو کە (مەمالیك) ئەو کاتیش کۆیلەن. بەڵکو مەرجی شیخ الاسلام بۆ مەمالیك بریتی بوو لە ئیستقامەت و بەردەوامیی لەسەر ئیسلام تاکو خەڵك بەگوێیان بکات، (شیخ الإسلام) وای دەزانی کە (مماليك) شەڕکەر و ئازان و هەریەکێکیان لە سەنگەرێکی ئوممەتیی ئیسلامیی دان، ڕێزێکی زۆری لەلای ئەوان هەبوو و شەرمیان لێ دەکرد و حسابیان بۆ قسەکانی دەکرد.

ئەو هەستە دوو سەرەی نێوان (ابن تيمية و مماليك)[1] بە پێویست زانرا بۆ بەرپەرچ دانەوەی (تەتار و صەلیبییەکان) کە سەرسەختترین دوژمنی ئیسلام

بوون لەو سەردەمەدا، بەڵکو مەمالیك زیاتریش لەوە، هاودەنگ بوون لەگەڵ (شیخ الإسلام) دا بەوەی لەگەڵ هەڵوێستی ئەودا بوون لەوەی شوێنەکانی فەساد و بارِ و شوێنی فرۆشتنی شەرابیان داخستن[1]، هەرچەندە ئەو پەیوەندییە بەهێزە لە نێوانیان دا هەبوو، بەڵام ناحەزان و کەسانی حەسوود لە زانایان و خەڵکی دیکەش، بەجۆرەها شێوە لە پیلانگێڕاندا بوون، لە دژی (شیخ الإسلام) و چەند جاران سوڵتان و کاربەدەستان بۆ دادگایی کردن (شیخ الإسلام) یان لە مەجلیسەکانیان دا ئامادە دەکرد، وتووێژیان لەگەڵدا دەکرد دەربارەی ئەو شتانەی پێیان تۆمەتبار دەکراو هەموو جارێ بێتاوان دەردەچوو، بەسەرکەوتوویی مەجلیسەکەی بەجێ دەهیشت، بەڵام فشاری ئەو حەسوودانە بەردەوام بوو، بە شێوەیەك کاریگەریی لەسەر کاربەدەستان دروست کردبوو کە فەرمانی بەندکردنی (شیخ الإسلام) بدەن.

ئەو شکایەت و داوایانەی ناحەزان لەسەر (شیخ الإسلام) تۆماریان دەکرد، هۆیەکی گەورەی شارەزابوون و ناسینی کاربەدەستان بوو بۆ (شیخ الإسلام) کە لە نزیکەوە شتی لێ ببیستن، یەکێك لەوانەی لەمیانی ئەو قسە و وتووێژانەی لە نزیکەوە لەگەڵیدا کردوە و ناسیویەتی و (شیخ الإسلام) ی خۆشویستوە، سوڵتان (الناصر محمد بن قلاوون) بووە، بەڵام وێڕای ئەوەی لە جیهادی (تەتار)یش بینیویەتی کە چەند ئازا و دڵسۆز و بە وەفا بووە بۆ دین و نیشتمانەکەی، لەگەڵ ئەو خۆشەویستیەشی دا بۆ (شیخ الإسلام) لە ژێر فشاری ناحەزانی دا بەندی کردوە، ئەو هەلومەرجە ناهەموارەی (شیخ الاسلام) تێیدا ژیاوە وای لێ نەکردوە خەمسارد بێ و فەرمان بەچاکە نەکا، بەڵکو بەردەوام داوای لە کاربەدەستان کردووە کە بەئەرکی سەرشانیان هەستن بەرانبەر بە دین و وڵات و خەڵکی بەگشتی. لەزۆر ڕووەوە (شیخ الإسلام) ویستوویەتی چاکسازیی لە کار و هەڵوێستی سوڵتان و کاربەدەستان دا بکا، ئەوەتا لە شتی بێ شەرعی ئاگاداری کردوونەوە وەك: مەسەلەی نەهێشتنی بەرتیل و گەندڵیی ئیداریی و بەرپاکردنی دادپەروەریی و پێدانی بەرپرسیاریەتی بە پێی شایستەیی و، جێ بەجێ

---

(١) ابن تيمية العالم الجزيء / عبدالمنعم الهاشمي ص ٣٠ - ٣١



کردنی شەریعەتی ئیسلام و، دژایەتیی کردنی چەند عادەتێکی نەفامیی وەك تۆڵەسەندنەوەی نارەوا و پەرەپێدانی شوێنی فەساد و خراپەکاریی، لە لایەکی دیکەوە داکۆکی کردنی لەسوڵتان بۆ هاتنی بۆ جەنگی تەتار و رزگارکردنی وڵات و مسوڵمانان و قبووڵنەکردنی زوڵم و ستەمی تەتار و. هتد، وکە پێی گوتووە (لوقدر انکم لستم حکام الشام ولاملوکه واستنصرکم أهله وجب علیکم النصر فکیف انتم حکامه وسلاطینه وهم رعایاکم وانتم مسؤلون عنهم).[١] کە ئەوانەی هەموو بەمەبەستی چاککردنی بەرپرسان بووە و، هیچ کاتیش موجامەلەی لە هیچ شتێکدا لەگەڵ دۆست و ناحەزدا نەکردوە و ئەوەی بە حەق و ڕاستیی زانیبێ، گوتوویەتی و کردوویەتی، وە هەموو هەوڵ و تێکۆشان و مەبەستیشی بەرجەستە کردنی ئیسلام بوو لە دڵ و دەروونی خەڵکی دا، وەك ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنابووی و، گێڕانەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامیی بەهێز بوو، وەك ئەوەی لەسەردەمی خەلیفە سەرڕاستەکان دا هەبوو[٢].

## پێنجەم: کۆسپەکانی سەر ڕێی چاکسازیی (إبن تیمیة):

لەوەتەی خوا بوونەوەری دروست کردوە هیچ بانگخوازێك نەبووە و نابێ، مەگەر تووشی کۆسپ و لەمپەر و ناخۆشی هاتوە و دێت، ڕێ ی بانگخوازان بۆ لای خوا ڕێی بەهەشتە، بەهەشتیش بە ناخۆشییەکان دەورە دراوە.

کۆسپ و لەمپەرەکانی سەر ڕێی بانگخوازان ئاماژەی ڕاستیی و ساغیی کاروانەکەیە، ئەو ناخۆشیانەی تووشیان دێ گڵۆپی سەوزە کە ڕێیان پێ دەدا بەردەوامبن لەسەر ڕۆشتن و دڵنیایان دەکات لەسەر تەواویی بانگەوازەکەیان، بۆیە گیر و گرفتەکانی سەر ڕێی (إبن تیمیة) کەمووکوڕی نەبوو بۆ خۆی و،

---

(١) البدایة والنهایة ١٤/٣٣

(٢) استمراریة الدعوة ٨٤ - ٨٦.

نەنگیی نەبوو بۆ ئەو بەرنامەیەی خەڵکی بۆ بانگ دەکرد، بەڵکو بانگخوازان دەزانن کە ئەو کۆسپ و گرفتانە لەگەڵ بانگەوازدا بەیەکەوە بەستراون و ئەو ڕێیە لەو شتانە خاڵی نیە، بانگخوازان بەهۆی ئەو شتانەشەوە لە ڕاستیی و تەواویی بانگەوازەکەیان دڵنیا دەبن وتاقی دەکرێنەوە.

لە هەمووکات و شوێنێکدا ئەو کۆسپانەی تووشی بانگخوازان دەبن یەکن، بەڵام شێوازیان جیاوازە، کە بە پێی شوێن و هەڵکەوتەی ناحەزان دەگۆڕێن، قورئانی پیرۆز باسی ئەو کۆسپانە دەکات، کە دووبارە دەبنەوە لەسەر ڕێ ی هەموو بانگخوازێکدا کە دەفەرموێ:

﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ۝٥٢ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ طَاغُونَ﴾ الذاريات (٥٢ - ٥٣).

واتە: بەم شێوەیە هیچ پێغەمبەرێك بۆ لای ئوومەتانی پێش ئەمان نەهاتووە مەگەر وتویانە - بەو پێغەمبەرە - جادووگەر یان شێتە، ئایە ئەمان و ئەوان ڕاسپاردەیان بۆ یەکتری کردوە؟ نەخێر بەڵکو ئەمانە گەلێکی یاخی و لەڕێ دەرچوون.

## - لە کۆسپەکانی سەر ڕێی (ابن تيمية) :

### ١- ئـازاردان:

ئازاردان بە مانای گشتی، مەبەست پێ ی هەر زەرەر و زیانێکە کە تووشی ئینسان دێت، کەم بێ یان زۆر، نەفسیی بێ یان بەدەنیی، شێوازی ئازاردانی (شيخ الإسلام) هەردوو لایەنی نەفسیی و بەدەنیی گرتۆتەوە:

### أ- ئازاردانی نەفسیی:

کاتێك ناحەزانیی - هەندێك زانای نا حاڵیی یان حەسوود- تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەست کە گوایە ئەو (جسم) بۆ خوا قەرار دەدات، یان کوفر و ڕێ لێتێکچوونیان دەدایە پاڵ و درۆیان بۆ هەڵدەبەست، نموونەی: (علاءالدين محمد



بن محمد العجمی البخاري)[١]. کاتێك دەیگوت: هەرکەسێ بە (إبن تیمیة) بڵێ: (شیخ الإسلام) ئەوە کافرە، هەر بۆیە (ابن ناصر الدین الدمشقي) لە کتێبەکەیدا بەناوی (الرد الوافر) بەرگریی لە (شیخ الإسلام) کردوە و بەرپەرچی (علاء الدین)ی داوەتەوە.

بەڕاستیی ئازاردانی نەفسیی شیخ الاسلام، لە پاڵدرانی کوفر و ئیلحاد و ئەوەی کە خوای بە جسم داناوە و شوبهاندوویەتی بە دروستکراوەکانی، ئازارێکی زۆرە، بەڵام ئیمانی بەهێزو پشت بەستن بەخوا، ئازارەکانی بۆکەم دەکردنەوە.

**ب- ئازاردرانی بەدەنیی:**

(شیخ الإسلام) تووشی ئازاردرانی بەدەنیی هاتووە کاتێك ناحەزەکانی لە بەناو زانایان خەڵکیان هانداوە بۆ لێدانیی و دژایەتیی کردنی، ئەوە بوو لە لایەن خەڵکیکی شەقاوەی گەڕەکی (حوسەینیە)ی (قاهیرە) هێرش کراوەتە سەری و ئازاریان داوە، دوای ئەوە کۆمەڵێك لە دۆست و خۆشەویستانی کۆبوونەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لەوانەی ئازاری (شیخ الإسلام) یان داوە، بەڵام ناوبراو نەیهێشت تۆڵە بکەنەوە و پێ ی گوتن: (إما أن یکون الحق لي،

---

(١) لەساڵی (٧٧٩)ی کۆچی لە ئێران لە دایك بووە و لە (بخاري) گەورە بووە، چووە بۆ هند و دوایی بۆ مەککە و ئنجا لە ساڵی (٨٣٢) لە (مصر) نشتە جێ بووە، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئەوێ پەیوەندیی توند و تۆڵی هەبووە، دوایی چۆتە (دیمەشق) و لەوێ ماوەتەوە تا (٨٤١) کە ئەو ساڵە لەوێ مردوە، زانیاری لە بابی و خاڵی و سەعدی تەفتازانی وەرگرتوە، شەرعزانێکی حەنەفی مەزهەب بووە و زۆر دەمارگیریی هەبووە بۆ مەزهەبەکەی، توند بووە لەسەر هێندێك لە زانایان و قسەی پێ گوتوون بۆ نموونە: دەربارەی هەردووك زانای پایە بەرز (ئیمام محي الدین النووي و تقي الدین ابن تیمیة) ڕای خراپی هەبووە دەربارەی (ئیمامی نەوەوی) گووتویەتی (لایجوز النظر في کتبه، وأنه رجل ظاهري!) وە دەربارەی (إبن تیمیة) گوتویەتی (من زعم ان ابن تیمیة شیخ الإسلام فهو کافر) کە لەسەر ئەو هەڵوێستەی زانای بەناوبانگ (الحافظ ابي بکر بن ناصرالدین الدمشقي) کتێبێکی داناوە بەناوی (الرد الوافر) ناوی (٨٧) زانای گەورەی هەر چوار مەزهەبەکەی هێناوە کە بەرێز و وەك مامۆستا و بە (شیخ الإسلام) ناوی (إبن تیمیة) یان هێناوە و قسەکانی (علاء الدین) دەپووکێنێتەوە. (الرد الوافر٢١).

أولكم، أو لله، فان كان الحق لي، فهم في حل منه، وان كان لكم، فان لم تسمعوا مني ولا تستفتوني فافعلوا ماشئتم، وان كان الحق لله، فهو يأخذ حقه ان شاء كما يشاء)

واتە: هەقەکە یان هی منە، یان هی ئێوەیە، یان هی خوایە، ئەگەر هەقەکە هی من بێ، ئەوە لەو هەقە گەردنیان ئازابێ، وە ئەگەر هەقەکە هی ئێوە بێ، ئەگەر گوێم بۆ ناگرن و بەقسەم ناکەن ئەوە کەیفی خۆتانە، و ئەوەی پێتان باشە بیکەن، وە ئەگەر هەقەکەش هی خوایە، ئەوە خوا هەقەکەی خۆی وەردەگرێتەوە هەرکاتێ بیەوێ و بەوشێوەیەی خۆی بیەوێ.

وە جارێکیان لەکاتی وتووێژدا کاتی نوێژی عەسر هات، هەستا بڕوا بۆ مزگەوت، پێیان گوت: نەچی نەوەك ناحەزانت ئازارت بدەن، بەڵام ئەو گوێی نەدانێ و ڕۆیشت بۆ مزگەوت، کۆمەڵێکی زۆر لە ناحەزانی بە مەبەستی ئازاردانی دوای کەوتن[1].

## ٢- دژایەتیی کردنی زانایان بۆ (ابن تیمیة):

هێندێك لە زانایان لە دژی وەستانەوە و تۆمەتباریان کرد کە لە ڕێڕەوی ئەهلی سوننەت و ئەوەی زانایانی ئۆممەت لەسەری کۆکن، دەرچووە، وە ئەو زانایانە قورسایی و پێگەی خۆیان هەبوو لەنێو کۆمەڵدا بە جۆرێك کە دژایەتی یەکێکیان کردبایە خەڵکی لەگەڵیان بوو، ئەوەندە بەس بوو بە یەکێکیان گوتبایە لە دین دەرچووە، یان لە ڕێی پێشین لای داوە، بۆ ئەوەی شەڕ لە دژی بەرپا ببێ، لەلایەکی دیکەوە دژایەتیی زانایان بۆ (إبن تیمیة) کە لە دژی وەستاون و تۆمەتیان بۆ هەڵبەستوە، پاڵنەرێك بووە بۆ حوکمڕانەکانیش کەدژایەتیی ناوبراو بکەن، بێگومان زۆر جاران کاربەدەستان زانایان هاندەدەن بۆ ئەو جۆرە هەڵوێستانە و، دژایەتیی کردنی کەسایەتییەکان و لەکەدار کردنی سومعەیان و گومان دروست کردن لە کار و هەڵوێستیان، یان زانایان خۆیان ویستوویانە سومعە و کەسایەتیی

---

(١) العقود الدرية ٢٨٦ - ٢٨٨.



زانایەکی پایە بەرز برووشێنن و دەوڵەتیش هان بدەن لە دژی، کە ئەوە بەرهەمی رق و قینەیەکە کە دڵیانی داپۆشیوە[1].

• زانای گەورە (ابو الحسن الندوي) هۆکارە سەرەکییەکانی دژایەتیی کردنی (شیخ الإسلام ابن تیمیة) ی لە لایەن ناحەزەکانی باس کردوە و دەڵێ:

١- بەرزیی و گەورەیی کەسایەتی (شیخ الإسلام) لە ناو کۆمەڵ و لای دەوڵەت، و گومان بردنی خەڵکێك و هێندێك لە زانایان کە بوونی ئەو مایەی پەراوێز بوونی خۆیانە.

٢- زانایی و شارەزایی (شیخ الإسلام) و بەرزیی ئاستی فکریی و کاریگەریی لە گۆڕانکارییەکاندا و هەبوونی ڕاوسەرنجی تایبەتی خۆی، کە ئیجتهادی لە زۆر مەسەلەدا کردوە و ئەوەی قەناعەتی پێ ی هەبووە بێ ترس درکاندوویەتی. کە بەهۆی زانیاری زۆری ناوبراوەوە ئاستی کەسانی دیکە دەرکەوتوە و حەسودیی پێ براوە، وەك: وەستانەوەی لە دژی ڕافیزە و بیر و بۆچوونی خوار و خێچی هێندێك لە سۆفییەکان و ئەوانەی کە تێکدەری عەقیدەی ئەهلی سوننەت بوون و، وەستانەوەی لە بەرانبەر ئەوانەی سیفەتەکانی خوایان تەئویل دەکردن و تەحریفیان دەکردن.

هەروەها دەڵێ: بێگومان (شیخ الإسلام) لە ڕووی ڕاو بۆچوونەکانی پێش سەردەم و زەمانی خۆی کەوتۆتەوە، توانایەکی زۆری هەبووە لە توێژینەوە و دەرهێنانی بنەما و یاسای شەرعیی لە دەقەکان، وە زانایەکی کردەیی بووە، هەربۆیە حەسوودی پێ برداوە و ویستراوە لە پلە و پایە و ڕێزی شایستەی خۆی دابیبەزێنن و بیهێننە خوارێ.

• شیخ (أبو زهرة) ش دەڵێ: لە کۆن و نوێ دا هەرکەسێك لە هێندێك شتدا لە خەڵکی دیکە چاکتر بووبێ و چەند سیفەت و هەڵسوکەوتێکی هەبن، زیاد لە خەڵکی و هاوڕێنانی، ئەوە لە زاتی خۆی دا کەسێکی گەورەیە، بۆیەلە هەموو لاوە چاوی تێ دەبڕن، سەرەنجام دۆست و دڵسۆز و خۆشەویستی دەبن و دوژمن و

---

(١) استمرارية الدعوة ١٠٢.

ناحەزیشی دەبن، کە بەدوای هەڵە و کەمووکوڕیەکانی دا دەگەڕێن، بەو شێوەیە (إبن تیمیة) لە زاتی خۆیدا کەسێکی ناوازە و گەورە و دامەزراو بووە، خاوەنی چەند سیفەتێك بووە کە لە هاوڕێنەکانی سەردەمی خۆی دا نەبوون، کە ئەوانە بوونە مایەی ئەوەی لای خەڵکێك بە گەورە و ڕێزەوە سەیر بکرێ و خەڵکێکیش بە پەست و نزم تەماشای بکات[1].

• زانای گەورە (الالوسي) هۆیەکانی دژایەتیی کرانی (إبن تیمیة)ی کورت کردۆتەوە و دەڵێ:

هێندێك کەس لەبەر ئەوەی هاوچەرخی یەکدی بوون لەگەڵ (شیخ الإسلام)، هێندێکیش بە بیستنی درۆی بێ بنەما و لێنەکۆڵینەوە لێی هێندێکیش لەبەر ئەوەی لە عەقیدەدا لەگەڵیدا جیاواز بوون، هێندێکیش لەبەر خۆشەویستییان بۆ (ابن عربی) و شوێنکەوتووەکانی، کە (شیخ الإسلام) ڕەخنەی توندی لە بواری عەقیدەدا لێ گرتوە، هێندێك کەسیش مامۆستاکەی ناکۆکیی هەبووە لەگەڵ (شیخ الإسلام) دا.

(بهاءالدین السبکي) لە قسەیەکی دا دەڵێ: (مایبغض ابن تیمیة الا جاهل أو صاحب هوی، فالجاهل لایدري ما یقول، و صاحب الهوی یصده هواه عن الحق بعد معرفته به)[2].

وەکاتێك زانای پایە بەرز (ولی الله الدهلوی) بەراورد دەکات لە نێوان زانیاری (إبن تیمیة) و هاوسەردەمە نەیارەکانی دا، دەڵێ: (زانا نەیارەکانی زانیارییان ناگاتە دەیەکی زانیاری وی)[3].

---

(١) ابن تیمیة للندوی/ص١٣٩.

(٢) الرد الوافر ٩٩.

(٣) الندوة العالمیة ٢١٣.



**لەو درۆیانەی لە دژی (شیخ الاسلام )هەڵیانبەستوون:**

نەیار و ناحەزەکان لە پشت درۆ و دەلەسەکان کە لە دژی (شیخ الإسلام) دەیانکردن، خۆیان دەشاردەوە، بۆ ئەوەی هۆکارە ڕاستەکانی دوژمنایەتیی کردنیان بۆی، بشارنەوە، دەیانویست شتە ناڕاستەکان بکەنە بیانووی بە دیهێنانی مەبەستەکانیان، گەورەترین ئەو درۆیانەش ئەمانە بوون:

**أ- جەستاندنی خوا(تجسيم الله):**

هەر لەبەر ئەوەی ئەو سیفەتانەی خوای گەورەی سەلماندوون کە خوا خۆی پێ وەسف کردوون، یان پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) خوای پێ وەسف کردوون، کە ناحەزانی دەیانویست (إبن تيمية)ش وەك ئەوان سیفەتەکان تەئویل بکا و لە مانای ڕاستەقینەی خۆی لایانبدات، کە خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویانە.

**ب- سەردانی نەکردنی قەبری پێغەمبەران:**

گوایە (شیخ الإسلام) بە شەرعیی نەزانیوە و پشتگیریی لەوە کردوە کە سەردانی قەبری پێغەمبەر (محمد) "صلی الله علیه وسلم" و پێغەمبەرانی دیکە (علیهم السلام) نەکرێ، لە کاتێکدا (شیخ الإسلام) لە چەند کتێبێکی دا ڕوونی کردۆتەوە کە قسەکەیان گۆڕیوە و ئەو بەو شێوەیە نەیگوتوە، بەڵکو ئەوەی ئەو دەیڵێ ئەوەیە کە دروست نیە بارگە تێك بنێ ی و بکەویە سەفەرێ بەنیازی سەردانی قەبر، چونکە جیاوازیی هەیە لە نێوان سەردانی کردنی قەبردا و، بارگە تێك نان و سەفەری تایبەت کردن بۆ سەردانی کردنی قەبر، کە یەکەمیان شەرع فەرمانی پێ کردوە و دووەمیان شەرع نەهی لێ کردوە[1].

---

(١) دەربارەی سەردان و زیارەتی قەبران، پێغەمبەر (صلی علیه وسلم) دەفەرموێ: (زوروا القبور فانها تذكركم الاخرة) رواه مسلم، بەڵام سەبارەت بە بارتێك نان و سەفەرکردن بۆ شوێنێك بە مەبەستی عیبادەت و لە خوا نزیك بوونەوە جگە لەو سێ شوێنەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باس دەکات لەسەر ڕای زۆربەی زانایان حەرامە، کە دەفەرموێ: (لا تشد الرحال الا الى ثلاثة مساجد، المسجد الحرام ومسجد الرسول (صلی علیه وسلم)



**ج- سوکایەتیکردن بە پێغەمبەران و پیاوچاکان:**

دەیانگوت (شیخ الإسلام) سووکایەتیی بە پێغەمبەران (علیهم السلام) و پیاوچاکان دەکا، چونکە دەڵێ نابێ (توسل) - گێڕانیان بە هۆکاری لێخۆشبوون- بەزات و کەسایەتیی و پلە و پایەیان بکرێ، کە ئەمەش ڕای زۆر لە زانایانە بە دەلیل و بەڵگەی بەهێز.

**د- دەرچوونی لە ئیجماع:**

درۆ هەڵبەستنیان بەوەی شێخ الاسلام لە (ئیجماع) کۆدەنگیی زانایان دەرچووە، هەر لەبەر ئەوەی بە بەڵگە و دەلیل رەخنەی لە مەزهەبەکان دەگرت و بێ ئەوەی تەقلیدی مەزهەبێکی دیاریکراو بکات، ئیجتهادی بۆ هێندێك مەسەلە لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا دەکرد[1].

**٣- گیران و بەندکردن:**

(شیخ الإسلام) لە گیران و بەندکراندا پشك و بەشێکی زۆری پێ براوە، ئەو لە (میسر)و(شام) بەندکراوە، دوور خراوەتەوە بۆ (ئەسکەندەرییە)، چەند جارێك لە بەندیخانەی (قەلعة)دا لە (دیمەشق) بەندکراوە و، لەوێدا وەفاتی کردوە، ناوبراو چەند جارێك گیراوە، لەوانە:

أ- لەساڵی (٦٩٣)ی کۆچی (نائب السلطنة) بۆ ماوەیەکی کەم گرتی بەهۆی وەستانی لە دژی یەکێکی نەصڕانیی بەناوی(عساف) کە جنێوی بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دابوو، دوایی سەربەرزانە ئازاد کرا.

ب- ساڵی (٧٠٥)ی کۆچی لە دیمەشق کاتێك لەبارەی عەقیدەوە موناقەشەی

---

ومسجد الاقصی) رواه البخاري١١٨٩ . کەواتە بەو پێیە یەکێك کە بەمەبەستی عیبادەت سەفەربکات بۆ مزگەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و دواتر لەوێ سەردانی قەبری پێغەمبەر و هەردوو هاوەڵی و... هتد، بکات ئەوە سوننەتی بەجێ هێناوە و خاوەنی پاداشتە. (وەرگێڕ) .

(١) دعوة شیخ الاسلام ٩٧/١



لەگەڵدا کراو ڕایگەیاند کە عەقیدەی ئەو بە پێ ی سوننەتە و بەپێی بە لێکدانەوەی پێشینی چاکە، وەك (ابن رجب و ذهبي) باسیان کردوە، بەڵام ئەو قەناعەت و عەقیدەیە بەدڵی ناحەزانی لە (میسر) نەبوو، بۆیە بۆ موناقەشە کردن لەگەڵی بانگیان کرد بۆ (قاهیرە)، سەرەنجام (ابن مخلوف) ی ناحەزی حوکمی بەندکردنی بەسەردا سەپاند و لە (٢٦ ڕەمەزان)ی ساڵی (٧٠٥)ی کۆچی تا (ربیع الاول)ی ساڵی (٧٠٧) لە بەندیخانەی (قەلعە)دا مایەوە، تا (حسام الدین مهنا بن عیسی) ئەمیری عەرەب لە بەندیخانە دەری هێنا.

ج- ساڵی (٧٠٧)ی کۆچی کە هێندێك لە سۆفییەکان شکایەتیان لێی کرد، هەرچەندە هیچ شتێکی لەسەر ئیسپات نەبوو مایەی گیران بێ، بەڵام دوای ئەوەی دەوڵەت مەلەفی (شیخ الإسلام) ی دایە دەست زانا و قازییەکان و ئەوانیش سەرسام بوون و نەیانزانی بە چ بیانوویەك بیگرن، (شیخ الإسلام) بەپێی خۆی بەرەو بەندیخانە ڕۆیشت.

د- ساڵی (٧٠٨)ی کۆچی دوژمن و ناحەزانی ویستیان لەدەستی ڕزگار بن، بۆیە دووریان خستەوە بۆ (اسکندریة) و لەوێ بەندیانکرد، تا (٨ شوال)ی (٧٠٩)ی کۆچی لە بەندیخانەدا مایەوە، تا سوڵتان ناصر دوای گەڕانەوەی بۆ دەسەڵات و کوشتنی (بیبریس جاشنگیر) بەریدا.

هـ- ساڵی (٧١٨)ی کۆچی بڕیارێکی سوڵتان دەرچوو کە نابێ (شیخ الاسلام) فتوا بدات لە مەسەلەی سوێند خواردن بە تەڵاق، کە دەڵێ: تەڵاقی پێناکەوێ، بەڵکو تەنیا کەفارەتی دەوێ، وە لە (دار السعادة) دانیشتنێکی لەسەر ئەنجام درا، دیسان لە ساڵی (٧١٩)ی کۆچی دا، دانیشتنێکی دیکەی لەسەر ئەنجام درا بۆ دڵنیا بوون لەسەر ئەو بڕیارە، بەڵام (شیخ الإسلام) وازی لە ڕایەکەی خۆی نەهێنا و تا سێیەم مەجلیسی بۆ بەسترا و بڕیاری بۆ درا لە بەندیخانەی (قەلعە)دا لە دیمەشق بەندکرا.

و- ساڵی (٧٢٠)ی کۆچی لەبەر ئەوەی فتوای دابوو لە مەسەلەی (طلاق) جارێکی دیکە گیرا، وە بەیەکجاری بڕیاری نەدانی فتوای بۆ درا، وە (نجم

الدين بن صعري)ی دوژمنی، بڕیاری گرتنی دا، پێنج مانگ و هەژدە ڕۆژ لە بەندیخانەدا هێشتیەوە و لە ڕۆژی دووشەممەی (١٠ محرم)ی ساڵی (٧٢١)ی کۆچی لە بەندیخانە هاتە دەرێ.

ز- دوای ئەوەی ئەهلی بیدعەت و هەوا و نەفس لای سوڵتان درۆیان بۆ هەڵبەستبوو و شتەکەیان لێ گۆڕیبوو، لە ساڵی (٧٢٢)ی کۆچی لەسەر فتوای (شدالرحال) مەسەلەی حەرام بوونی بنە و بارگە تێکنان و سەفەرکردنی تایبەت بۆ سەر گۆڕ و مەزار بەمەبەستی لە خوا نزیك بوونەوە، بڕیاری ڕەسمیی بۆ گیرانی دەرچوو و گیرا.

ڕ- ساڵی (٧٢٦)ی کۆچی کە ئەوە دوا بڕیاری گیرانی بوو، هۆیەکەشی دووبارە فتوای حەرامکردنی بەتایبەتی بنە و بارگە تێکنان و سەفەرکردن بۆ زیارەتی قەبران بوو، کە بەند کرا و لە بەندیخانە مایەوە تا لەوێدا لە ساڵی (٧٢٨) وەفاتی کرد، ئەوەش دوای ئەوەی ناحەزەکانی قسەکانی (شيخ الإسلام) یان گۆڕیبوو، شتێك کە ئەو نەیگوتبوو بۆیان هەڵبەستبوو[1].

## ٤- ئازاردرانی قوتابی و خۆشەویستەکانی:

(شيخ الإسلام) هاوڕێ و هاوکار و دۆست و هەواداری زۆری هەبوون، کە لەگەڵ ئەودا بە دەست و زمانیان فەرمانیان بە چاکە و ڕێگرییان لە خراپە دەکرد، بۆیە ئەوانیش لەو ڕێیەدا تووشی بەشێك لەو ئازارە بوون کە تووشی (شيخ الإسلام) بوو بوو، لە بەندکردن و قسەی ناخۆش پێ گوتران و ئازاردران.

بۆ نموونە: لە نێوەڕاستیی مانگی شەعبانی ساڵی (٧٢٦)ی کۆچی دا (قاضي القضاة) ی شافیعیی بڕیاری دەرکرد بە گرتنی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی (شيخ الإسلام) ئەوەش بە فەرمانی (نائب السلطنة) هێندێکیشی بە شێوەی دیکە تەعزیر کردن و دوایی هەموویانی بەردا، جگە لە (ابن قيم الجوزية)، کە

---

(١) البداية والنهاية ١٤/٥٤، ٨٧، ٩٣، ٩٧، ١١٣/ مجموع الفتاوى ٣/١٦٠، ٢٠١ الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٩٦ - ٤٠٣.



ئەو لە (قەلعە)ی دیمەشق بەندکرا بوو[١].

## ٥- لێسەندنی کتێب و کەلوپەلی نووسین:

ئەم کۆسپە - یان سزادانە بەلای نەیارەکانیەوە- لە هەموو کۆسپەکانی دیکە زیاتر کاری کردە سەر (شیخ الإسلام)، کاتێك کتێبەکانی لێ سەندران و لە خۆشەویستترین شت دابڕێنرا و بێ بەش کرا، کە بریتی بوو لە توێژینەوەی زانستی و تۆمارکردنی بیر و ڕاو فتوایەکانی، بۆ ئەوەی لە بیری بچنەوە و شتی تازە وەدەست نەهێنێ، کە ئەو هەڵوێستەیان مایەی دەرخستنی لێڵیی ژیانیان و گومڕایی و سەرلێشێواویی و عەیب و عاریان بوو، ئەوەش دوای ئەوە هات کە قاضي (عبدالله الأخنائي) سەبارەت بە زیارەتی قەبر بە تایبەتی قەبری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) شتێکی نووسیبوو کە پێچەوانەی بیر و ڕای (إبن تیمیة) بوو، بۆیە ئەویش لە بەندیخانەوە بەرپەرچی دایەوە و سەلماندبووی کە ئەو قازییە کە مالیکیی مەزهەب بوو، زانستێکی کەمی هەیە و بەڵگەی لاوازی هێناونەوە و شتێك دەڵێ کە زانایانی پێشین نەیانگوتوە، قازیی بەوە زۆر تووڕە بوو، شکایەتی لای سوڵتان لێ کرد، سوڵتانیش بڕیارێکی دەرکرد بە لێسەندنی هەموو ئەو کتێب و ئامڕازانەی پێی دەنووسین، بۆ ئەوەی لە (سجن) دا هیچ شتێکی لا نەمێنێ پێی بنووسێ و بتوانێ کتێب دابنێ، وە لە مانگی (رجب)ی ساڵی (٧٢٨)ی کۆچی دا، هەموو رەشنووس و نوسراوەکانی ناردران بۆ کتێبخانەی (العادلیة الکبری) کە بریتی بوون لە نزیکەی (٦٠) شەست بەرگ لە کتێب و (١٤) چواردە مەلزەمە کە خەریکی توێژینەوە و لێ کۆڵینەوەیان بوو[٢].

*** ئامرازەکانی بەرەنگار بوونەوە:**

ئەوەی (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، هەیبوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو گرفت و ئاستەنگانەی دەهاتنە سەر رێی، بریتی بوو لەوەی پێغەمبەران (علیهم السلام) و بانگخوازان - کە سەر مەشقن- هەیانبوو، پەنای بەخوا دەگرت و داوای یارمەتی هەر لەو دەکرد، سەبر و ئارامی هەبوو لەسەر ناخۆشییەکان و چۆکی دانەدەدا، زۆر زکر و یادی خوای دەکرد و بە کوڵ لە خوا دەپاڕایەوە، خاوەنی خوورەوشتی ئیماندارانەی بەرز و پەسند بوو، وە کە قورئانی لەبەر بوو، بێ منەت بوو لەوەی کتێب و پەڕ و کەلوپەلی نووسینی لێ دەستێنن، لەو بارەوە وەك پێشتر باسمان کرد (ابن قیم الجوزیة) چەندان نموونەی هێناوەتەوە لەوانە دەڵێ: خوا ئاگادارە لەگەڵ ئەوەی لە ژیانێکی کەمدەستی و زبریی دا دەژیا و، لە حەبس و هەڕەشە و نا سەقامگیریی دا ژیانی دەبردەسەر، کەسم وەك ئەو نەدیوە لە ژیاندا دڵخۆش و شادومان بێ و، وەکو ئەو بە ورە و دڵقایم بێ، لە دەم و چاوی دا جوانیی و گەشاوەیی دەدرەوشایەوە، کاتێك ترس وبیم لە سەرمان زیادی دەکرد و گومانمان بۆ دروست دەبوو و، ئەرزمان لێ وڕێك دەهاتەوە، کە دەچووینە لای (شیخ الإسلام) هەر کە دەمانبینی و گوێمان لە قسەکانی دەبوو، ئەو ناخۆشییانەمان لەسەر لادەچوون، دەبوو بە دڵکرانەوە و هێز و یەقین و ئارامیی، پاك و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی پێش ئەوەی پێی بگەن بەهەشتی پێشانی عەبدەکانی داوە، وە هەر لە دنیادا دەرگاکانی ئەوێی بۆ کردوونەوە و بۆن و بەرامە و خۆشیی و جوانیی پێ داون، بە جۆرێك هەموو توانا و هەوڵی خۆیانی لە پێناو وەدەستهێنانی دا بۆ خەرج دەکەن و پێشبڕکێی بۆ دەکەن[1].

لەبەرانبەر ئەو ناڕەحەتیی و دەردەسەریانەیدا، لە کۆتایی تەمەنیدا لە سجن دا دەیگوت:

(نحن لله الحمد والشكر في نعم متزايدة متوافرة، وجميع مايفعله الله فيه نصر الإسلام، وهو من نعم الله العظام... ونحن ولله الحمد، على عظيم الجهاد

---

(١) الوابل الصيب ٤٤/ العلماء العزاب ١٧٦ - ١٧٧.



في سبيله، بل جهادنا في هذا مثل جهادنا يوم قازان، والجبلة، والجهمية والإتحادية...)[١].

واتە: حەمد و سوپاس بۆ خوا ئێمە لە نیعمەتی بەردەوام و بەرەو زیادی داین، ئەوەی خوا دەیکات سەرکەوتنی ئیسلامی تێدایە، کە ئەوەش لە نیعمەتە گەورەکانی خوایە. سوپاس بۆ خوا ئێمە لە جیهادێکی گەورە داین لە پێناو خوادا، ئەم جیهادەمان وەك ئەو جیهادەیە کە لە دژی قازان دەجەنگین، یان لە جەبەلییە و لە بەرانبەر جەهمییەکان و سۆفییەکان کە باوەڕیان بە (حلول واتحاد) هەبوو.

ناوبراو رازی بوو بە قەدەری خوا و دەیگوت: هەرشتێك خوا بیکات خێر و بەزەیی و حیکمەتی تێدایە، هیچ زەرەرێك تووشی کەس نابێ، مەگەر بەهۆی گوناهەکانیەوە:

﴿ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ﴾ النساء(٧٩)

بەندە لەسەری پێویستە هەموو کاتێك لە هەموو حاڵەتاندا حەمد و سوپاسی خوای گەورە بکات، وەداوای لێخۆشبون بۆ گوناهەکانی بکات، چونکە سوپاسکردن نیعمەتەکان زیاد دەکا و داوای لێخۆشبوون ناخۆشییەکان لادەبا، خوا هەر شتێك بۆ بەندەکەی بڕیار بدات، هەر خێر و چاکەیە بۆی:

(...ان اصابته سراءً شكر، فكان خيراً له وان اصابته ضراء صبر، فكان خيراً له)[٢]. رواه مسلم.

واتە: ئەگەر خۆشیەکی تووش بوو، سوپاسی خوای لەسەر دەکات وە ئەوە بۆی بەخیر دەگەڕێ، وە ئەگەر ناخۆشیەکی تووش بوو، ئارامی لەسەر دەگرێ، ئەوەش خێرە بۆی، دوای ئەوەی کتێبەکان و پەڕ و ئامرازەکانی نووسینی لێ سەندران و بردیانن بۆ لای قازی (علاء الدين القونوي) و لە کتێبخانەی (العادلية) لە ژێر دەستی ئەو مانەوە، (شيخ الإسلام) بەزۆریی لە ژووری سجن

دا خۆی سەرقاڵی قورئان خوێندن دەکرد، وێڕای عیبادەتی دیکەی شەخسی و بیرکردنەوە و شەونوێژ، هەتا وەفاتی کرد، لەو ماوەیەی لە (قەلعە)دا سجن بوو، (٨٠) یان (٨١) جار ختمی قورئانی کرد، لە کۆتا خەتمی دا گەیشتە کۆتایی سورەتی (اقتربت الساعه)، ئایەتی (ان المتقین فی جنات ونهر، فی مقعد صدق عند ملیك مقتدر)، کە وەفاتی کرد یەکسەرپێش ناشتنی ئەو ختمەشی لەسەر تەواو کرا، هەر رۆژێك سێ جوزئی دەخوێند و، لە دە رۆژان دا خەتمێکی تەواو دەکر، ئەوە قسەی (زین الدین)ی برایەتی کە بۆی باس کردووم[1].

## شەشەم: هێندێك لە بۆچوونەکانی (شیخ الاسلام) لەسەر بانگەواز

### ١- بانگەواز بۆ لای خوا ئەرکی پێغەمبەران (علیهم السلام) و شوێنکەوتوانیانە:

پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)-بە باشترین شێوە- بە ئەرکی بانگەواز هەستاوە، هەر شتێك خوا فەرمانی پێ کردبێ، ئەویش فەرمانی بەوە بە خەڵکی کردوە، وە ڕێگریشیی لێ کردوون لە هەرشتێك خوا ڕێگریی لێ کردبێ، فەرمانی بە هەموو چاکەیەك کردوە و ریگری لە هەموو خراپەیەك کردوە .

هەرشتێك خوا و پێغەمبەری خوا خۆشیان بوێ لە شتی واجب و پەسند، لە ئاشکرا و پەنهان، فەرمانپێ کردنیان بانگەوازە بۆلای خوا، وە هەرشتێك خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕقیان لێ ی بێ، لە ئاشکرا و پەنهان، ڕێگریی لێ کردنی بانگەوازە بۆلای خوا، بانگەواز بۆلای خوا نایەتە دی و تەواو نابێ، مەگەر بانگەواز بکرێ بۆ کردنی هەر شتێك خوا پێی خۆشە، و نەکردنی هەرشتێك کە خوا پێی ناخۆشە، جا ئەو شتە قسە بێ یان کردار، ئاشکرا بێ یان پەنهان[2].



### ٢- ئەرکی سەرشانی ئوممەت بەرانبەر بە بانگەواز بۆلای خوا:

(إبن تیمیة) دەڵێ: بانگەواز بۆلای خوا واجبە لەسەر هەموو ئەوانەی دوای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کەوتوون، کە ئۆممەتەکەیەتی و بانگەواز دەکەن بۆ لای خوا، وەك چۆن ئەو بانگەوازی کردوە، ئەوەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردوە کاری ئەوانیش ئەوەیە و، ئەوەی ئەو ڕێگریی لێ کردوە خەڵکەکەش ڕێگریی لێ دەکەن، وە ئەوەی ئەو هەواڵی پێداون، ئەوانیش ئەوە ڕادەگەیەنن، کەواتە بانگەواز فەرمانکردنە بە هەموو چاکەیەك و ڕێگرییە لە هەموو خراپەیەك[١].

ئەو کارە -بانگەواز بۆ لای خوا- لەسەر تێکڕای ئوممەت واجبە، ئەوەیە کە زانایان ناویان لێ ناوە (فرض الکفایە) ئەگەر کۆمەڵێك پێی هەستن واجب بوونی لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێ، هەموو ئوممەت فەرمانی بەوە پێ کراوە، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێك پێی هەستان لەسەر ئەوانی دیکە لادەچێ[٢].

### ٣- ئارام گرتن وبەردەوامیی بەمەبەستی گێڕانەوەی ئیسلام بۆ ژیان:

(شیخ الإسلام) دەڵێ: زۆر لە خەڵکی ئەگەر خراپەیەکی بینی، یان بارودۆخی مسوڵمانانی بە خراپ و شپرز بینی، زۆر تێك دەچێ و کول دەبێ و وەك خاوەن مصیبەت ناڕەحەت دەبێ و دەگریا و دەناڵێنێ، کە ئەوە نەهی لێ کراوە و نابێ وابێ، بەڵکو فەرمانی پێ کراوە کە بە ئارام و خۆڕاگربێ و پشت بە خوا ببەستێ و، هەردەم چالاك و ورە بەرز و پشت ئەستوور بێ بە یارمەتی خوا، بۆ سەرخستنی ئەم دینە، وە دەڵێ: وە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: (ثم یعود غریبا کما بدأ) گەورەترین غەریبیی دین ئەو کاتەیە کە

---

(١) مجموع الفتاوی ١٥/ ١٦٥.

(٢) مجموع الفتاوی ١٥/ ١٦٥.

ئەوانەی هاتوونە نێویەوە، هەڵدەگەڕێنەوە، بەڵام خوای باڵادەست دەفەرمویٚ:
﴿...مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ...﴾ المائدة(٥٤).

ئاوا بەو شێوەیە سەبارەت بە غەریبیی و لاوازیی دەست پیٚ دەكات تا ورده ورده بەهێز دەبیٚ و بڵاو دەبێتەوە، له زۆر شوێنی دنیایه لاواز دەبیٚ، دوایی بەهێز دەبیٚ و دەردەكەویٚ و خوا پایەداری دەكا و سەری دەخا[1].

## ٤- دۆستانی خواو كردەوەی ڕاست وساغ :

دۆستانی خوا (أولياءالله) هیچ شتێكیان نیه پێیان له خەڵكی جیا بكرێنەوە، له شتی رواڵەت و كاره موباحەكاندا، وەك ئەوەی بەشێوه و بەرگێك، له یەكی دیكە جیا بكرێنەوە، یان بە تاشین و كورت كردنەوەی سەر و . هتد، وەك گوتراوە: زۆر له پیاوچاكان له بەرگێكی سادەدابوون و زۆر له زندیق و بیٚ دینانیش له بەرگی نایاب و عەبادا ژیاون، ئەوان له هەموو چینەكانی ئۆممەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دا هەن، وەك ئەهلی قورئان، ئەهلی علم، ئەهلی جیهاد و جەنگ، ئەهلی بازرگانیی و پیشەسازیی و جوتیار و . هتد.[2].

(شیخ الإسلام) دەڵیٚ: (هەرچەنده كردەوه بە تەنیا بۆ خوا و مەبەست پیٚ ئەو بیٚ، بەڵام ئەگەر بە پێی شەریعەتی خوا نەبیٚ، ئەوه وەرناگیریٚ، هەر وەك چۆن ئەگەر بە پێی شەریعەت بیٚ، بەڵام مەبەست پێی خوا نەبیٚ بەهەمان شێوه وەرناگیریٚ، كەواته دەبیٚ كردەوه بە تەنیا بۆ خوا و، بە پێی شەریعەتی خوا بیٚ، ئەوەش جێبەجیٚ كردنی فەرمانی خوایە كە دەفەرمویٚ:



﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ الكهف (١١٠)[1].

واتە: هەکەسێك دەیەوێ بە- ڕەزامەندیی- خوا بگات، با کردەوەی چاك بکا و لە پەرستنی دا هیچ کەس نەکاتە شەریکی خوا، ئەو نیەتەی خوا وەری دەگرێ و پاداشتی لەسەر دەداتەوە ئەوەیە کە بۆ خوابێ و بۆ ئەو بجوولێ وە کردەوەی چاکیش ئەوەیە فەرمانی کردنی درابێ.



بەشی شەشەم



# پلە و پایەی زانستیی (شیخ الإسلام) و مەدحی زانایان بۆی

لە سەردەمی خۆیدا (شیخ الإسلام) پلە و پایەیەکی زانستیی و کۆمەڵایەتیی گرنگ و بەرزی هەبووە و خاوەنی داهێنان و بیری فراوان و بەهێزیی لەبەر کردن بووە، زانایانی سەردەمی خۆی پێی سەرسام بوون و بە کەسێکی هەڵکەوتووی ناوازە ناویان بردوە، بە جوانترین تەعبیر و وشە مەدحیان کردوە، وەك: (پێشەوا، کۆتا موجتەهید، عەللامە، قورئان و سوننەت لەبەر، موجاهید، کۆکەرەوەی سیفەتە بەرزەکان، ناوازەی زەمانە، پێشەوای تونژەرەوانی قورئان و ... هتد)، وە شاهیدی ئەوەیان داوە کە ناوبراو لەسەر سوننەتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەڕوا و ڕێی پێشینی گرتبۆبەر، وە هەموو ئەو درۆ و بوختانانەی بۆی هەڵدەبەستران، لێیان دوور دەخستنەوە و بەرگرییان لە (إبن تیمیة) دەکرد، چونکە کەسانی ناحەق هەبوون کە نەیاندەتوانی لەڕووی زانستیی و موناقەشەی عیلمیی یەوە بەرانبەری بوەستن، بۆیە پەنایان دەبردە بەر چەکی حوکمڕانان و بەناڕەوا پیلانیان لە دژی دادەڕشت.

(ابو الحسن الندوي) دەربارەی (شیخ الإسلام) دەڵێ: (بێگومان خەڵکێکی زۆر کە باسی چاکەی یەکێك دەکەن، ئەوە مانای ئەوە نیە کە باسکراو کەسێکی چاکە و لە خوا نزیکە، بەڵام ئەگەر کەسانی زانا و شارەزا و چاك و پارێزکار لە زەمانی خۆی دا شایەدیی بۆ یەکێك بدەن و بە چاکە باسی بکەن، ئەوە بەڵگەیە لەسەر بەرزی پلە و پایە و گەورەیی ئەو کەسە، کەوا دەخوازێ قوتابی و



شوێنکەوتووانی ئەو مەدحکراوە، ئینسانی چاك و پاك و پارێزکار بن، (شيخ الإسلام) بەو شێوە بووە و زانایان و کەسانی دیندار و پارێزکار شاهێدیی چاکە و زانایی و گەورەییان بۆ داوە.

هەروەها سەبارەت بە نەیارەکانی دەڵێ: (ئەوانەی نەیاری (شيخ الإسلام) بوون، زۆربەیان دنیا ویست و ئەوانە بوون کە لە دەوڵەت نزیك بوون و شەیدای ناو و پلە و پایە و مەقام بوون، تەنیا ئەوانە نەبێ کە لەبەر لەیەکدی نەگەیشتن، یان راجیایی لە هێندێك بنچینە و چەند مەسەلەیەکدا، کێشەیان لە نێوان پەیدا بووە[1].

## ئێستاش چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو لەبارەی پایەبەرزیی زانستیی (ابن تيمية) وە:

## یەکەم: زانایانی هاوچەرخی خۆی مەدحیان کردوە

١- زانای پایە بەرز لە نێو شەرعزان و فەرموودە ناسان (ابن دقيق العيد) کە لە ساڵی (٧٠٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، لە قسەیەکی دا دەڵێ: (لما اجتمعت بابن تيمية رأيت رجلا العلوم كلها بين عينيه يأخذ منه ما يريد ويدع ما يريد)[2].

واتە: کاتێك لەگەڵ (ابن تيمية) کۆبوومەوە بینیم پیاوێکە هەموو زانیاریەکان لەپێش چاوەکانیەتی، ئەوەی بیەوێ دەیهێنێ و وەری دەگرێ ئەوەی نەیەوێ لێ ی دەگەڕێ.

٢- پێشەوای سەرکەوتوو هەڵکەوتوو و زانا و گەورەی قازییەکان (قاضي القضاة) (محمد بن علي بن الزملكاني الشافعي) کە لە ساڵی (٧٢٧)ی کۆچی دا

---

(١) ابن تيمية للندوى ١٦٧ - ١٧٨.

(٢) الرد الوافر ١١١ / الشهادة الزكية ٢٩.

وەفاتی کردوە، لە بارەی (إبن تیمیة) دەڵێ: (ئەگەر یەکێك پرسیاری لە زانستێك لێ کردبایە بە شێوەیەك وەڵامی دەدایەوە کەوا گومان دەبرا جگە لەو شتە هیچی دیکە نازانێ، وات دەزانی کەس ئەو مەسەلەیە وەکو وی نازانێ، وە زانایان کە لەگەڵی دادەنیشتن، لە بارەی مەزهەبەکانی خۆیانەوە سوودیان لەو دەبینی، نەبیستراوە کە (إبن تیمیة) مشتومڕی زانستی لەگەڵ یەکێکدا کردبێ و سەرنەکەوتبێ..)[1].

وە بەدەست خەتی خۆی چەند دێڕێك لەسەر کتێبی (بیان الدلیل علی ابطال التحلیل)ی (شیخ الإسلام) وەك پەسندییەك دەنووسێ و زیاتر لە (٢٠) سیفەتی باش و گەورەی لێ هەڵدەدا لەوانە: (.. العالم، العلامة، الحافظ، الزاهد، الورع،.. شیخ الإسلام مفتي الأنام، سید العلماء، قدوة الأئمة الفضلاء، ناصر السنة، قامع البدعة.. اخر المجتهدین)[2].

٣- زانا و شەرعزان و پێشەوا، یەکێك لە موجتەهیدەکان (شیخ الإسلام تقي الدین علی بن عبدالکافی السبکی) کە لە ساڵی (٧٥٦)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، لە وەڵامی نامەیەکی ئیمامی ذهەبی دا کە تێیدا رەخنەی لێ دەگرێ و گلەیی لێ دەکا بەوەی دەربارەی (شیخ الإسلام ابن تیمیة) ناهەقی گوتوە، بۆی دەنوسێ و عوزر دێنێتەوە بەوەی لەسەر (ابن تیمیة) گوتوییەتی و دەڵێ: (أما قول سیدی في الشیخ فالمملوك یتحقق کبر قدره و زخارة بحرة، وتوسعه في العلوم الشرعیة والعقلیة، وفرط ذکائه واجتهاده و بلوغه و في کل من ذلك المبلغ الذی یتجاوز الوصف.... وقدره في نفسي أکبر من ذلك وأجل مع ماجمعه الله له من الزهادة والورع والدیانة ونصرة الحق والقیام فیه..)[3]. کە ئیمام زەهەبیی تەئکید لەو مەسەلەیە دەکاتەوە و (ابن حجر)ی عەسقەلانییش لە کتێبی (الدرر الکامنة) دا داکۆکیی لەسەر کردۆتەوە.



٤- زانای پێشەوا و ناودار (أثيرالدين أبوحيان الأندلسي) لە ساڵی (٧٤٥)ی کۆچی وەفاتی کردوە، کاتێك کە (إبن تيمية) بۆ هاندانی سوڵتان و ئەمیرەکان لەسەر جیهاد دەچێتە (میسر) لەوێ (ابوحيان) لەگەڵی کۆدەبێتەوە و دەربارەی (إبن تيمية) دەڵێ: (کەسی وەك "ابن تيمية" م نەبینیوە)[١]، وە لەچەند دێڕە شعرێکیش دا مەدحی زۆری (شيخ الإسلام)ی کردوە کە لە (تأريخ ابن الوردي) دا هاتوە.

٥- پێشەوا و زانا، گەورەی قازییەکان (بهاءالدين محمد بن عبدالبر ابو البقاء السبكي الشافعي) لە ساڵی (٧٧٧)ی کۆچی وەفاتی کردوە، دەربارەی (شيخ الإسلام ابن تيمية) دەڵێ: (سوێند بەخوا کەسێکی نەزان نەبێ یان ژێر دەستی هەواو نەفسی نەبێ (إبن تيمية) نابوغزێنێ و دژایەتیی ناکا، نەزان بۆ خۆشیی نازانێ دەڵێ چی، خاوەن هەوا و نەفسیش هەوا و نەفسەکەی لە هەق لای دەدا هەرچەندە زانیاریشی پێیە).[٢]

٦- زانای شەرعزان، قازی (زين الدين علي بن مخلوف المالكي) ساڵی (٧١٦)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، هەرچەندە ناحەزی (إبن تيمية) بووە، بەڵام مەدحی کردوە بەتایبەتی لەرووی سینگ فراوانی و لێبوردەیی یەوە، کە خۆی خراپەی بەرانبەر بە (إبن تيمية) کردوە، بەڵام ئەو بە لێبوردەیی وەڵامی داوەتەوە[٣].

٧- زانا و شەرعزان و پێشەوا و قورئان و حەدیس لەبەر (ابو الفتح محمد بن محمد بن سيدالناس اليعمري الشافعي) لە ساڵی (٧٣٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، کە زۆر مەدحی (إبن تيمية) دەکات لە رووی زانایی و شارەزاییەوە لە تەفسیر و ئوصول و حەدیس و فیقهو زانیاری بە دین و مەزهەب و پێڕ و تاقمەکان و، دەڵێ لە هەموو زانستەکان دا لە هاورێکانی شارەزاتر بووە لە سەردەمی خۆی دا[٤].

٨- زانای گەورە و شارەزا و شەرعزان، مێژووناس (القاسم بن محمد البرزالی الأشبیلی) کە لە ساڵی (٧٣٨)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، دەربارە (إبن تیمیة) دەڵێ: (الإمام المجمع علی فضله...... وبلغ رتبة إلاجتهاد واجتمعت فیه شروط المجتهدین)[١].

٩- زانا و شارەزای هەڵکەوتوو (عمر بن مظفر بن عمر، أبي الفوارس ابن الوردی الحلبی الشافعي) لە ساڵی (٧٤٩)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، کە زانایانی شام باس دەکات دەربارەی (إبن تیمیة) دەڵێ: (وحضرت مجالس ابن تیمیة فاذا هو بیت القصیدة وأول الخریدة، علماء زمانه فلك هو قطبه، وجسم هو قلبه، یزید علیهم زیادة الشمس علی البدر...)[٢].

١٠- پێشەوای زانا و ڕەببانیی (عمادالدین احمد بن ابراهیم بن عبدالرحمن الواسطي ابن شیخ الحزامیین) لەساڵی (٧١١)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، لە نووسراوێکی دا کە باسی (إبن تیمیة) دەکا زانایانی دیمەشق و هاوەڵانی (إبن تیمیة) دەدوێنێ و دەڵێ: سوێند بە خوا سوێند بەخوا، سوێند بە خوا، لەم سەردەمەدا کەس وەك شێخەکەتان نەبینراوە لەلایەنی زانست و کردەوە و ڕەوشت و خووی بەرز و شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)دا. وە کەس نەبینراوە بە شێوەی ئەو سوننەتەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)ی تێدا درەوشابنەوە[٣].

## دووەم: باسکرانی بە چاکە لە لایەن قوتابییەکانی و ئەوانەی لە پلەی ئەواندان

١- زانا و فەرموودەناس و قورئان و سوننەت لەبەر (جمال الدين ابو الحجاج يوسف بن عبدالرحمن المزي الشافعي) لە ساڵی (٧٤٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، دەربارەی (شيخ الإسلام) گوتوویەتی (کەسم وەکو ئەو شارەزا بە قورئان و سوننەت و پابەندپێیانەوە نەدیوە)[1]. زۆر قسەی دیکەشی لەسەر گەورەیی (شيخ الإسلام) هەن.

٢- پێشەوا و قورئان و سوننەت لەبەر و مێژوو نووس و زانا و فەرموودەناس (شمس الدين ابو عبدالله محمد بن احمد بن عثمان الذهبي) کە ساڵی (٧٤٨)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، لەزۆر شوێن مەدحی (شيخ الإسلام ابن تيمية)ی کردوە لە شوێنێکدا دەڵێ: (شيخنا وشيخ الإسلام وفريد العصر علما ومعرفة و شجاعة وذكاء وتنويرا الهيا وكرما ونصحا للأمة..)[2].

٣- پێشەوا و زانای پلە بەرز و هەڵکەوتوو توێژەرەوەی قورئان ابو عبدالله محمد بن ابي بكر بن ايوب الزرعي الدمشقي (ابن قيم الجوزية) کە لەساڵی (٧٥١)ی کۆچی وەفاتی کردوە، کە بە یەکێك لە قوتابییە زۆرشارەزاکانی (شيخ الإسلام) دەژمێردرێ.[3]

٤- پێشەوا و زانای گەورە قورئان و سوننەت لەبەر، مێژوو نووس و توێژەرەوەی قورئان (عماد الدين أبو الفداء اسماعيل بن كثير الدمشقي) لە ساڵی (٧٧٤)ی کۆچی

---

(١) الرد الوافر ٢٣٠/ العقود الدرية ٧.

(٢) شذرات الذهب ٨١/٦ الرد الوافر ٧.

(٣) الشهادة الزكية ٣٤.

دا وەفاتی کردوە، کە چەند جارێك لە مەدحی (شیخ الإسلام) دا نووسیویەتی.[١]

٥- پێشەوا و زانای شارەزا (شمس الدین محمد بن احمد بن عبدالهادي الدمشقي الحنبلي) کە لە ساڵی (٧٤٤)ی کۆچی وەفاتی کردوە، بە چەندان وشەی جوان و ڕستەی ڕێك و پێك مەدحی (شیخ الإسلام)ی کردوە[٢].

٦- زانای ناودار و شارەزا (ابو العباس احمد بن یحیی بن فضل الله العدوي العمري الشافعي).[٣]

٧- زانای ناودار (صلاح الدین خلیل بن أیبك الصفدی الشافعي) لە ساڵی (٧٦٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.[٤]

٨- زانای فەرموودەناس و شارەزا و مێژوو ناس (شمس الدین محمد بن یحیی بن مفلح المقدسي الصالحي) لە ساڵی (٧٥٩)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.[٥]

٩- زانای ناودار (زین الدین ابو الفرج عبدالرحمن بن احمد بن رجب الحنبلي) لە ساڵی (٧٩٥)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.[٦]

١٠- پێشەوا و زانای شەرعزان (صلاح الدین ابو سعید خلیل بن کیکلدي العلائي) لە ساڵی (٧٦١)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.[٧]

ئەو زانا و پێشەوایانەی رابردن هەریەکەیان بە شێوەیەك مەدحی (شیخ الإسلام ابن تیمیة)یان کردوە و باسی گەورەیی و زانایی و دینداریی و دەور و

---

(١) الرد الوافر ٦٦.

(٢) الرد الوافر ٦٤ / العقود الدریة ١٨.

(٣) الرد الوافر ١٤٧

(٤) الوافي بالوفیات ١٥/٧

(٥) الشهادة الزکیة ٦٠.

(٦) الرد الوافر ١٨٩.

(٧) الدرر الکامنة.



کارگەریی نابراویان کردوە و، بە زانایەکی ناوازە و بلیمەت ناویان بردوە و بە مامۆستا و (شیخ الإسلام) یان داناوە و ڕێزیان بۆی هەبووە.

## سێیەم: قسە و مەدحی گەورە پیاوانی دیکە بۆی

١- پێشەوا و زانای ناودار و قورئان و سوننەت لەبەر و شەرعزان و فەرمودەناس و گەورەی قازیەکان (احمد بن علی بن حجر العسقلاني الشافعي) کە لە ساڵی (٨٥٢)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، و دەربارەی ئەو گوتوویەتی: (وشهرة امامة شيخ تقي الدين- ابن تيمية- أشهر من الشمس و تلقيبه ب(شيخ الإسلام) في عصره باق الى الان على الألسنة الزكية، و يستمر غدا كما كان بالأمس ولا ينكر ذلك الا من جهل مقداره، أو تجنب الإنصاف..)[1]. لە (فتح الباری) یش دا بە (علامة) ناوی بردوە.

٢- پێشەوا و زانای ناودار (بدرالدين محمود بن احمد العينى الحنفي) لە ساڵی (٨٥٥)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، دەربارەی (شيخ الإسلام ابن تيمية) دەڵێ: (وهو إلامام الفاضل، البارع، التقي، النقي، الورع، الفارس في علمى الحديث والتفسير والفقه والأصول بالتقرير والتحرير، والسيف الصارم على المبتدعين، والحبر القائم بأمور الدين والأمار بالمعروف والناهي عن المنكر...)[2].

٣- پێشەوای زانای موجتەهید (شيخ الإسلام عمر بن رسلان بن نصير بن صالح البلقيني) ساڵی (٨٠٥)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، دەربارەی (شيخ الإسلام) دەڵێ: (عالم زمانه، والفائق على أقرانه..)[3].

٤- پێشەوا و فەرمووده‌ناس (جلال الدين عبدالرحمن بن ابى بكر السيوطي الشافعي) لە ساڵی (٩١١)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە، لە قسەیەکی دا دەربارەی (شيخ الإسلام) دەڵێ: (ابن تيمية الشيخ، الامام، العلامة، الحافظ، الناقد، الفقيه المجتهد، المفسر، البارع (شيخ الإسلام) علم الزهاد، نادرة العصر...)[1].

٥- زانای بەناوبانگ (علي بن سلطان محمد القاري الهروي) لە ساڵی (١٠١٤)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

٦- زانای شەرعزانیی مێژووناس (ابى الفلاح عبدالحى بن العماد الحنبلي) لە ساڵی (١٠٨٩)ی کۆچی وەفاتی کردوە.

٧- پێشەوای شەرعزان و فەرمووده‌ناس (شيخ الإسلام محمد بن على الشوكانى) لە ساڵی (١٢٥٠)ی کۆچی دا وەفاتی کردوە.

هەریەك لەو زانا و ناودارانەش کەباسمان کردن، بە شێوەیەك باسیان لە زانایی (شيخ الإسلام ابن تيمية) کردوە، وەك چاوساغ و سەرڕاستێکی دین ناویان بردوە، و زۆربەیان وەك موجتەهیدێك سەیریان کردوە، وێڕای سەدان زانای ناوداری دیکەی ئیسلامیی کە بە خێر و چاکە ناویان هێناوە و، لە زۆربەی وڵاتانی مسوڵمان نشین زانایان و مسوڵمانان بە گشتی لە کتێب و نووسینەکانی ناوبراو بەهرەمەند بوون و، وەك خەزێنەیەکی پڕ گەوهەر و مرواریی سەیریان کردوون، خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی (شيخ الإسلام) و سەرجەم زانا و پێشەوایانی دیکە کە مایەی بەرچاو ڕوونیی خەڵك و ڕۆشنکردنەوەی حوکمە شەرعییەکان بوون، بداتەوە، کە دەور و کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لە وریاکردنەوەی خەڵکی، سەبارەت بە کاریگەریی نووسراوەکانی (شيخ الإسلام) توێژەری (دائرە المعارف الإسلامية) دەڵێ: (ابن تيمية) لەو نووسەرانەیە کە کاریگەرییەکی زۆریان هەبووە لەسەر مسوڵمانان لە ڕابردوودا و هەتا ئێستاش، بەتایبەتی ئەهلی سوننەت[2].



بەشی حەوتەم



# نووسراوەکانی (شیخ الإسلام) و بەهای زانستییان

وەك پێشتر باس کرا (شیخ الإسلام) یەکێك بووە لە زانا پایە بەرزەکانی ئیسلام، بە بەرهەمە بە نرخەکانی لە تێکڕای بوارەکانی زانستدا کتێبخانەی ئیسلامیی دەوڵەمەند کردوە، بێگومان بەرهەم و کەلەپووری زانستی هەر زانایەك کە لە دوای خۆی بەجێی دێڵێ گەورەترین بەڵگە و شاهێدی ئاستی زانستی ئەو زانایەیە و کتێب و نووسراوەکانی جۆری کەسایەتیی و تاڕاددەیەك شێوازی ژیانیشی دەردەخەن، (شیخ الإسلام)، دوای خۆیشی بەهۆی ئەو بەرهەمە بەنرخ و بە پێزانەیەوە،کە بەجێی هێشتوون، کەسایەتیی زانستی هەروا بە گەورەیی ماوەتەوە.

## بەهای کتێب و نووسینەکانی (شیخ الإسلام):

دوای ئەوەی زانایان کتێب و نووسراوەکانی (شیخ الإسلام) یان هەڵسەنگاندن و بۆیان دەرکەوت کە چ نرخ و بەهایەکی زۆریان هەیە! مەدحی خۆی و نووسراوەکانیان کردوە و باسیان لە بڵاوبوونەوەی بەرفراوانیان کردوە.

زانای گەورە (ابن عبدالهادي) دەڵێ: (شیخ الإسلام ابن تیمیة رحمه الله، صاحب التصانیف التي لم یسبق الی مثلها ولا یلحق فی شکلها توحیدا، وتفسیرا



واخلاصا وفقها و حديثا ولغة ونحوا وبجميع العلوم كتبه طافحة بذلك)[1]

واتە: (شیخ الإسلام) خاوەنی چەندان کتێب،کە وێنەیان نەبووە........

الحافظ (ابن الزملكاني)یش (رحمه الله)، دەڵێ: (كان له اليد الطولى في حسن التصنيف وجودة العبارة والترتيب والتقسيم والتبيين)[2].

واتە: دەستیکی باڵای هەبووە لە نووسینی کتێب و دارِشتنی جوان و رێك و پێك کردن و دابەشکردن و روونکردنەوەدا.

## شێوازی نووسینەکانی:

دەتوانین شێوازی نووسینەکانی (شیخ الاسلام) لەم چەند خاڵەدا بخەینە ڕوو:

١- بەستنەوەی نووسینەکانی بە ژیان و هەلومەرجەکەیەوە، لەمیانی ژیان بەسەربردنی لەگەڵ رووداوەکان و تۆمارکردنیان و وتووێژ لەسەر کردنیان و دیاری کردنی ڕای ڕاست و دروست لەبارەیانەوە، کە ئەوە بوو بەهۆی ئەوەی کتێب و نووسراوەکانی هێز و زیندوویەتی و کاریگەرییەکی گەورە وەدەست بێنن، کە زۆر بەکەمی لە کتێب و نووسراوی نووسەر و دانەرانی دیکەدا دەستدەکەوێ.

٢- بەکارهێنانی شێوازی زانستیی لە قەناعەت پێ هێنانی بەرانبەرەکانی دا و ناچارکردنیان بە بەڵگەی بەهێز لە میانەی بەڵگە هێنانەوەی لەسەریان بە قسەی پێشەوایەکانی خۆیان، وە بەکارهێنانی شێوازی مەنتیقیی یانەیان، کە بازنەی مشتومڕەکە لەسەر نەیارەکانی تەسك دەکاتەوە.



٣- روون و ڕۆشنی: کە زۆربەی جاران لە مشت و مڕەکانی دا بەرپەرچی نەیارانی داوەتەوە و، ڕەخنەی لە بەرانبەرەکانی گرتووە، ئەو ڕوون و ڕۆشنیی یە زۆر گرنگ و کاریگەر بووە لەو ڕووەوە.

٤- شێوازی مەوسووعیی و هەمەلایەنەی لە یەك مەسەلەدا، کە ئەوە وای کرد نووسینەکانی شێوازێکی تایبەت وەربگرن و خوێنەر والێبکەن بەو زانیارییە بەنرخانەی تێیاندان بێ نیاز بێ لەوەی بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە و کتێبەکانی دیکە، دەربارەی ئەو باسەی قسەی لێ دەکا و دەیتوێژێتەوە.

٥- هێنانەوەی زۆر دەق و قسەی پێشەوایان کە ئەمەش هێز و رەسەنایەتیی زیاتر دەبەخشێتە کتێبەکانی، دواییش بەستنەوەی ئەو دەقانە بە روونکردنەوە و سەرنجەکانی خۆیەوە، لەگەڵ باسکردنی پلە و پایەی زانستی ئەو زانایەی لێی وەرگرتوە، بەوە خوێنەر هەست بەوە دەکات کە (شیخ الإسلام) فەزڵ و چاکەی زانایان دەزانێ و دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوان.

٦- ئەو کتێب و نووسراوانە زانایی و ئاگاداری زۆری (شیخ الإسلام) دەردەخەن لەسەر ئەو شتانەی ناکۆکییان تێدایە، وێڕای توێژینەوە بەراوردکارییەکان بۆ ئەو مەسەلانەی ڕایدەنواندن، کە وای کرد حوکمەکان لە ڕاستیی و سەلامەتیی تەواو و ئەوپەڕی وردبینیی و کەم هەڵەیی نزیکترین و، لە دڵ و عەقڵی خەڵکی نزیکتر بن.

٧- لە مەسەلە فیقهییەکاندا وشکیی و بەزەحمەت خستنی تێدا نییە، بەو شێوەیەی بەسەر نووسراو و کتێبەکانی زۆر لە زانایانی پاشین دا دیارە، ئەو لە نووسراوە فیقهییەکانی دا خۆی دووردەخستەوە لەو شێوازە، کە بەوە تەکانێکی بەهێزی بە فیقهی ئیسلامیی دا و لە لای خەڵکی بەگشتی کاتێك بەرنامەی پێشینی ڕادەنواند مایەی قبووڵ و ڕەزامەندیی بوو، کە خوێنەر نووسراوەکانی (شیخ الإسلام) دەخوێنێتەوە هەست بە ڕێك و پێکیی وشە و ماناکان و زۆریی زانست و زانیاری نووسراوەکان دەکات، کە ئەو سیفەتە جگە لە نووسراوەکانی لە کۆڕ و مەجلیسی دەرسەکانیشی دا هەستی پێ دەکرا.

٨- هەبوونی توانا لەسەر هەڵێنجانی حوکم و گێڕانەوەی بنچینەکان بۆ ڕەگ و ڕیشەی شەرعیی و لق و پۆپ لێ کردنەوەیان، وە بە هێزیی بەڵگە و دەلیل لە مشت و مڕەکان دا، کەئەوە هێز و پێزی زیاتری دابووە کتێبەکانی و تام و چێژێکی زۆری دەبەخشیە خوێنەر.

٩- زانینێکی زۆر و فراوان بە ئامانجە شەرعییەکان و شارەزاییەکی زۆر لەسەر کاکڵ و نێوەڕۆکی دین و یاساکانی و شەرح کردنێکی سەرکەوتوانە یان.

١٠- گرنگی دان بە دەستپاکی زانستی و وردی لە نەقڵ کردنی قسە و دەقەکان دا، کە زۆرجاران هەر بە مانا نەبووە، بەڵکو بە لەفز و وشە وەك خۆیان دەیهێنان، لەگەڵ ئاماژەدان بە سەرچاوە و ئەوکەسەش کە گوتوونی.

١١- درێژیی و لق و پۆپ لێکردنەوە، کە هێندێك جار قسەی پێشەوایانی دێنایەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە نێوەڕۆکی کتێبەکەیەوە نەبووە، بەڵام مەبەستی ئەوە بووە، زانیارییەك باس بکات کە ناڕاستەوخۆ پەیوەندیی هەیە بە باسەکەوە، یان مەبەستی زیاتر سوود گەیاندنی بووە بە خوێنەر.

١٢- یەکلابوونەوە بۆ هەق و ڕاستیی و قبووڵ کردنی لەلای هەرکەسێکەوە بوویێ، هەرچەندە ئەوکەسە لە زۆر مەسەلەی زانستیشدا پێچەوانەی ئەو بوویێ، هەروەها واقیع بینانە هەڵسوکەوتی دەکرد چاکەکانی باس دەکردن، (شیخ الإسلام) بەوەوە بە ناوبانگ بووە، کەسی بەکەم سەیر نەکردوە و چاکەی هەموو خەڵکی بینیوە.

١٣- چەند بارەکردنەوەی یەك مەسەلە لەچەند شوێنێکدا، کە لە نووسراوەکانی دا ئەوە دەبینرێ، ئەوەش لەبەر داکۆکیی کردنی و گرنگیی پێ دانی بووە بەو مەسەلەیە کە توێژیویەتەوە.

١٤- فراوانیی ئاسۆی تێگەیشتنی (شیخ الإسلام) و شارەزاییە سەر سوڕهێنەرەکەی لە هەموو جۆرە زانستەکانی سەردەمی خۆی دا، کە وایکردبوو باوەڕی بەخۆی بێ لەوەی دەیلێ، ئەوەش هێزێکی زۆری بۆ دروستکردبوو لە هەر مشت و مڕ و توێژینەوەیەك دا کە ئەنجامی دەدا.



١٥- خێرایی و تێگەیشتن و بەتوانایی لە هێنانی بەڵگە و دەلیل لە قورئان و سوننەت و قسەی پێشینی چاکدا، بە ئەندازەیەك کە شارەزایان و قورئان و سوننەت لەبەران و پسپۆڕانی بوارەکان پێی سەرسام بوو بوون، لەو بارەوە حافیظی ذەهەبیی دەڵێ: (مارأيت أسرع انتزاعا للايات الدالة على المسألة التي يوردها منه)[1].

واتە: کەسم لەو خێراتر نەبینیوە بۆ دانانی ئەو ئایەتانەی باس لە مەسەلەکە دەکەن. بەڵام لەوانەیە ئەو شتەی لە نووسراوەکانی دا لیٚ ی بە رەخنە دەگیرێ، بریتی بێ لە بە درێژی نووسینی و بە کەمترین هۆ گواستنەوەی لە باسێکەوە بۆ باسێکی دیکە، کە لەوانەیە خوێنەر سەری لێ بشێوێ، بە تایبەتی ئەگەر شێواز و بەرنامەی نووسینی (شيخ الإسلام) نەزانێ.

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بیر تیژیی و زۆر زیرەکیی و شارەزایی و حەماسەتی سروشتی (شيخ الإسلام)، خۆ ئەگەر خوێندکاری ڕاست خۆی ماندوو و یەکلا بکاتەوە و جیددیی بێ لەسەر خوێندنەوە و بەدەستهێنانی زانیاری و بچێتە بنج و بناوانی نووسراوەکانی ناوبراوەوە ئەوە بێگومان بە دوڕڕو گەوهەری بە نرخ و گرانبەهاوە دەگەڕێتەوە[2].



## هۆکارى زۆریی نووسراوەکانی شیخ الاسلام

### ١- دەستکردن بە نووسین لە سەرەتای تەمەنییەوە:

(شيخ الإسلام) لە تەمەنی گەنجییەوە دەستی بە نووسین کردوە، ئەوەش زیرەکی و لێهاتوویی ناوبراو دەگەیەنێ، وەك (ئیمام ذەهەبیی) باسی کردوە، کە لە تەمەنی (١٩) نۆزدە ساڵییدا (شيخ الإسلام) فتوای داوە.

وە (الحافظ ابن رجب) ی حەنبەلییش دەڵێ: (شرع الشيخ في الجمع والتصنيف من دون العشرين...)[1]

واتە: شيخ الإسلام دەستی کردوە بە کۆکردنەوەی زانیارییەکان و کتێب نووسین، لەکاتێکدا کە تەمەنی بیست ساڵ کەمتر بوو.

تەمەنی (شيخ الإسلام) (٦٧) شەست و حەوت ساڵ بووە و لەتەمەنی خوار بیست ساڵییش، دەستی بە نووسین کردوە، کەواتە نزیکەی نیو سەدە خەریکی فتواو نووسین و دانانی کتێب بووە، کە ئەوە هۆیەکی زۆریی کتێب و نووسراوەکانیەتی.

### ٢- شارەزایی (شيخ الإسلام) و خێرایی لە نووسین و دانانی کتێب دا:

خوای گەورە توانای زۆری دابۆیە لە خێرایی نووسین دا، کە ئەمە لە زۆری بەرهەمەکانی دا دەردەکەوێ، (الحافظ الصفدی) لەوبارەوە مەدحی دەکات[2]، و (ابو عبدالله بن رشيق) نووسەرەوەی دانراوەکانی (شيخ الإسلام) دەڵێ: (ولو اراد الشيخ تقي الدين أو غيره حصرها - يعني مؤلفات الشيخ- لما قدروا لأنه مازال



یكتب وقد من الله عليه بسرعة الكتابة، ويكتب من حفظه من غير نقل[١].

واتە: ئەگەر (إبن تيمية) یان غەیری ئەو بیەوێ سەرژمێریی نووسراوەکانی (شيخ الإسلام) بکات، ئەوە ناتوانێ، چونکە بەو نیعمەتەی خوا پێی داوە لە خێرایی نووسین دا بەردەوام دەینووسی، شتەکانی لەبەر بوون و بێ نەقڵ کردن دەینوسین، هەریەك لە (الذهبي)[٢]، و (ابن القيم)[٣] و (ابن عبدالهادي) و (ابن سيد الناس)یش[٤]، باسیان لە خێرایی نووسینی کتێبەکانیان کردوە و ئاماژەیان بە زۆری کتێبەکانی داوە.

٣- چوونە نێو مشت و مڕ و موناقەشەوە لەگەڵ زانایانی سەردەمی خۆی، لە بوارەکانی فیکریی و فیقهیی دا، کە ئەوەش هاندان و ئامادە بوون بوو، بۆ نووسین و دانانی کتێب و سەرخستنی ڕاو بۆچوونەکانی.

٤- هیچ کار و پلە و پۆستێکی ڕەسمیی دەوڵەتی نەبوو، کە ئەوە کاتێکی زۆر لە ژیانی زانایان دەگرێ و خەڵکی بێ بەش دەبن لە سوود وەرگرتن لە زانیارییەکانیان، (شيخ الإسلام) ڕازی نەبوو هیچ پلە و پایە و پۆستێك لە سوڵتان وەربگرێ، (ابن رجب) دەڵێ: پێش ساڵی (٦٩٠)ی کۆچی پێشنیاری (قاضي القضاة) و (مشيخة الشيوخ) ی بۆ کراوە کە وەریان بگرێ، بەڵام ئەو هیچی لەوانە وەرنەگرتوە[٥].

٥- (شيخ الإسلام) هیچ شتێکی پێش وەدەستهێنانی زانیاری وبۆ یەکلا بوونەوەی نەخستوە، هەرچەندە زۆر گرنگیش بوبێ، هەر بۆیە ئاوا زوو پێگەیشتوە و کتێبی زۆری داناون و خەڵکی لێیان بەهرەمەند بوون.

(الحافظ البزار) لەو بارەوە دەڵێ: (وما رأيناه يذكر شيئا من ملاذ الدنيا ونعيمها، ولا كان يخوض في شيء من حديثها ولا يسأل عن شيء من معيشتها، بل جعل همه وحديثه في طلب الاخرة وما يقرب الى الله تعالى)[1].

واتە: نەماندیوە باسی خۆشییەکی دنیا و لەززەتێکی بکات، وە نەدەچۆ نێو باسێکەوە لەوبارەوە، بۆ ژیانی خۆی هیچی داوا نەدەکرد، بەڵکو هەموو قسە و ویست و مەبەستی، داواکردنی شتێك بوو کە لە خوای نزیك دەکردەوە و پێی دەگەیشتە بەهەشت.

## ژمارەی کتێب و نووسراوەکانی (شيخ الإسلام):

زانایان باسی ئەوەیان کردوە کە نووسین و دانراوەکانی (شيخ الإسلام) یەکجار زۆرن و ژماردنیان بە زەحمەتە، هەربۆیە لە دیاری کردنی ژمارەیان دا، قسەکانیان جیاوازن.

- (الحافظ البزار) دەڵێ: (وأما مؤلفاته و مصنفاته فانها أكثر من أن أقدر على إحصائها...)[2].

واتە: کتێب و دانراوەکانی لەوە زیاترن من بتوانم سەرژمێریان بکەم.

- (ابن عبدالهادي) دەڵێ: (وللشيخ من المصنفات والفتاوى والقواعد و الأجوبة والرسائل وغير ذلك من الفوائد مالا ينضبط)[3].

واتە: (شيخ الإسلام) چەندان نووسراو و فتوا و وەڵام و نامە و شتی دیکەی هەن کە سوودیان لێ دەبینرێ و لەبەر زۆرییان ناژمێردرێن، وە زۆربەی کتێبەکانی بە سوود وەرگرتن لەوەی لەبەری بووە داناون و زۆربەشیانی لە بەندیخانەدا نووسیون، کە هیچ کتێبی لانەبوون.

---

(١) الاعلام العلية ٣٣.

(٢) الاعلام العلية ٥٣.

(٣) العقود الدرية ٢٠ - ٢١.



- (ابن رجب) دەڵێ: (وأما تصانيفه فهي أشهر من أن تذكر..... وقد جاوزت حد الكثرة فلا يمكن لأحد حصرها)[1]

واتە: کتێبەکانی لەوە بەناوبانگترن کە باس بکرێن.. لە ئەندازەی زۆریی رەتی داوە و کەس ناتوانێ بیانژمێرێ.

- (ابن القيم) قوتابی پایەبەرزی (شيخ الإسلام) لە (أسماء مؤلفات شيخ الإسلام)دا ناوی (٣٣٧) نووسراوی ناوبراوی باس کردوە، و ئاماژە بەوە دەکات کە نەیتوانیوە ناوی هەموو نووسراوەکانی کۆ بکاتەوە.

- (الإمام الذهبي)یش لە کۆتا قسەی سەبارەت بە ژمارەی نووسراوەکانی (شيخ الإسلام) دەڵێ: (نووسراوەکانی لە (١٠٠٠) تێپەڕیون[2].

لەڕاستیی دا لەوەوە کە رابرد بۆمان دەردەکەوێ، کە هەموو ئەوانەی باسیان لە ژمارەی نووسراوەکانی (شيخ الإسلام) کردوە، یەکدەنگن لەسەر ئەوەی زانینی ژمارەیان بە زەحمەتە، هۆی ئەوەش کە نەتوانراوە ژمارەیان بزانرێ، ئەم چەند خاڵەیە:

١- تاقی کرانەوە و بەڵا و ناخۆشییەکان کە بەسەر (شيخ الإسلام) دا هاتوون، بوونە هۆی نەمان و فەوتانی هێندێك لە نووسراوەکانی، زۆر جاران دەیگوت دەربارەی ئەو مەسەلەیە شتێکم نووسیوە، بەڵام نەیدەزانی چی لێ هاتوە؟ بە هاوەڵانی دەگوت ئەو دەستنووسانەم بۆ بێننەوە و با بڵاو ببنەوە، بەڵام ئەوان لەبەر داکۆکییان لە سەر نووسراوەکان، لەلای خۆیان دەیانهێشتنەوە و نەشیاندەتوانی بڵاویان بکەنەوە[3].

٢- کە یەکێك پرسیاری لێ کردوە، وەڵامەکەی بۆ نووسیوە و ئەوکەسە بردوویەتی، دوایی کە بینراییتەوە و وەڵامەکەی نوسراییتەوە ئەوە باشە، ئەگەرنا وەڵامەکەی بردوە و ڕۆیشتوە[4].

---

(١) ذيل طبقات الحنابلة ٤٠٣/٢.

(٢) الرد الوافر ٧٢.

(٣) العقود الدرية ٢٠٧/ الفتاوى ١٦١/٣.

(٤) العقود الدرية ٦٥.

٣- (ابن عبدالهادي) دەڵێ: کە (شیخ الإسلام) گیراوە کتێبەکانی و شوێنکەوتووانی پەرت و بڵاو بوون، هاوەڵانیان ترسێنراون کە کتێبەکان دەربخەن و هەریەکەیان هێندێکیان بردوون و شاردوویاننەوە، دەست خەڵکی زۆر کەوتوون و هێندێکیان فرۆشراون و، هێندێکیان لای خەڵکی دانراون و، بەشێکیان فەوتاون و، هێندێکیان شاردراونەوە و بەو شێوەیە پەرت و بڵاو بوون و زۆربەیان لەنێوچوون[1].

٤- ئەو کتێبە زۆرانەی (شیخ الإسلام) کە لە (سجن)دا لەلای خۆی بوون، کاتێك کە لێ ی سەندران، ناحەزانی دابەشیانکردن بەسەر خەڵکیدا، کە هێندێکیان ئاشکرایان کردن و گێڕایاننەوە بۆ (زین الدین عبدالرحمن)ی برای و، هێندێك لە کتێبەکانیش ناحەزەکانی فەوتاندوویانن.

ئەو دژایەتیی کرانەی (شیخ الإسلام) و کتێبەکانی لە دوای خۆشی بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو، ناحەزانی هەوڵی زۆریان داوە بۆ فەوتاندنی کێبەکانی و پارە و پوولێکی زۆریان تەرخانکردوە بۆ کڕینی کتێبەکان و لەنێویان دەبردن، هێندێك جاریش ناحەزان پەنایان دەبردە بەر ترساندن و تۆقاندنی ئەوانەی کتێبەکانی ناوبراویان لەلابووە، بۆ ئەوەی بیانفەوتێنن، کە ئەوە شێوازێکی خراپ و ناشیرینیی ناحەزان بوو، بەرانبەری ئەنجام دەدرا.

## دیارترین کتێب و نووسراوەکانی (شیخ الاسلام) :

١- إبطال الحیل دوو بەرگ.

٢- اختیارات شیخ الإسلام ابن تیمیة.

٣- الإستغاثة.

٤- الإستقامة.

٥- إقامة الدلیل علی إبطال التحلیل.

٦- اقتضاء الصراط المستقم و مخالفة أصحاب الجحیم.



٧- أقسام القرآن.

٨- الإكليل في التشابه والتأويل.

٩- أمثال القرآن.

١٠- الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر.

١١- الإيمان.

١٢- بغية المرتاد = السبعينية.

١٣- بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية.

١٤- تحريم السماع.

١٥- التحفة العراقية في الأعمال القلبية.

١٦- التدمرية.

١٧- تعارض الحسنات والسيئات.

١٨- تعليقه على فتوح الغيب لعبد القادر الكيلاني.

١٩- تفسير سورة الإخلاص.

٢٠- تفسير سورتي المعوذتين.

٢١- تفسير سورة النور.

٢٢- تنبيه الرجل العاقل على تمويه الجدل الباطل.

٢٣- جواب أهل العلم والإيمان، بتحقيق ما أخبر به رسول الرحمن من أن (قل هو الله احد تعدل ثلث القرآن)

٢٤- الجواب الباهر في زوار المقابر.

٢٥- حجاب المرأة ولباسها في الصلاة.

٢٦- الحسبة في الإسلام.

٢٧- الحسنة و السيئة.

٢٨- حقيقة الصيام.



٢٩- الحموية الكبري.

٣٠- الدرة المضيئة في فتاوى ابن تيمية (الفتاوى المصرية).

٣١- دقائق التفسير ١-٦ أجزاء جمعه محمد السيد الجليند.

٣٢- الرد على الأخنائي في مسألة الزيارة.

٣٣- الرد على تأسيس التقديس للرازى.

٣٤- رسالة إلى ملك قبرص - الرسالة القبرصية.

٣٥- رسالة في أمراض القلوب وشفائها.

٣٦- سؤال في معاوية بن أبي سفيان.

٣٧- السياسة الشرعية لإصلاح الراعي والرعية.

٣٨- شرح حديث أبي ذر رضي الله عنه: يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي.

٣٩- شرح حديث (إنما الأعمال بالنيات).

٤٠- شرح حديث النزول.

٤١- شرح العقيدة الأصفهانية.

٤٢- شرح المحرز- تعليقه على كتاب المحرر في الفقه.

٤٣- الصارم المسلول على شاتم الرسول (صلي الله عليه وسلم)

٤٤- الصفدية.

٤٥- العبودية.

٤٦- الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان.

٤٧- الفرقان بين الحق والباطل.

٤٨- قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة.

٤٩- قاعدة شريفة فى المعجزات والكرامات.

٥٠- قاعدة في الإجماع.

٥١- قاعدة في الإستعاذة.



٥٢- قاعدة في الرد على من قال بفناء الجنة والنار.

٥٣- قاعدة في المحبة.

٥٤- القاعدة المراكشية.

٥٥- الماردينية - المسائل الماردينية.

٥٦- معارج الوصول إلى أن أصول الدين و فروعه قد بينها الرسول.

٥٧- مقدمة في أصول التفسير.

٥٨- مناسك شيخ الإسلام، وهي نحو مجلد.

٥٩- منظومة في القدر.

٦٠- منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية.

٦١- مؤاخذة لابن حزم في الإجماع.

٦٢- النبوات.

٦٣- نقض المنطق.

٦٤- الواسطة بين الحق والخلق.

٦٥- الواسطية.

٦٦- الوصية الصغرى.

بەشی هەشتەم



# ئیبنو تەیمییەی شەرعزان

فیقهی ئیسلامیی یەکێکە لەو زانیارییانەی کە زانایانی ئوممەتی ئیسلامیی گرنگییەکی زۆریان پێ داوە، هەر لە سەردەمی هاوەڵانی بەرێزەوە، تا ئێستاش و لەمەودواش بەردەوام دەبێ، ئەوەش لەبەر گەورەیی ئەو زانیارییە و ئەو سوودەی هەیەتی لە رێنمایی کردنی مسوڵمانان بۆ بەندایەتیی کردنی ڕاست و ساغ، پێغەمبەرمان محمد(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی گەورەیی فیقهو شارەزایی لە دیندا، دەفەرموێ:

(من يرد الله بة خيراً يفقهة فى الدين)[1].

واتە: هەرکەسێ خوا خێر و چاکەی بۆ بوێ، شارەزای دەکات لە دین دا.

(شيخ الإسلام) زوو لە فیقهو ئوصوڵ و تەفسیر و حەدیس و زۆربەی زانستەکانی دیکە دا، پێگەیشت و گەیشتە پلەیەکی بەرزی زانستی و وەك پێشتر باسمان کرد کە، ئیمامی ذهەبیی ئاماژە بە پێگەیشتوویی، دەکاو دەڵێ: لە تەمەنی خوار بیستساڵییەوە لە ئاست فتوا دان بووە و فتوای داوە و دواتریش گەیشتۆتە پلەی ئیجتیهاد.[2]

---

(١) صحيح البخارى برقم ٧١

(٢) العقود الدرية ٤



## قسەی زانایان لەسەر شارەزایی ئیبنو تەیمییە لــە بــواری فیقهو ئوســوڵدا :

- (الحافظ الذهبي)دەڵێ: (وأما نقله للفقه و مذاهب الصحابة والتابعين - فضلا عن المذاهب الأربعة - فليس له نظير)[1].

- (ابن حجر)یش لە(ذهبي) دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: (كان يقضي فيه العجب اذا ذكر مسألة من مسائل الخلاف واستدل و رجح، وكان يحق له الإجتهاد لاجتماع شروطه فيه.....)[2]. وە دەڵێ: (وفاق الناس في معرفة الفقه واختلاف المذاهب وفتاوى الصحابة و التابعين، بحيث اذا أفتى لم يلتزم بمذهب بل بما يقوم دليله عليه)[3].

- الحافظ (ابن كثير) دەڵێ: (فصار اماما في التفسير وما يتعلق به عارفا بالفقه فيقال: انه كان اعرف بفقه المذهب من أهلها الذين كانوا في زمانه)[4].

- (ابن الزملكاني)یش دەڵێ: (وكان الفقهاء من سائر الطوائف اذا جلسوا معه استفادوا في سائر مذهبهم منه....)[5].

زۆر قسەی دیکەش کە زانایانی سەردەمی خۆی و دواتریش لە مەدح و شارەزایی (إبن تيمية) لە بوارەکانی تەفسیر و حەدیس و فیقهو ئوسوڵ و. هتد، کردوویانە، شاهید و بەڵگەی گەورەیی ئیبنو تەیمییەن، وەك زانا و پێشەوایەکی ئیسلام.



## ئیبنو تەیمیە لە سەرەتادا پابەندی مەزهەبی حەنبەلیی بووە:

سەرەتای خوێندن و توێژینەوە فیقهی یەکانی (شیخ الإسلام) لەسەر مەزهەبی حەنبەلیی بووە، ئەو لەسەر دەستی بابی کە زانایەکی گەورەی مەزهەبی حەنبەلی بووە، فیقهی حەنبەلیی خوێندووە و وەرگرتووە، بەشداریی کردوە لەگەڵ باب و باپیری دا لە نووسینی یەکێك لە کتێبەکانی ئوسوڵی مەزهەبی حەنبەلی دا، هەربۆیە زۆر لە زانایان بە فەقیهو شەرعزانێکی حەنبەلییان لە قەڵەم دەدا، (شیخ الإسلام) فیقهی حەنبەلیی بەسەر فیقهی مەزهەبەکانی دیکەدا هەڵبژارد، چونکە وای دەزای کە ئەو لە وانی دیکە لە دەقەوە نزیکترە و دەڵێ: (احمد كان اعلم من غيره بالكتاب والسنة وأقوال الصحابة والتابعين لهم بأحسان، ولهذا لايكاد يوجد له قول يخالف نصا كما يوجد لغيره...)[1].

واتە: ئیمام احمد زاناتربووە لە غەیری خۆی بە قورئان و سوننەت و قسەی هاوەڵان و ئەوانەی بەچاکە بەدوایان کەوتوون، بۆیە هیچ قسەیەکی نی یە پێچەوانەی دەقێك بێ وەك لە غەیری خۆیدا هەیە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە مەزهەبی حەنبەلیی هەڵبژاردوە بەسەر ئەوانی دیکەدا، دەمارگیر نەبووە بۆی و ڕای مەزهەبی دیکەی بە خراپ تەماشا نەکردوە و، هیچ کەسیشی بۆ مەزهەبی حەنبەلی یان مەزهەبێکی دیاریکراوی دیکە بانگ نەکردوە، وەك دەڵێ: (من لە ژیانمدا لە بنچینەکانی دیندا کەسم بانگ نەکردوە بۆ مەزهەبی حەنبەلیی یان مەزهەبێکی غەیری ئەو، لە قسەکانیشمدا باسی ئەوە ناکەم، جگە لەوەی پێشینی ئەم ئۆممەتە و پێشەوایانی لەسەری کۆکن باسی چیدیکە ناکەم)[2].

---

(١) مجموع الفتاوى الكبرى.

(٢) مجموع الفتاوى ٢٩٩/٣.



## ڕێز و پێزانینی بۆ پێشەوا و زانایانی دیکە،

هەرچەندە (شیخ الإسلام) مەزهەبی حەنبەلیی پێش دەخست و هەڵیدەبژارد بەسەر ئەوانی دیکەدا، بەڵام ڕێزی لە ڕای پێشەوا و زانایانی دیکە دەگرت، عوزری بۆ ئەوان دەهێنایەوە کە دەکەوتنە هەڵەی پێچەوانەی سوننەتەوە، هەر بۆیە نووسینە بەهێزەکەی (رفع الملام عن الأئمة الأعلام) بە گرنگترین نووسراو دادەنرێ کە لەو بارەوە نووسرابێ و دەڵێ: (.... لەسەر مسوڵمانان پێویستە خۆشەویستی و دۆستایەتییان دوای خوا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئیمانداران بێ، وەك قورئان باس دەكات، بە تایبەتی بۆ زانایان کە میراتگرانی پێغەمبەرانن (علیهم السلام) و خوای بەرز وەك ئەستێرەکان لە تاریکایی و وشکایی و دەریادا، خەڵکیان پێ ڕێنمایی دەکات، بێگومان هەموو مسوڵمانان کۆکن لەسەر چاوساغیی و ڕێنماییان، کە زانایان جێنشینی پێغەمبەرانن لە نێو ئۆممەتدا، بەوانەوە قورئان راوەستاو دەبێ و بە قورئانیش ئەوان راوەستاو دەبن، بەوان قورئان وەدەنگ دێ و بەهۆی ئەویشەوە ئەوان قسە دەکەن، وە بابزانرێ کە هیچ زانا و پێشەوایەکی جێی متمانە نیە، کەم و زۆر پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێت، وە هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەموو کەسێك قسەی لێ وەردەگیرێ و بەسەریدا دەدرێتەوە، جگە لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەڵام ئەگەر یەکێك قسەیەکی کرد و حەدیسێکی ڕاستیش پێچەوانەی قسەکەی بوو و پێشی زانی، دیارە عوزرێکی هەبووە کە کاری پێ نەکردوە.[1].

## فتوادانی لەسەر مەزهەبێکی دیاریکراو نەبووە:

هەرچەندە (شیخ الإسلام) لە سەرەتاوە لەسەر مەزهەبی حەنبەلیی بووە، بەڵام ئەوەی خۆی پێوە پابەند کردبوو - لە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەی ڕوون و بێ گەرد کە پێشەوایانی ناسراوی شەرعزان لێیان وەردەگرت- وای لێکرد دوای توێژینەوە و لە بێژینگ دان، کە لە هێندێك شتدا جیاواز بێ لە مەزهەبی ئیمام (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) و مەزهەبەکانی دیکەش، (شیخ الإسلام) یەکێك نەبوو بێ بەڵگە و دەلیل دوای غەیری خۆی بکەوێ، یەکێکیش نەبووە دەمارگیریی بۆ ڕایەك هەبێ و، دوای ئەوەی دەرکەوت کە هەڵەیە هەر لەسەری سوور بێ، بەڵکو لە چوارچێوەی قورئان و سوننەت دا کەسێکی ئازاد بووە و دەمارگیری تەنها بۆ هەق هەبووە، چونکە ئەو پەتی تەقلیدکردنی بۆ یەکێکی دیکە لە گەردنی خۆی داڕنیبوو، جگە لە قورئان و سوننەت و شوێنەواری پێشینی چاك، خۆی بە هیچ شتێکی دیکەوە پابەند نەدەکرد، وە لە مەیدانی سەرچاوە یەکەمەکان بۆ ئیسلام و شەریعەتەکەی دا جووڵاوە و هاتوچۆی کردوە، سەبارەت بەوەی کە نابراو لە فتوادان پابەند نەبووە بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە و بە پێی تێگەیشتن و زانیاری خۆی ئیجتهادی کردوە، هەریەك لە (الذهبي[1]، ابن الوردي[2]، ابن كثير[3]) باسیان کردوە.



## هەبوونی مەرجەکانی ئیجتهاد لە (شیخ الإسلام) دا:

زانایانی سەردەمی خۆی و دواتریش پێشەوایەتیی و سەربەخۆیی فکریی و زانایی و شارەزایی زۆری (شیخ الإسلام) یان سەلماندوە و، ڕایانگەیاندوە کە ناوبراو گەیشتۆتە پلەی ئیجتهاد و بەچەند پلەیەك لە سەرووی زانایانی هاوچەرخی خۆیەوە بووە.

- (الحافظ البرزالي) دەڵێ: (وبلغ رتبة الإجتهاد، واجتمعت فيه شروط المجتهدين)[1].

واتە:گەیشتۆتە پلەی ئیجتیهادو مەرجەکانی موجتەهیدینی تێدابوون.

- (الحافظ ابن الزملكاني) دەڵێ: (واجتمعت فيه شروط الإجتهاد على وجهها)[2].
واتە:مەرجەکانی ئیجتیهادی تێداکۆبوونەوە.

- (الحافظ الذهبي) دەڵێ: (وان عد الفقهاء فهو مجتهدهم المطلق)[3].

- (الحافظ ابن حجر) دەڵێ: (إن أئمة عصره شهدوا له بأن أدوات الإجتهاد اجتمعت فيه)[4].

واتە: پێشەوایانی سەردەمی خۆی شاهێدی ئەوەیان بۆ داوە کە پێویستیەکانی ئیجتیهادی تێداکۆبوونەوە.

- (الحافظ السيوطي) دەڵێ: (وأما قبل السبكي فاجتمع الإجتهاد في الاحكام والحديث، لخلق، منهم إبن تيمية وقبله ابن دقيق العيد، وقبله النووي، وقبله ابو

---

(١) العقود الدرية ١٢/ الرد الوافر ٢١٨.

(٢) العقود الدرية ٨.

(٣) العقود الدرية ٢٤.

(٤) الشهادة الزكية ٧٣/ الرد الوافر ٢٤٧.

شامة وقبله ابن صلاح....)[١]. پێشەوایانی سەردەمی خۆی شایەدی ئەوەیان بۆداوە،کەمەرجەکانی ئیجتیهادی تێدابوون.

وە بەشێك لە زانایانی دیکە کە وەسفی (شیخ الإسلام) یان کردوە بەوەی ئیجتهادی کردوە، ئەمانەن: (ابن المرحل، ابن الواني المؤذن، ابن عبدالهادي، ابن الصيرفي، ابن القيم، ابوالعباس البقاعي، ابن فضل الله العمري، ابن رجب الحنبلي، ابن كثير، صلاح الدين العلائى، ابن اللحام، ابو حفص البزار، ابو حفص المراغي...) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ.

زانای پایەبەرز (محمد ابو زهرة) دەڵێ: (بێگومان لە ڕووی پێداویستییەکانی ئیجتهاد و تێگەیشتنی فیقهیی و زانیاری زۆری بە قورئان و سوننەت و، زانیاری تەواویی بە حەدیس لە بواری ریوایەت و تێگەیشتنی نێوەڕۆکەوە لە ئیجتهادکردنی ڕەهاوە، لە پلەی یەکەم دادەنرێ، بەڵام دەبینین لە وەرگرتن و دەرهێنانی حوکمەکاندا بەگشتی رێ و شێوازی (احمد بن حنبل) ی گرتوە و پابەند بووە بە بنچینەکانی ئەوەوە، جگە لەوەش ڕا تایبەتییەکانی خۆی زۆر نین، جا ئەگەر لەو ڕووەوە سەیری بکەین، لەگەڵ ئەو موجتەهیدانە دادەنرێ کە لە مەزهەبی حەنبەلیی دان،

بێگومان ئەو لە زاتی خۆیدا هەموو مەرجەکانی موجتەهیدی ڕەهای تێدا بوون، لە ڕووی شارەزایی و تێگەیشتن و زانیاریدا، بەڵام دەربارەی ئەو مەسەلانەی تێیاندا گەیشتۆتە ئەنجامێکی جیاوازەوە و لەرووی بەرنامەکەشیەوە، دەبینی لە چوارچێوەی مەزهەب دەرناچێ)[٢].

لەوەوە کە رابرد بۆمان دەردەکەوێ کە (شیخ الإسلام) نیشانە و مەرجەکانی ئیجتهادی تێدا هاتوونە دی و موجتەهیدی ڕەها (مطلق) بووە، جا چونکە موجتەهیدی ڕەها بووە ئەوە ناگەیەنێ کە لە هەموو مەسەلەکاندا لەگەڵ چوار پێشەواکە (أبو حنيفة، مالك، شافعي، احمد) ناکۆك بێ، چونکە ئەگەر وابێ لە

---

(١) الرد على من اخلد الى الارض ٤٢.

(٢) ابن تيمية لابى زهرة ٤٣٩ - ٤٤٠



دوو حاڵەتان بەدەر نیە(یان ئەو مەزهەبانە لەسەر قورئان وسوننەت دانەمەزراون، چونکە (شیخ الإسلام) لەگەڵ بەڵگە و دەلیلی قورئان و سوننەت دا دەڕوا لە هەرشوێنێك بن، یان (شیخ الإسلام) مەرجەکانی ئیجتهادی تێدا نەهاتوونە دی، لە هەمووشی گرنگتر لە قورئان و سوننەت نەگەیشتوە و ئەوان پێکاویانە...)[1].

هەرچەندە (شیخ الإسلام) سوودی زۆری لە فیقهو بنچینەکانی (احمد) وەرگرتوە بەڵام بە هەموو فتوا و ڕاکانی یەوە، پابەند نەبووە و ئەوەی دەلیلی لەسەر بووبێ فتوای لەسەر داوە، هەرچەندە ناکۆکیش بووبێ لەگەڵ راو فتوای پێشەواکەی یان مەزهەبە ناسراوەکانی دیکەدا، وەك پێشتر لەو بارەوە قسەی زانایانمان هێناوەتەوە، بەڵام سەبارەت بەوە کە ئایا لە هەموو مەسەلە شەرعییەکان دا بەگشتی فتوا و ڕایەکانی (شیخ الإسلام) پێچەوانەی رای هەرچوار مەزهەبەکە بووە، لەو بارەوە بۆخۆی دەڵێ: (قول القائل: لاتقید بأحد هؤلاء الأئمة الأربعة، إن أراد به أنه لا یتقید، بواحد بعینه دون الباقین، فقد احسن، بل هو الصواب من القولین، وان أراد أني لا أتقید بها کلها بل أخالفها، فهو مخطي في الغالب قطعا، اذ الحق لایخرج عن هذه الأربعة في عامة الشریعة....)[2].

واتە: ئەگەر یەکێك بڵێ: من خۆم نابەستمەوە بە یەکێك لەو چوار پێشەوایەوە، ئەگەر مەبەستی لەو قسەیە ئەوەبێ کە خۆی نابەستێتەوە بە یەکێکیان و ئەوانی دیکە وەلانێ، ئەوە چاکی کردوە و بەڵکو کاری ڕاست ئەوەیە، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ لە هیچ شتێك خۆی بە هیچیان نابەستێتەوە و لە هەموو شتەکان دا پێچەوانەی هەر چواریان بێ ئەوە بە شێوەیەکی گشتی بە هەڵەدا چووە، چونکە بە شێوەیەکی گشتی لە تێکڕای شەریعەتدا هەق لەو چوارە دەرناچێ.

---

(١) بحوث الندوة العالمیة ١١٩.

(٢) مختصر الفتاوی المصریة ٦١.

(شیخ الإسلام) چەند نووسراوێکی لەسەر (فقه و أصول الفقه) نووسیون کە لەلای زانایان و خوێندەوارانی ئیسلامیی زانراون و (الصفدی) کۆمەڵێکی باس کردوون.

(محمد ابو زهرة) (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئەو بنچینانەی دیاری کردوون کە (شیخ الإسلام) رایەکانی خۆی لەسەر هەڵچنیون و دەڵێ: بنچینەی هەڵبژاردنی رایەکانی وەك دەردەکەوێ، سێ شتن:

١- نزیکیی لە شوێنەوارەکان، ئەو داکۆکیی کردوە لەسەر ئەوەی هیچ شتێکی غەریب و شاز لە فیقهدا هەڵنەبژێرێ، بەڵکو شتێکی هەڵبژاردوە کە پەیوەندییەکی توندی هەبووە بە سەرچاوەکەیەوە.

٢- نزیکیی لە پێداویستییەکانی خەڵکی و هێنانەدی بەرژەوەندیەکانیان و دادگەریی تێیاندا، بە بەڵگەی- قورئان و سوننەت - کە کامەیان بەهێزترە و لەگەڵ سەردەم دا دەگونجێ، ئەو هەڵدەبژێردرێ.

٣- هێنانەدی مانا شەرعییەکان کە حوکمەکان لەبەر ئەوان دانراون، کە ئەو زۆر لەسەر ئەوە سوور بووە، لە هەرشتێکدا کە هەڵیدەبژارد و فتوای لەسەر دەدا و رایەکانی دەردەخست[1].



## چەند نموونەیەك لە ڕاوبۆچوونەكانی (اختیاراته):

ڕاو بۆچوونە زانستییەكانی لە بەرگێكی پاشكۆی (الفتاوی الكبری) كە بەرگی چوارەمە كۆكراونەوە، كە چەند نموونەیەك لەو بارەوە دێنینەوە:

### ١- نەدانی زەكات بە ئینسانی گوناهباری سەرپێچی كار:

لەو بارەوە (شیخ الإسلام) دەڵێ: (ولا ینبغي ان تعطی الزكاة لمن لا یستعین بها علی طاعة الله فان الله تعالی فرضها عونة علی طاعته، كمن یحتاج الیها من المؤمنین كالفقراء والغارمین أو لمن یعاون المؤمنین، فمن لایصلي من أهل الحاجات لا یعطی شیئا حتی یتوب...). واتە: زەكات نادرێتە كەسێك كە یارمەتیدەری نەبێ لەسەر خواپەرستیی، چونكە خوا زەكاتی فەرز كردوە كە یارمەتیدەری بێ لەسەر فەرمانبەریی خوا، وەك ئەو كەسەی لە ئیمانداران پێویستی پێیەتی، وەك هەژاران و قەرزداران، یان بۆ كەسێك كە یارمەتی مسوڵمانان دەدات، جا ئەگەر یەكێك پێویستیشی پێبێ، بەڵام نوێژنەكەر بێ، ئەوە زەكاتی نادرێتێ، تا تۆبەدەكات.

### ٢- دانی زەكات بە دایك و باب:

(شیخ الإسلام) دەڵێ: (ویجوز صرف الزكاة الی الوالدین وان علوا، والی الولد وان سفل، اذا كانوا فقراء وهو عاجز عن نفقتهم....)[1].

واتە: دروستە زەكات بدرێتە دایك و باب و بۆ سەرەوە، وە منداڵ بۆ خوارێ، ئەگەر هەژاربوون و، ئەویش نەتوانێ نەفەقەیان بكێشێ.



## چەند فتوایەکی دیکەی ناوبراو:

دوای ئەوەی دەرکەوت کە (شیخ الإسلام) موجتەهیدێکی ڕەها بووە، بە پێی ئیجتهادی خۆی فتوای داوە، کە هێندێك جاران فتواکانی کۆك بوون لەگەڵ پێشەوایانی مەزهەبەکان یان هێندێکیان دا و هێندێك جاریش پێچەوانەی ڕای ئەوان یان فتوا و ڕای ئاشکرایان بووە، کە ئەو ڕایانەش ناویان لێنراوە (مفرداته وغرائبه). بۆ نموونە:

١- لاچوونی بێ دەستنوێژی بە ئاوی گوشراو، وەك گوڵاو و..

٢- مەسح کردن لەسەر (خوف) بەس لە کاتی پێویستدا نیە.

٣- یەکێك بە ئەنقەست نوێژەکەی دوا بخات تا کاتێکی کەمی دەمێنێ، بۆی هەیە (تەیەممموم) بکات، بۆ ئەوەی کاتی نوێژەکەی بەسەر نەچێ، وە هەروەها یەکێك لەوە بترسێ نوێژی جومعە و جەژنی بچێ بێ دەستنوێژیش بێ، بە هەمان شێوە بۆی هەیە، بەڵام یەکێك لە خەو هەستابێ یان لە کۆتایی کاتەکەی دا نوێژەکەی بیربێتەوە، ئەوە ئەو بەئاو دەستنوێژ ئەنجام دەدات، چونکە کاتەکە بۆ ئەو بەبەریەوە ماوە و ئەگەر پێ ڕانەگات گوناهبار نابێ.

٤- ئەگەر ئافرەت نەیتوانی لەماڵەوە خۆی بشوات، یان بۆی زەحمەت بوو بچێتە گەرماو، یان پێی ناخۆش بوو، ئەوە تەیەممموم دەکا و نوێژەکەی دەکات.

٥- لای کەم و لای زۆریی حەیز نیە، وە لای کەمیی خاوێنیی لە نێوان دوو حەیزدا نیە، هیچ ساڵێکیش دیارنیە بۆ ئەوەی لە حەیز نائومێد بێ و ئەوە بۆ ئافرەت دەگەڕێتەوە،کە دەربارەی خۆی دەیزانێ.

٦- کە یەکێك بە ئەنقەست نوێژ نەکا، دوایی دەست پێ بکا واجب نیە ئەوانی پێشوو بگێڕێتەوە و بۆی دروست نیە، بەڵکو با نوێژی سوننەت زیاد بکات.

٧- کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەری درێژ و کورتیش دا دروستە، وە سەجدەی قورئان خوێندن پێویستیی بە دەستنوێژ نیە.



٨- لەمانگی ڕەمەزان دا ئەگەر یەکێك شتی خوارد و وای زانی شەوە، بەڵام ڕۆژ بوو، ئەوە گێڕانەوەی لەسەر نیە، وەك چۆن لای (عومەری کوڕی خەتتاب) وابووە، وە هێندێك لە تابیعین و پێشەوایانیش ڕایان وابووە.

٩- دروستە ژنی حەیزدار طەوافی ماڵی خوا بکات، ئەگەر نەیتوانی بە خاوێنیی بیکا و هیچیشی لەسەر نیە.

١٠- دروستە ئەنگوستیلەی زیو بۆ جوانیی بە زیوی زیادەوە بفرۆشرێ و، زیادەکە وەك هەقی دروستکردن دابنرێ.

١١- ئەو کەسەی (حەج) بە (تەمەتتوع) دەکات، یەکجار حەوت کەڕەتان سەفا و مەڕوە بکات بەسە، وەك چۆن بۆ جۆری (قارن و مفرد) ئاوایە، کە ئەوە قسەی (ابن عباس)ە.

١٢- ئەوە کە تەڵاق بە سوێند ناکەوێ - وەك: بڵێ تەڵاقی بکەوێ ناچێتە شار، دوایی بچێ- وە ئەوکات سوێند خۆر هیچی لەسەر نیە، جگە لە کەفارەتی سوێند، وە ئیبنو تەیمییە بەهۆی ئەو ڕایەوە تووشی دەردەسەریی و گرفت و ناڕەحەتیی زۆر بوو.

١٣- هەرکەسێ سێ تەڵاق بە یەکجار بخوات، هەر یەکێکیان دەکەوێ، کە ئەوە لە سەردەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر و سەرەتای خیلافەتی عومەردا ئاوابووە[1].

ئەو چەند خاڵەی ڕابردن هێندێك لە ڕا و بۆچوونەکانی (شیخ الإسلام) بوون، کە پێچەوانەی ڕای چوار مەزهەبەکان بوون، یان لانی کەم پێچەوانەی ڕای (مشهور)زانراوی زانایان بوون، ئەوەش دەلالەت لەسەر شارەزایی و باڵادەستیی ناوبراو لە ئیجتهاد دا دەکات، وە ئەوە دەگەیەنێ،کە زانایەکی ئازابووە و ئەوەی پێی هەق و ڕاست بووە گوتوویەتی، هەرچەندە لەسەر ئەوەش تووشی ناڕەحەتیی و ئازاریش بوویێ.

لەکۆتایی ئەم باسەشدا دەڵێین: (شیخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، کەسێکی فەقیهو شارەزا و موجتەهیدی رەها و بوێر بووە و دوای بەڵگە کەوتوە، هەرچەندە لە چەند شتێکدا پێچەوانەی مەزهەبەکانیش بوویێ و ئەوەی پێی راست و هەق بوویێ، گوتوویەتی، ئەویش وەك هەموو موجتەهیدێکی دیکە دەپێکێ و هەڵەش دەکا، بەڵام لەسەر هەردووکیان پاداشت هەیە، ئەگەر پێکای دوو پاداشت و ئەگەر نەپێکا پاداشتێکی هەیە و، لەسەر هەڵەکەش گوناهبار نابێ، چونکە توانای خۆی بۆ دۆزینەوەی ڕاستیی سەرف کردوە، ئیبنو تەیمییە کەسێکی گەورە بوو، بۆیە بە گەورەیی ژیا، چونکە ئینسانی بچووك بە بچووکی دەژی و بە بچووکی دەمرێ و لە ژیانیدا هیچ کاریگەیری نابێ، رەحمەتی خوا لە (شیخ الإسلام ابن تیمیة) و خوای گەورە پاداشتی چاکەی بە باشترین شێوە بداتەوە.



بەشی نۆیەم



## یەکەم: ئیبنو تەیمییە فەرموودەناس و شارەزا لە سوننەت

سوننەت و زانستەکانی یەکێکی دیکەیە لەو بوارانەی کە(شیخ الإسلام) زۆر تێیدا شارەزا بووە، بە جۆرێك زانایانی سەردەمی خۆی شاهێدیی زۆر شارەزایی ناوبراویان لەوبارەوە داوە، کە سوننەتی لەبەر بووە و زۆر پێی ئاگادار بووە.

**قسەی زانایان لەسەر شارەزایی ناوبراو بە سوننەت:**

١- الحافظ (ابن سيد الناس) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (.... وكاد يستوعب السنن والاثار حفظا...)[١].

وە دەڵێ: (اما الحديث فكان حامل رايته، حافظا له مميزا بين صحيحه و سقيمه عارفا برجاله متضلعا في ذلك)[٢].

٢- (الحافظ المزی) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: ... (ما رأيت احدا اعلم بكتاب الله وسنة رسوله ولا اتبع لهما منه)[٣].

---

(١) العقود الدرية ١٠ الرد الكامنة ١/١٥٦ / ذيل طبقات الحنابلة ١/٣٩٠

(٢) العقود الدرية١٢

(٣) العقود الدرية ٧/ الرد الوافر ١٢٩

٣- (الحافظ الذهبي) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (وسماعاته من الحديث كثيرة، وشيوخه أكثر من مائتي شيخ، و معرفته بالتفسير اليه المنتهى و حفظه للحديث و رجاله، وصحته، وسقيمه، فما يلحق به)(١).

وە دەڵێ: (و له خبرة تامة بالرجال وجرحهم وتعديلهم وطبقاتهم و معروفة بفنون الحديث، وبالعالى والنازل، وبالصحيح والسقيم.)(٢).

٤- زانا (ابن فضل الله العمرى ) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (وكان حافظا للحديث مميزا بين صحيحه و سقيمه..)(٣).

واتە: وێڕای لەبەربوونی حەدیس توانای جیاکردنەوەی هەبوو لە نێوان حەدیسی راست و لاواز.

٥- (الحافظ ابن رجب الحنبلي) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (لقد كان عجيبا في معرفة علم الحديث، فأما حفظ متون الصحاح و غالب متون السنن والمسند، فما رأيت من يدانيه في ذلك اصلا)(٤).

٦- (الحافظ الصفدى ) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (كأن السنة على رأس لسانه...)(٥). واتە: هەموو سوننەت لەسەر زمانی بوو.

٧- (الحافظ ابو حفص البزار) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (وأما معرفته بصحيح المنقول وسقيمه فأنه في ذلك من الجبال التى لا ترتقى ذروتها....)(٦).

---

(١) الرد الوافر ٦٨ - ٦٩.

(٢) العقود الدرية ٢٠.

(٣) الشهادة التزكية ٥٦ / تأريخ ابن الوردى ٢/٤٠٩.

(٤) الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٩١ .

(٥) اعيان العصر عن المنجد ٤٩.

(٦) الاعلام العلية ٣٠.



٨- (الحافظ العلامه العينى) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (هو الإمام الفاضل البارع التقي الوارع الفارس في علمي الحديث والتفسير والفقه...)[١].
وە هەریەك لە (الحافظ ابن حجر العسقلاني)[٢]، و (ابن عبدالهادي)[٣]. باسیان لە زۆر زانایی (شيخ الإسلام ابن تيمية) کردوە، لە ڕووی سوننەتەوە وێڕای زانستەکانی دیکە.

## سەنگ و قورسایی (شیخ الإسلام) لە نێو فەرمـوودەناسان دا:

(شیخ الإسلام) پایەیەکی تایبەتی هەبووە لە زانستی حەدیس دا، وێڕای ڕەخنەی لەو کەسانەی ریوایەتی حەدیس دەکەن و لە (جرح و تعدیل) واتە دەربڕینی لایەنی چاك و خراپی کەسەکان، وە بەلاواز دانان و بە ڕاست دانانی حەدیسەکان. هەریەك لە (الذهبي)[٤] و (ابن ناصرالدين الدمشقي)[٥] و (السخاوي)[٦]، باسیان لە شارەزایی (شيخ الإسلام ابن تيمية) کردوە لە بارەی (جرح و تعدیل) و ڕەخنە لە کەسەکان لە نوسراوەکانیاندا و بە یەکێك لە ناسینی کەسەکان و شارەزا لە حەدیس ناویان بردوە.

---

(١) الرد الوافر ٢٦٤ .
(٢) الدرر المكامنة ١/١٤٤.
(٣) العقود الدرية ٣٧٢.
(٤) ذكر من يعتمد قوله في الجرح و التعديل للذهبي، ضمن اربع رسائل فى علوم الحديث ٢١٢.

# دووەم: (إبن تیمیة) توێژەرەوەی قورئان

پێشتر باسمان کرد کە (شیخ الإسلام) لە تێکڕای زانستەکان زۆر زانا و شارەزا بووە و گرنگیی زۆری بە قورئان و سوننەت داوە، بە پێی تێگەیشتنی پێشینی چاك، هەر کەسێك بە ویژدانەوە تەماشای ژیانی ناوبراو بکات دەبینێ کە قورئان و سوننەت لەگەڵ رووح و خوێن و گۆشتی تێکەڵ بووە و، باسی لە هەر شتێك کردبێ و لە هەر ڕوێکەوە شتی نووسیبێ، پەنای بردۆتە بە قورئان و سوننەتی ڕاست، بەتایبەتی لە کۆتایی تەمەنی دا کە لە بەندیخانەی (قەلعة)ی دیمەشق بەندکرابوو، هەموو کتێب و پەڕ و قەڵەم و کەل و پەلیان لێ سەند بوو، بەزۆریی بە خوێندنی قورئان و تێڕامانییەوە خەریك بوو.

**زۆر لە زانایان دەربارەی زانایی ناوبرا و لە تەفسیردا شتیان نووسیوە، بۆ وێنە:**

١- (الحافظ الذهبي) دەڵێ: (واما التفسير فمسلم له.....)[1]. (وبرع في تفسير القرآن، وغاص في دقيق معانيه بطبع سيال.....)[2].

٢- (الحافظ البرزالي) دەڵێ: (وكان اذا ذكر التفسير بهت الناس من كثرة محفوظه وحسن إيراده و إعطائه كل قول مايستحقه....)[3].



٣- (الحافظ ابن سيدالناس) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (اذا تكلم في التفسير فهو حامل رايته...)[1].واتە: ئەگەر لە تەفسیر قسەی کردبایە،ئەو ئاڵا هەڵگری بوو.

٤- (الحافظ الصفدي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (واما التفسير فيده فيه طولي...)[2]. واتە: لە تەفسیردا دەستێکی باڵای هەبووە.

٥- (الحافظ ابن كثير)یش (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، لە بارەی شارەزایی و دەرسەکانی ئەو کە لە مزگەوتی ئەمەویی لە دیمەشق تەفسیری قورئانی کردوە، باس دەکات[3].

(الشيخ ابو عبدالله بن رشيق) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (دوای ئەوەی لە کۆتایی تەمەنیدا لە بەندیخانەی (قەلعە) بەند کرا، نامەیەکم بۆ نووسی داوام لێ کرد کە تەفسیرێکی هەموو قورئان بنووسێ، لە وەڵامدا بۆی نووسیبومەوە و گوتبووی: مانای قورئان هێندێکی ڕۆشن و ئاشکرایە، هێندێکیشی زانایانی توێژەرەوەی قورئان مانایان ڕۆشن کردۆتەوە، بەڵام هێندێك لە ئایەتەکان تەفسیرکردنیان زەحمەت بووە بۆ زۆر لە زانایان، لەوانەیە ئینسان بۆ تێگەیشتنیان چەندان کتێب موتاڵا بکات و تەفسیرەکەی بۆ ڕوون نەبێتەوە، لەوانەیە نووسەرێك لێکدانەوەیەکی بۆ بکات و یەکێکی دیکە بە شێوەیەکی دیکە لێکی بداتەوە، بۆیە من دەمەوێ ئەو ئایەتانە تەفسیر بکەم بە بەڵگە و دەلیل، چونکە ئەو تەفسیرە پێویستترە لە هی دیکە[4].

(ابن رجب) لە ئیمام (ذهبي) دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: (لە کۆتایی عومری دا (شيخ الإسلام) دووساڵ و چەند مانگێك لە سجنی (قەلعة) بەندکرا و لە وێدا وەفاتی کرد، ماوەیەك لەوێ شتی دەنووسی و بۆ هاوەڵەکانی دەینارد و

---

(١) العقود الدرية ١٠/ الذيل على طبقات الحنابلة ٢/٣٩٠.

(٢) اعيان العصر عن المنجد ٥٠.

(٣) البداية والنهاية ١٣/٣٠٢.

(٤) العقود الدرية ٢٧ - ٢٧.



دەیگوت: خوا لەم سجنەدا دەرگای خێری لێ کردوومەوە، کە زۆربەی زانایان ئاواتی بۆ دەخوازن، بەڕاستیی پەشێمانم لەوەی کاتی خۆم بە جگە لە قورئانەوە سەرف کردوە)[1].

## ڕێباز و شێوازی ئیبنو تەیمییە لە تەفسیردا.

**دەتوانین شێوازی (ابن تیمیة) لە تەفسیردا لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:**

١- تەفسیرکردنی قورئان بە قورئان، کە ئەمە بنچینەی یەکەمی تەفسیری کتێبی خوایە.

٢- تەفسیری قورئان بە سوننەت، کە ئەمە بنچینەی دووەمی تەفسیری قورئانی پیرۆزە، کە لەو بارەوە دەڵێ: (فان أعياك ذلك - يعنى تفسير القرآن بالقرآن- فعليك بالسنة، فإنها شارحة للقران موضحة له)[2].

واتە: ئەگەر ئەوەت پێ زەحمەت بوو واتە تەفسیری قورئان بە قورئان- ئەوە تەفسیر بکە بە سوننەت، چونکە سوننەت شەرحی قورئان و ڕوونکردنەوەیە بۆی، وە دەڵێ: (ومما ينبغي ان يعلم ان القرآن و الحديث اذا عرف تفسيره من جهة النبى (صلى الله عليه وسلم) لم يحتج في ذلك الى أقوال اهل اللغة)[3].

واتە: دەبێ ئەوە بزانرێ ئەگەر قورئان و سوننەت لە لایەن پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ماناکەی زانرا، پێویست ناکا لەوبارەوە قسەی کەسێکی دیکە وەربگیرێ لە زمانەوانان.

---

(١) الذيل على طبقات الحنابلة ٢/ ٤٠١ - ٤٠٢.

(٢) مقدمة في اصول التفسير ٩٢.

(٣) مجموع الفتاوى ١٣/٢٧.



٣- تەفسیری قورئان بە قسەی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە ئەمە لە پلەی سێیەم دایە، وەك دەڵێ: (وحينئذ اذا لم نجد التفسير في القرآن ولا في السنة، رجعنا في ذلك الى أقوال الصحابة فانهم أدرى بذلك لما شاهدوه من القرآن والأحوال التى اختصوا بها، ولما لهم من الفهم التام والعلم الصحيح ولاسيما علمائهم كالأئمة الأربعة الخلفاء الراشدين والأئمة المهديين)[1].

واتە: (ئەگەر تەفسیرمان لە قورئان و سوننەت چنگ نەکەوت، لەو بارەوە دەگەڕێینەوە بۆ قسەی هاوەڵان کە ئەوان بەوە شارەزاترن وە بەس خۆیان ئاگاداری هەندێك شت بوون دەربارەی قورئان، وە تێگەیشتنێکی تەواو و زانستێکی ڕاستیان هەبووە، بەتایبەتی زانا و گەورەکانیان، وەك چوار پێشەوا جێنشینە سەرڕاستەکان و پێشەوایانی ڕێنمایی کراو)

٤- تەفسیری قورئان بە قسەی شوێنکەوتوان (تابعين)، لەوبارەوە دەڵێ: (ئەگەر تەفسیرمان لە قورئان و سوننەت و قسەی هاوەڵان دەست نەکەوت، ئەوە زۆر لە پێشەوایان لەوەدا گەڕاونەوە بۆ قسەی (تابعين) وەك (مجاهد بن جبر)کە لە تەفسیردا زۆر شارەزا بووە)[2]، وە دەڵێ: (ئەگەر لەسەر شتێك کۆك بوون، ئەوە بەڵگەیە و وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر لە نێو خۆیاندا ڕاجیایی یان هەبوو، ئەوە قسەی هیچیان لەسەر ئەوی دیکە نابێتە بەڵگە، لەسەر دوای خۆشیان بەڵگە نیە، لەو کاتەدا بۆ زمانی قورئان و سوننەت یان تێکرای زمانی عەرەبی دەگەڕێتەوە[3].

٥- دوای بەڵگە کەوتن و نەبوونی دەمارگیریی بۆ هیچ قسەیەکی هەرکەسێك، ئەگەر نزیکترین کەسیش بێ.

٦- درێژیی لە ڕوونکردنەوە و هێنانی بەڵگە لە قورئان و سوننەت دا، لەکاتی موناقەشەکاندا، کە لە نووسراوەکانی دا دیارە.

---

(١) مجموع الفتاوى ١٣/٣٦٤/ مقدمة فى اصول التفسير ٩٣.

(٢) مجموع الفتاوى ١٣/٣٦٨ مقدمة فى اصول التفسير ٩٧.

(٣) مجموع الفتاوى ١٣/ ٣٧٠.

٧- بەڵگە هێنانەوە بۆ قسەکان لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکان دا، کە تەفسیر کردنەکەی بە ئایەت و حەدیس و دەلیلی دیکە دەوڵەمەند دەکا و بە ڕێکوپێکی دەیانهێنێتەوە و دایاندەنێ.

٨- گواستنەوەی قسەی پێشەوایانی گەورە لە تەفسیردا و ئاماژە پێکردنی.

٩- دەستپاکیی زانستی و وردیی لە گواستنەوەی قسە و دەقەکان دا، کە لە نووسراوەکانی دا ڕەنگی داوەتەوە.

بەهۆی ئەو زانیارییە زۆرەوە کەناوبراو هەیبووە لە تەفسیردا، زۆر لە زانایان سوودیان لە راو بۆچوونەکانی وەرگرتوە لە زانیارییەکانی قورئان و تەفسیردا، بۆنموونە هەریەك لە (الزركشي) لە کتێبەکەی خۆی دا بەناوی (البرهان) و (السيوطي) لە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن)[1] و (ابن كثير) لە تەفسیرەکەیدا (تفسير القرآن العظيم)[2] و (ابن القيم)[3].

لە چەند شوێن لە کتێبەکانی خۆیان سوودیان لە (شيخ الإسلام ابن تيمية) وەرگرتوە و قسەکانی ئەویان وەك بەڵگە هێناوەتەوە و تۆماریان کردوون.

---

(١) الاتقان للسيوطي ٨/١.

(٢) تفسير ابن كثير سورة يوسف ارية (٥٢).

(٣) التفسير القيم سورة العنكبوت، آية: (ان الصلاة كانت تنهى عن الفحشاء والمنكر...).



## نووسراوەكانی (شيخ الإسلام) لەسەر زانیارییەكانی تەفسیر:

(شيخ الإسلام) وەك چۆن لە زۆر زانیاری دیكەشدا نووسراوی هەن، بەهەمان شێوە لەم بوارەشدا چەندان نووسراوی هەن لە شێوەی كتێبی گەورەو چەند بەشێكی بچووكدا وەك:

١- مقدمة في أصول التفسير.

٢- الإكليل في المتشابه والتأويل.

٣- تفسير في سورة الإخلاص.

٤- تفسير سورة النور

٥- تفسير المعوذتين.

٦- دقائق التفسير، كە (دكتۆر محمد الجليند) هەستاوە بە كۆكردنەوە و رێكخستنی.

٧- تفسير آيات أشكلت.

٨- اقسام القرآن.

٩- رسالة من المعانى المستنبطة فى سورة الانسان.

١٠- قاعدة في تحزيب القرآن و مايتعلق بذلك وما ورد فيه من الاثار.

١١- قاعدة في تفسير اول البقرة.

١٢- فضائل القرآن.

١٣- تفسير سورة الفاتحة.

١٤- تفسير سورة المائدة.

١٥- تفسير سورة البينة.

## سێیەم: شارەزایی (شیخ الاسلام )بە عەقیدە و بیــر و بــاوەڕ

الحافظ (ابو حفص البزار) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، دەربارەی زۆر گرنگیی دانی (شیخ الإسلام) بە عەقیدە و زۆر نووسین لەوبارەوە، پرسیاری لە ناوبراو کردوە و دەڵێ: پرسیارم لە (شیخ الإسلام) کرد کە هۆی چیە ئەوەندەی لەسەر مەسەلەی عەقیدە دەنووسێ لە زانیاییەکانی دیکە دا نانووسێ وداوام لێ کرد کە دەربارەی (فقه)کتێبێك بنووسێ و هەموو ڕا و فتواکانی خۆی و ئەوەی لە نێو ڕای زانایان هەڵیدەبژێرێ تێیدا کۆبکاتەوە، ئەویش گوتی: مەسەلەی فروع- واتە هەڵس و کەوتەکان و هەڵێنجانی فیقهی ئیسلامیی- زۆر بە زەحمەت نیە و هەرمسوڵمانێك تەقلیدی زانایەکی موجتەهید بکات دروستە، بە مەرجێك هەڵەی موجتەهیدەکەی لەلا مسۆگەر نەبێ، بەڵام مەسەلەی عەقیدە مەسەلەیەکی گرنگ و گەورەیە، من کە دەبینم گومڕا و بیدعەتچیی و ئەوانەی وە دوای هەوای خۆیان کەوتوون، وەك: (فەیلەسووف و باطینیی و مولحید و جەهمیی و...) دەیانەوێ کێشەیەکی گەورە دروست بکەن و گومڕایی و سەرلێشێواویی بڵاودەکەنەوە، وە بۆشم دەرکەوتوە کە زۆربەیان مەبەستیان دژایەتیی کردنی دین و ناشیرینکردنی شەریعەتە، کە بەسەر هەموو بەرنامە و دینەکانی دیکەی دەستکرددا زاڵ و پایەدارە، وە خەڵکەکەشیان وردە وردە کاریگەریی خراپیان دەبێ لەسەر عەقیدەی مسوڵمانان و دینی ئیسلام، بۆ ڕێگریی کردن لەوەی عەقیدەیان تێك بدەن و سەرەنجام پشت لە دین بکەن و دوای ئەوان بکەون، بۆیە کە ئەوشتەم ئاوا بینی، بۆم دەرکەوت پێویستە لەسەر هەموو کەسێك بە پێی توانای خۆی گومان و هەڵە گومڕاییەکان بپووکێنێتەوە و ڕێ لەو هێرش و هەوڵە خراپانە بگرێ و، مەبەستە گڵاوەکانیان بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، بۆیە ئەمە و چەند شتێکی دیکە وای کرد گرنگیی زۆر بە لایەنی عەقیدە بدەم و خۆمی پێوە خەریك بکەم و وەڵامی قسە و نووسینەکانیان بدەمەوە، بە دەلیلی عەقلیی و نەقلیی[١].

---

(١) الاعلام العلية ٣٣ - ٣٥.



### ١- هێندێك له نووسراوەكانى (شيخ الإسلام) دەربارەی عەقیدەی ئیسلامیی :

١- الايمان، ٢- الإستقامة، ٣- اقتضاء الصراط المستقيم، ٤- الفرقان بين أولياء الرحمن و اولياء الشيطان، ٥- شرح الإصبهانية، ٦- الرسالة الحموية، ٧- الرسالة التدمرية، ٨- الرسالة الواسطية، ٩- رسالة الإحتجاج بالقضاء والقدر، ١٠- قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة، ١١-منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة القدرية، ١٢- رسالة مراتب الإرادة، ١٣- الرسالة البعلبكية والطيلانية والبغدادية والأزهرية، ١٤- معارج الوصول، ١٥- نقض المنطق، ١٦- الرد على المنطقيين، ١٧- موافقة صحيح المنقول لصريح المعقول، ١٨- الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح....

### ٢- عەقیدەی (شيخ الإسلام ابن تيمية) :

(ابن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، چەند نووسراوێکی هەن کە باس لە عەقیدەی راست دەکەن کە پێشینی ئەم ئوممەتە لەسەری بوون، وەکو: (العقيدة الواسطية، والعقيدة الحموية) وە لە زۆر شوێنی دیکە لە کتێبەکانی دا باسی لەوە کردوە وەکو: (الفرقان بين الحق والباطل) و (مذهب اهل السنة) و (عرش الرحمن وما ورد فيه من الايات) و هی دیکەش[1]. جا کاتێك بمانەوێ لە عەقیدەی (شيخ الإسلام) تێبگەین، پێویستە لە قسە و نووسینەکانی کە لە کاتی ئاسایی دا دەربڕیون وەربگرین، نەك قسە و عیبارەتێك لێرە و یەکێکی دیکە لەولا وەربگرین، کە لە کاتی موناقەشەکاندا گوتوونی و لە کات و شوێنی تایبەت و جیاوازدا دەربڕیون، کە زۆر کەسی نەیار بەوە کە پچڕ پچڕ قسەکانی کۆدەکاتەوە و، شتێکی بە ئارەزووی خۆی لێ درووست دەکات، دڵخۆش دەبێ و وادەزانی ئەوە بیر و بۆچوونی ناوبراوە. ئێستاش چەند دەقێکی (شيخ الإسلام) دێنین کە بێ باکانە دەری بڕیوون و عەقیدەی خۆی پێناسە دەکات:

---

(١) الامام ابن تيمية و موقفه من التأويل ٤١١.

لەم چەند دێڕە شعرەی ناسراو بە (لامی)- واتە کۆتاییەکانی بە (ل) دێ- بەشێك لە عەقیدەی خۆی دەخاتە پێش چاو کە دەڵێ:

یا سائلي عن مذهبي و عقيدتي ... رزق الهدى مَنْ للهداية يَسأل
اسمع كلام محقق في قوله ... لا ينثني عنه ولا يتبدل
حب الصحابة كلهم لي مذهب ... ومودة القربى بها أتوسل
وأقول في القرآن ما جاءت به ... آياته فهو القديم[1] المنزل
وأقول: قال الله جل جلاله ... والمصطفى الهادى ولا أتأوّل
وجميع آيات الصفات أُمِرُّها ... حقاً كما نقل الطراز الاول
وأرد عهدتها الى نقالها ... وأصونها عن كل ما يتخيل
قبحاً لمن نبذ القرآن وراءه ... واذا استدل يقول: قال الأخطل
والمؤمنون يرون حقاً ربهم ... والى السماء بغير كيف ينزل
وأقر بالميزان والحوض الذي ... أرجو بأني منه ريا أَنْهَلُ
وكذا الصراط يُمَدُّ فوق جهنم ... فَمُسَلَّم نـاج وآخر مُهْمَلُ
والنار يصلاها الشقي بحكمةٍ ... وكذا التقي الى الجنان سيدخل
ولكل حي عاقل في قبره ... عمل يقارنه هناك ويُسأل
هذا اعتقاد الشافعي ومالك ... وأبى حنيفة ثم احمد ينقل
فان اتبعت سبيلهم فموفق ... وان ابتدعت فما عليك مُعَوّل[2]

وە هەر لەو بارەوە لە (العقيدة الواسطية) دا دەڵێ: (ومن الايمان بالله، الايمان بما وصف به نفسه، و وصفه به رسوله من غير تحريف ولا تعطيل ولاتكييف ولا تمثيل...)[3].

---

(١) قال المعلق على القصيدة: لم أعثر فيما اطلعت عليه أن الامام أبن تيمية يعبر بالقديم وانما يعبر بأنه غير مخلوق الا اذا كان من باب الاخبار كالشاهد هنا.

(٢) العقيدة السلفية: د. سعيد عبدالعزيز الشبلى ٢٩٨ - ٣٠٠، وتعليقه عليها، جلاء العينين للالوسي ص٥٨، وشرح الرسالة احمد بن عبدالله المرداوي و طبعها في الرياض عام ١٣٥٨م.

(٣) مجموعة الرسائل الكبرى ١/ ١٩٣ - ١٩٤.

واتە: لە ئیمان بە خوا بوونە، ئیمان بەوەی خوا وەسفی خۆی پێ کردوە، وە پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) وەسفی خوای پێ کردوە، بەبێ لادان و پەکخستن و چۆنیەتی و وێچواندن).

وە لە (الفتوى الحموية)دا دەڵێ: (پێویستە خوا بە شتێك وەصف بکرێ کە خۆی پێ وەسف کردوە، وە بەوەی پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) پێی وەسف کردوە، وە ئەوەی پێشینە یەکەمەکان خوایان پێ وەسف کردوە، لە قورئان و حەدیس ناچێتە دەرێ.

(ئیمام ئەحمەد) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (خوا وەسف ناکرێ مەگەر بەشتێك کە خۆی وەسفی خۆی پێ کردبێ یان پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) پێی وەسف کردبێ، کە لە قورئان و حەدیس دەرناچێ.

وە زانایانی پێشین، خوا وەسف دەکەن بە شتێك کە خۆی وەسفی خۆی پێ کردبێ، یان پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) خوای پێ وەسف کردبێ، بەبێ لادان و پەکخستن و چۆنیەتی و وێچواندن، وە دەزانین ئەوەی خوا وەسفی خۆی پێ دەکات ڕاست و بەجێیە و هیچ خراپەیەکی تێدا نیە...

وە خوای پاك و بێگەرد لەگەڵ ئەوەی باسمان کرد هیچ شتێك وەکو ئەو نیە،نە لەزاتیدا، نە لەناوو سیفەتەکانی دا و نە لە کردەوەکانی دا، وە خوای پەروەردگار زاتی حەقیقیی و کردەوەی حەقیقیی و سیفەتی حەقیقی هەن، وە هیچ شتێك وەکو ئەو نیە لە زاتی و سیفاتی و کردەوەکانی دا، وە لە هەموو کەموکوڕییەك بەرییە و هەر ئەو شایەنی تەواویی یە لە هەموو ڕووێکەوە و، ئەو لە هەموو شتێك باڵاترە و سەرەتا و کۆتایی نیە، هەر بووە و دروستکەرو ڕاگری هەموو بوونەوەر و دروستکراوێکە.

وە مەزهەبی سەلەف لە نێوان (التعطيل و التمثيل) واتە پەکخستن و وێچواندن دایە، سیفەتەکانی خوا بە سیفەتەکانی دروستکراوەکان ناچوێنن، وەك چۆن زاتی خوا بەزاتی دروستکراوەکان ناچوێنن، بەهەمان شێوە نەفی ئەو سیفەتانەش ناکەن کە خوا خۆی پێ وەسف کردوون، یان پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه

وسلم) پێی وەسف کردوون بەوەی ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی پەکبخەن و فەرموودەی خوا بگۆڕن و ناو و ئایەتەکانی خوا لە مانای خۆیان لابدەن[١].

### ٣- دەربارەی (استواء)ی خوا لەسەر عەرش:

(إبن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (والقول الفاصل: هو ما عليه الأمة الوسط من أن الله مستو على عرشه استواء يليق بجلاله ويختص به، فكما انه موصوف بأنه بكل شيء عليم، وعلى كل شيء قدير، وانه سميع بصير، ونحو ذلك، ولا يجوز ان يثبت للعلم والقدرة خصائص الأعراض التي لعلم المخلوقين و قدرتهم، فكذلك هو سبحانه فوق العرش ولا نثبت لفوقيته خصائص فوقية المخلوق على المخلوق ولوازمها...)[٢].

واتە: قسەی یەکلاکەرەوە ئەوەیە کە ئوممەتی میانەڕەو لەسەریەتی کە خوا چۆتە سەر یان بەرز بۆتەوە بۆ سەر عەرشەکەی، چوونە سەر و بەرزبوونەوەیەك کە لەو دەوەشێتەوە و تایبەتە بەوەوە، هەروەك چۆن وەسف کراوە بەوە کە بە هەموو شتێك زانایە و، توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، وە بیسەرو بینەرە و، وە دروست نیە بۆ زانیاری و توانای ئەو هیچ تایبەتمەندییەکی سیفەتەکانی وەکو زانیاری و توانای دروستکراوەکانی بۆ بڕیار بدەین، هەر بەو شێوەیەش خوا لەسەر عەرشە و بۆ لەسەرەوە بوونی خوا، هیچ تایبەتمەندییەکی لەسەرەوە بوون و شێوە و چۆنیەتی دروستکراوەکان بڕیار نادەین.

### ٤- پووچەڵکردنەوەی ئەو درۆ و دەلەسانەی لە دژی هەڵبەستراون:

زۆر لە ناحەزانی (شيخ الإسلام) لەسەر دەمی خۆی و دواتریش، دژایەتی سەرسەختی ناوبراویان کردوە و چەندان گرفت و کێشەیان بۆ درووستکردوە و بە درۆ و دەلەسە شتیان بۆ هەڵبەستوە، بە پاڵنەری حەسوودیی پیلانیان لە

---

(١) الفتوى الحموية ٢٧٢.

(٢) الفتوى الحموية ٢٧٥ - ٢٧٦.



دژی گێڕاوە و قسە و ڕا و بۆچوونەکانی ناوبراویان گۆڕیوە و، ویستوویانە لەلای مسوڵمانان بە شێوەیەکی خراپ و نەگونجاو و لادەر وێنای بکەن، بەڵام بەهۆی ئیمان و تەقوا و ساغیی و پاکیی و ئەو زانستە فراوانەی هەیبووە و، ئەو خزمەتە گەورەیەی بە مسوڵمانانی کردوە، خوای بەبەزەیی زیاتر بەرزی کردۆتەوە و شکستی بە ناحەزانی هێناوە. ئەمەش بەشێکن لەو درۆیانەی لە دژی هەڵبەستراون:

**یەك**: گوایە (شیخ الإسلام) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، گوتوویەتی: خوا بۆ ئاسمانی دنیا دێتە خوارێ، وەکو ئەو هاتنە خوارەوەی من، وە لە قادرمەی مینبەرەکەی پلەیەك هاتۆتە خوارێ.

ئەو تۆمەت و درۆیە کە بە ناڕەوا (ابن بطوطة) دژی (شیخ الإسلام) کردوویەتی و لە گەشتە ناودارەکەیدا باسی کردوە، پێش ئەوەی بەرپەرچی ئەو قسەیەی (ابن بطوطة) بدەینەوە، با چەند قسەیەکی (شیخ الإسلام) لەو بارەوە بخەینە ڕوو: (شیخ الإسلام) دەڵێ: (والذي يجب القطع به ان الله ليس كمثله شيء في جميع ما يصف به نفسه، فمن وصفه بمثل صفات المخلوقين فى شيء من الأشياء فهو مخطيء قطعا، كمن قال: انه ينزل فيتحرك وينتقل كما الإنسان من السطح الى أسفل الدار وكقول من يقول: انه يخلو من العرش، فيكون نزوله تفريغا لمكان وشغلا لاخر، فهذا باطل يجب تنزيه الرب عنه)[1].

واتە: ئەوەی پێویستە قسەی کۆتایی یە ئەوەیە کە: هیچ شتێك وەك خوا نیە لە هەموو ئەو شتانەدا کە خۆیان پێ وەسف دەکا، هەرکەسێك وەسفی ئەو بکات بە شێوەی سیفەتی دروستکراوەکان لە شتێك لە شتەکان دا، ئەوە بە هەڵەدا چووە، وەکو ئەوەی بڵێ خوا دێتە خوارێ و جووڵە دەکات و دێت و دەچێ، وەك چۆن ئینسان لە سەربانەوە دێتە خوارێ، یان وەکو قسەی ئەوەی دەڵێ: لەسەر عەرش لادەچێ و بەهاتنە خوارێی شوێنێك چۆڵ دەکا و بۆ شوێنێکی دیکە دەچێ، ئەوە ناڕاستە و پێویستە پەروەردگاری لێ بە پاك بگیرێ.

---

(١) مجموع الفتاوى ٥/٥٧٨.

زانای گەورەی شام (محمد بهجە البیطار)یش بەرپەرچی ئەو درۆیەی (ابن بطوطة) دەداتەوە و دەڵێ:

أ- (ابن بطوطة) گوێی لە (إبن تیمیة) نەبووە و نەچۆتە لاشی، چونکە ئەو کاتەی ئەو گەیشتۆتە (دیمەشق) لەساڵی (٧٢٦)ی کۆچی دا (شیخ الإسلام ابن تیمیة) لە سجنی (قەلعە) دا بووە و لەوێدا ماوەتەوە تا وەفاتی کردوە، کەواتە: چۆن بینیویەتی کە لەسەر مینبەر خوتبەی داوە؟!.

ب- گەشتەکەی (ابن بطوطة) پڕە لە ریوایەت و حیکایەتی سەیر و نا ڕاست، بۆ نموونە دەڵێ: لە نێوەڕاستیی مزگەوتی ئەمەویی دا لەدیمەشق قەبری (زەکەرییا) (علیه السلام)ی لێیە!

ج- (إبن تیمیة) وەك (الذهبي و البرزالي) گوتوویانە (مدرس و واعظ)بووە و واتە دەرسی گوتۆتەوە و ئامۆژگاریی خەڵکی کردوە و وتاربێژ (خطیب) نەبووە، دەرسەکانیشی بە دانیشتنەوە لەسەر کورسی گوتوونەوە و دانیشتوە و نەچۆتە سەر مینبەرێ، لەو کاتەدا کە (ابن بطوطة)ش چۆتە دیمەشق، وتاربێژی مزگەوتی ئەمەویی (قاضي القضاة القزویني) بووە.

**دوو:** گوایە (شیخ الإسلام) گوتوویەتی جەهەننەم کۆتایی پێ دێ:

ئەو قسەیەش هی (شیخ الإسلام) نیە، چونکە ئەو دەڵێ: (وقد اتفق سلف الأمة وأئمتها وسائر أهل السنة والجماعة على أن من المخلوقات مالا یعدم ولا یفنى بالکلیة، کالجنة والنار والعرش وغیر ذلك، ولم یقل بفناء جمیع المخلوقات الا طائفة من أهل الکلام والمبتدعین ك(جهم بن صفوان) ومن وافقه من المعتزلة و نحوهم، و هذا قول یخالف کتاب الله و سنة رسوله (صلى الله علیه وسلم) واجماع سلف الأمة وأئمتها)[1].

واتە: پێشینی ئۆممەت و پێشەوایان و تێکڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر ئەوەن کە چەند شتێك لە دروستکراوەکان بە تەواویی نافەوتێن و لە

---

(١) مجموع الفتاوى ١٨/٣٠٧.



بەین ناچن، وەکو: بەهەشت و دۆزەخ و عەرش و هی دیکەش وە هێندێك لە بیدعەتچی و ئەهلی کەلام وەکو(جهم بن صفوان) و ئەوانەی ڕایان وەکو ئەوە لە موعتەزیلەکان و هاوشێوەکانی، دەڵێن هەموو دروستکراوەکان دەفەوتێن و نامێنن، وە ئەو قسەیە پێچەوانەی کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) و یەکدەنگیی پێشینی ئۆممەت و پێشەواکانیەتی.

جگە لەو دەقەی هێنامانەوە (شيخ الإسلام) لە چەند شوێنێکی دیکەشدا ئەو مەسەلەیەی دووبارە کردۆتەوە لە کتێبی (درء تعارض العقل والنقل)[1] و (مجوع الفتاوى)[2] کتێبێکیشی تایبەت بەو مەسەلەیە بەناوی (الرد على من قال بفناء الجنة والنار) نووسیوە، کە دکتۆر(محمد السمهرى) تەحقیقی کردوە.

**شـــك:** گوایە (شيخ الإسلام) گوتوویەتی بوونەوەر هەر بووە:

ئەمەش یەکێکی دیکەیە لەو درۆیانەی ناحەزانی (إبن تيمية) بۆیان هەڵبەستوە، کە ناوبراو بە چەند قسەیەکی خۆی ئەو تۆمەتەشی هەڵوەشاندۆتەوە و ڕایگەیاندوە هەرکەسێك بوونەوەر یان شتێکی دیکە جگە لە خوای پێ ئەزەلی بێ، ئەوە کافرە و دەڵێ: (فالذي جاء به القرآن و التوراة واتفق عليه سلف الأمة وأئمتها مع أئمة أهل الكتاب: ان هذا العالم خلقه الله وأحدثه من مادة كانت مخلوقة قبله كما أخبر في القرآن أنه. (ثم استوى الى السماء وهي دخان).....)[3] فصلت -١١-.

واتە: ئەوەی قورئان و تەوراتی پێ هاتوە و پێشینی ئوممەت و پێشەواکانی و پێشەوایانی ئەهلی کیتاب لەسەری کۆکن، ئەوەیە کە خوا ئەم بوونەوەرەی هێناویەتە بوون و دروستی کردوە لە ماددەیەك، کە ئەویش پێش ئەو بوونەوەرە دروست کراو بووە، وەك قورئان باس دەکات: (دوایی فەرمانی بە ئاسمان کرد کە پێشتر دووکەڵ بوو)، وە ئەوە کۆدەنگیی فەیلەسووفەکانیشە کە دەڵێن ئەم بوونەوەرە دروستکراوە

---

(١) درء العقل والنقل ٣٥٨/٢ / وبيان تلبيس الجهمية ١٥٧/١.

(٢) مجموع الفتاوى ٣٠٧/١٨.

(٣) درء تعارض العقل والنقل ١٢٣/١.

لە ماددەیەك کەپێش دروستبوونی بوونەوەر هەبووە، بەڵام هێندێکیان دەڵێن ئەو ماددەیە قەدیم و ئەزەلیی بووە، کە ئەو قسەیەش پووچ و ناڕاستە.

وە دەڵێ: (فالذي يفهمه الناس من هذا الكلام ان كل ماسوى الله مخلوق حادث، كائن، بعد ان لم يكن، وان الله وحده هو القديم الازلي، ليس معه شيء قديم تقدمه، بل كل ماسواه كائن بعد أن لم يكن، فهو المختص بالقدم، كما اختص بالخلق والإبداع والإلهية والربوبية، وكل ماسواه محدث مخلوق مربوب عبد له)[1].

واتە: ئەوەی خەڵك لێی تێدەگەن لەو قسەیە ئەوەیە کە جگە لە خوا هەمووشتێك دروستکراوە و هاتۆتە دی، پەیداکراوە کە پێشتر نەبووە، وە تەنیا خوا هەربووە و کەس پێش ئەو نەبووە و هیچ شتێك وەکو ئەو ئەزەلیی نیە' بەڵکو جگە لەو هەموو شتێك پەیدا کراوە کە پێشتر نەبووە، وە هەر ئەو تایبەتمەندە بە هەربوێتی، هەروەکو تایبەتمەندە بە دروستکردن و داهێنان و پەرستراویی و پەروەردگارێتی وە هەموو شتێك جگە لەو پەیداکراوە و دروستکراوە و پەروەردەکراوە و بەندەی ئەوە.

**چوار:** گوایە شوێن و جێی بۆ خودا داناوە لە بەرزیی و ئاسمان:

(شيخ الإسلام) (رەحمەتی خوای لێبێت)، دەڵێ: (من توهم ان كون الله فى السماء بمعنى ان السماء تحيط به وتحويه فهو كاذب- ان نقله عن غيره- وضال- ان اعتقد في ربه- وما سمعنا أحدا يفهه من اللفظ، ولا رأينا احدا نقله عن أحد، ولو سئل سائر المسلمين هل تفهمون من قول الله تعالى و رسوله: (ان الله في السماء) أن السماء تحويه ؟! لبادر كل احد منهم الى أن يقول: هذا شيء لم يخطر ببالنا، بل عند المسلمين ان الله في السماء كما نص القرآن و السنة وهو على العرش واحد، اذ السماء انما يراد به العلو، فالمعنى أن الله في العلو لا في السفل)[2].

---

(١) درء تعارض العقل والنقل ١/١٢٥.

(٢) الفتوى االحموية ٥٢٣ / مجموع الفتوى ١٠٦.



واتە: هەرکەسێك وابزانێ کە بوونی خوا لە ئاسمان بەمانای ئەوەیە، کە ئاسمان دەوری دابێ یان لە نێو خۆی گرتبێ، ئەگەر لە یەکێك گێڕابیەوە، ئەوە درۆزنە و ئەگەر باوەڕیشی پێی هەبێ ئەوە گومڕایە، لە کەسمان نەبیستوە بەو شێوەیە لەو وشەیە بگات، یان لە یەکێکی نەقڵ کردبێ،، خۆ ئەگەر لە هەموو مسوڵمانان بپرسی: کە ئایە ئێوە لە مانای فەرمودەی خوا و پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ (ان الله في السماء) وا تێ دەگەن کە ئاسمان خوا وەخۆ دەگرێ و دەوری دەدا؟ دەڵێن ئەو شتەمان بە خەیاڵدا نەهاتوە، بەڵکو لای مسوڵمانان خوا لە ئاسمانە وەك قورئان و سوننەت دەڵێن و، لەسەر عەرشە و یەکێکە. وە مەبەست لە ئاسمان بەرزییە، واتە خوا لە بەرزییە و نەك نزمیی و بەرزە و نزم نیە).

(شیخ الإسلام) بە جورئەتەوە باسی لە عەقیدەی ئیسلامیی ئەوەی خۆی باوەڕی پێی هەبووە کردوە و ڕایگەیاندوە و لەگەڵ قورئان و سوننەت و بە تێگەیشتنی پێشین - سلف - بۆ عەقیدە هەنگاو دەنێ و لێ ی لانادا و نایگۆڕێ، بەڵام ئەوانەی دژایەتیی دەکەن، بۆ شتێك لە قسە و ڕایەکانی دەگەڕێن کە ناوبراوی پێ ناشیرین بکەن و قسەکانی بە شێوەیەك دەگۆڕن و لێك دەدەنەوە کە پێی بگەنە مەبەستەکانیان، لە دوژمنایەتیی کردنیان دا بۆی، وە لە تێکڕای قسە و نووسراوەکانی دا (شیخ الإسلام) ئەوەی سەلماندوە کە شەرع سەلماندوویەتی کە خوا لە ئاسمانە و مەلائیکەتەکان بۆلای ئەو بەرز دەبنەوە، ئەو بەرزبوونەوە و لەسەرەوە بوونەش بە شێوەیەك، کە خوا دەیزانێ و لەخۆی دەوەشێتەوە و وەکو بەرزبوونەوە و لەسەرەوە بوونی دروستکراوەکانی نیە، چونکە (ليس كمثله شيء) هیچ شتێك وەکو ئەو نیە لە زات و سیفەت و کردەوەکانی دا، وە (شیخ الإسلام) لە قسەی پێشین دەرنەچووە، بەڵکو لەوبارەوە لەوەش دەرنەچووە کە نووسراوە لەو کتێبانەدا کە ناحەزەکانی بەکاریان دەهێنا لە دژی، وەك کتێبی: (اتحاف الكائنات ببيان مذهب السلف والخلف من المتشابهات)ی زانای گەورە (السبكي) (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، کە لە تەفسیری ئایەتی (ءأمنتم من في السماء) دەڵێ:

(نؤمن بها على المعنى الذي أراده الله سبحانه وتعالى مع كمال التنزيه عن صفات الحوادث والحلول)[١].

واتە: ئیمانمان پێەتی لەسەر ئەو مانایەی خوا مەبەستیەتی لەگەڵ ئەوپەڕی بە پاك راگرتنی لە وێچوون بە سیفەتی پەیدابووەکاندا، بێگومان بەرزیی خوای بێ وێنە بەو شێوەیە کە خوا مەبەستیەتی. وە ئەم مەسەلەیە جگە لە (شیخ الإسلام) هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوانیان و پێشەوایانی بەرزی دیکەی ئیسلام، دانیان پێداهێناوە بۆ نموونە:

أ- ئیمام (طبري) گەورەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێ: (وهو العلي على خلقه بآرتفاع مكانه عن أماكن خلقه...)[٢].

ب- ئیمام (الدارمي) دەڵێ: (له مكان واحد أعلى مكان، وأطهر مكان، وأشرف مكان، عرشه العظيم المقدس المجيد، فوق السماء السابعة العليا..)[٣].

ج- زانای گەورە (عبدالقادر)ی گەیلانیی لە کتێبی (الغنية) کە لە(مجموع الفتاوى)دا لە (٨٣/٥ –٨٤) هێناویەتی، دەڵێ: (وهو تعالى بجهة العلو مستو على العرش، محتو على الملك، محيط علمه بالأشياء).

د- (الحافظ ابن كثير) یش ڕێبازی سەلەفی گرتوە وەك (مالك و أوزاعی و ليث و شافعي و احمدبن حنبل واسحاق) و کەسانی دیکەش لە پێشەوایانی مسوڵمانان، کە ڕایان تێپەڕاندنی ئەو ئایەتانەیە کە باسی سیفەتەکانی خوا دەکەن بەو شێوەی هاتوون بەبێ چۆنیەتی وێچواندن و پەکخستن و گۆڕین[٤].

هـ- ئیمام (نعيم بن حماد الخزاعي) مامۆستای (البخاري) دەڵێ: (من شبه الله بخلقه كفر، ومن جحد ماوصف الله به نفسه فقدكفر، وليس فيما وصف الله به

---

(١) اتحاف الكائنات للسبكى ٥.

(٢) جامع البيان ج٣ ص٩.

(٣) النقض على بشر المريسى ٩٦/١.

(٤) اتحاف الكائنات للسبكي ٦/ تفسير ابن كثير ٤٨٨/٣.



نفسه ولا رسوله تشبيه)[1]. واتە: هەر کەسێك خوا بە دروستکراوەکانی بچوێنێ ئەوە کافرە، وە هەرکسێك بڕوا نەهێنێ بەوە کە خوا وەسفی خۆی پێ کردوە، ئەوە کافرە، وە ئەوەی خوا وەسفی خۆی پێ کردوە، یان پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) وەسفی خوای پێ کردوە، وێچواندنی تێدا نیە.

و- (ابن رشد المالکی) لە کتێبی (الکشف عن مناهج الأدلة) لە لاپەڕە (٦٦)دا دەڵێ: (وأما هذه الصفة (يعني القول بالجهة) فلم يزل أهل الشريعة يثبتونهاحتى نفتها المعتزلة ومتأخروا الأشاعرة... فقد ظهر ان اثبات الجهة واجب شرعا وعقلا). واتە: بەڵام ئەم سیفەتە واتە: (جهة) بەردەوام شارەزایانی شەریعەت دانیان پێدا دێنا، هەتا موعتەزیلە و زانایانی پاشینی ئەشاعیرە نەفیان کرد، بۆیە دەرکەوت کە دانپێداهێنانی (جهة) بەپێی شەرع و عەقڵ پێویستە..وەك لە سەرەوەبوون.

ز- ئیمام (القرطبي) خاوەنی تەفسیر دەڵێ: (وقد كان السلف الاول (رضي الله عنهم)، لا يقولون بنفي الجهة ولا ينطقون بذلك، بل نطقوا هم والكافة بإثباتها لله تعالى كما نطق كتابه وأخبرت رسله...)[2] (تفسير القرطبي ٢١٩/٧). واتە: ،(پێشینە یەکەمەکان ڕەزای خوایان لێ بێ، هەبوونی (لا) (جهة) یان (بۆ خوا) نەفی نەکردوە و باسیشیان نەکردوە. بەڵکو قسەیان کردوە بەو شێوەیەی قورئان فەرموویەتی و پێغەمبەرانی خەبەریان داوە.

ئاوا دەبینین،کە پێشەوایانی پێشین لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) تا ئێستا کۆك بوون لەسەر سەلماندنی (الفوقية) واتە لەسەرەوە بوون بۆ خوا سبحانه وتعالی بەو شێوەیەی خۆی دەیزانێ و شایستەیە بۆی و لە ژێرەوە بوونیش بۆ دروستکراوەکانی)[3].

---

(١) اتحاف الكائنات للسبكي ٦.

(٢) الجامع احكام القرآن ٧/ ٢٨٩.

(٣) الرحمن على العرش استوى . د. عوض منصور ٣٠ – ٣١.

**پێنــج:** تۆمەت بۆ هەڵبەستنی کە گوتبی پەیدابووەکان، لە زاتی خوادا هەن:

ئەمەش قسەیەکی هەڵبەستراوی دیکەیە کە ناحەزانی بۆیان هەڵبەستوە، چونکە هەر کەسێك کتێبەکانی بخوێنێتەوە بەتایبەتی (درء تعارض العقل والنقل) بۆی دەردەکەوێ، کاتێك موناقەشە دەکات لەگەڵ ئەهلی کەلامدا، وەڵامی هیچ مەسەلەیەکی کەلامیی ناداتەوە، تا مانا و مەبەستی هەر زاراوەیەکی بۆ دەرنەکەوێ کە ئەوان دایاننناوە، چونکە بەڕای ئەو چەند زاراوەیەك ئەهلی کەلام دایاننناون وەك: (جوهر، عرض، حوادث..) کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نەبوون و هیچ ئایەتێکی (محکم)یش لەوبارەوە نەهاتۆتە خوارێ.

(ابن تیمیة) دەڵێ: (.. ناکۆکیی نێوان خەڵکی بە قورئان چارەسەر دەبێ، وەك خوا دەفەرموێ: (وما اختلفتم فیه من شيء فحكمه الى الله) بەڵام ئەگەر حوکم و چارەسەرەکەی بگەڕێندرێتەوە بۆ عەقڵیان، ئەوە هەریەکەیان عەقڵی خۆی هەیە و ناگەنە یەك)[1]. لەسەر ئەو بنچینەیە کە داینناوە لە بەرپەرچدانەوەی (متکلمین)دا دەڵێ: (ئەگەر کەسێك بڵێ خوا جێی شتی پەیدابووەکان (حوادث) نیە، پێی دەڵێین ئەوە قسەیەکی کورت (مجمل)ە و پێویستی بە شیکردنەوە هەیە و بەشێوەی ڕەها وەرناگیرێ، بەڵکو دەبێ بەم شێوەیە روونبکرێتەوە: ئەگەر مەبەست لەو قسەیە ئەوەبێ کە لە زاتی پیرۆزی خوای پەروەردگاردا هیچ شتێکی دروستکراو و پەیدابوو نیە، ئەوە راستە، یان ئەگەر مەبەست پێی نەفی نوێبوونەوە و پەیدابوونی سیفەتی خوا بێ، ئەمەشیان هەق و راستە، چونکە سیفەتەکانی خوا هەر بوون و ئەزەلیین، وە ئەوانە سیفەتی تەواویین و نەبوونیان نوقسانیە و لە خوا ناوەشێتەوە. بەڵام ئەگەر مەبەست بەو نەفی کردنە ئەوە بێ کە نەفی سیفەتێك دەکەن کە خوا وەسفی خۆی پێ کردوە و پێغەمبەرەکەشی (صلی الله علیه وسلم) وەسفی خوای پێ کردوە، ئەوە وەرناگیرێ و هەڵەیە و بەسەر خاوەنەکەی دا دەدرێتەوە، چونکە مسوڵمان ئەوەی بە خەیاڵدا نایات کە خوا وەسفی خۆی یان پێغەمبەرەکەی

---

(١) درء تعارض العقل والنقل ٢٢٩/١.



(صلی الله علیه وسلم) وەسفی خوا بە قسەیەك بكات كە ڕواڵەتەكەی كوفر بێ و پێویست بە تەئویل كردن بێ، بەڵكو هەموو ئەوانەی خوا وەسفی خۆی پێ كردوون یان پێغەمبەرەكەی (صلی الله علیه وسلم) وەسفی خوای پێ كردوون سیفەتی تەواویین و ڕواڵەتەكەشیان كە شیاوە بۆ خوای پەروەردگار، جیاوازە لەو ڕواڵەتەی درووستكراوەكان دیاروناشكران هەروەك چۆن زاتی خوا جیاوازە لە زاتی دروستكراوەكان)[1]. وەدەڵێ: كاتێك موعتەزیلە رایگەیاندو گوتی: (لاتحل به الاعراض والحوادث) واتە: ڕووداوو پەیدابووەكان نایگرنەوە،وەك سیفەتی زانیاری وتواناو كردەوەی دروستكردن و بەرزبوونەوەو مراندن و ژیاندن وتێكڕای كردەوەكان،پێشەوایانی پێشین(ائمة السلف) دژیان وەستانەوە....)

هەر بۆیە ئیمام بوخاریی لە (كتاب التوحید) ی (صحیح)ی خۆی دا لە باسی: ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ﴾ الرحمن (٢٩)، و ﴿لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾ الطلاق(١)، دا دەڵێ: (إن حَدَثَه لايُشْبِه حَدَثَ المخلوقين) چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ الشوری(١١)[2].

كەواتە (ليس كذاته ذات، وليس كصفاته صفات، وليس كأفعاله افعال، استواء ونزولا..)[3]. واتە: هیچ زاتێك وەك زاتی ئەو نیە، هیچ سیفەتێك وەك سیفەتی ئەو نیە، وە، هیچ كردارێك وەكو كرداری ئەو نیە لە چوونە سەر و هاتنە خوار......)

بەو شێوەیە بۆمان دەركەوت ئەوەی ناحەزانی لە دژی (شيخ الإسلام) گوتوویانە وانەبووە و درۆ و تۆمەتی نەیارانی وەكو پەڵە هەوری هاوینان زوو لە بەرانبەر ڕۆشنایی ڕاستییەكان دا ڕەوینەوە و نەماون.

---

(١) مجموع الفتاوی ٢٧٣/٦.

(٢) فتح الباری ٤٩٦/١٣.

(٣) الرحمن علی العرش استوی: د. عوض منصور ٢٨ - ٣٠.

**٥- هەڵە لە ئیجتهادی مەسەلە عەقیدەییەکان دا:**

هێندێك وا گومان دەبەن کە لە مەسەلە عەقیدەییەکاندا ئیجتیهاد ناکرێ، وە هەرکەسێك لە مەسەلەیەکی عەقیدەیی دا هەڵە بکا ئەوە عوزری نیە و پاداشتیشی نیە. چونکە ئەو حەدیسەی باسی هەڵەی موجتەهید دەکات تەنیا بەسەر ئەوانەدا دەچەسپێ کە لە مەسەلەی فیقهی عەمەلی دا ئیجتهاد دەکەن نەك عەقیدە، بەڵام لە راستیدا ئەو تێڕوانینە هیچ بنەماو پاڵپشتێکی شەرعیی نیە، وە جیاوازیی نیە لە عوزر و پاداشتدا بۆ هەر زانایەك کە ئیجتیهاد دەکات لە مەسەلەکانی دیندا و هەڵەدەکات، پێش ئەوەی هەڵەکەی بۆ دەرکەوێ، لەوبارەوە (شیخ الإسلام) لەچەند شوێنێکدا تەئکیدی لەوە کردۆتەوە بۆ نموونە: دەربارەی ئیجتیهادی هاوەڵان رەزای خوایان لێ بێ، دەڵێ: (وتنازعوا في مسائل علمية اعتقادية، كسماع الميت صوت الحي، وتعذيب الميت ببكاء أهله، ورؤية محمد (صلى الله عليه وسلم) ربه قبل الموت، مع بقاء الجماعة والألفة)[1].

واتە: لە هێندێك مەسەلەی عیلمی عەقیدەیی دا ناکۆك بوون، وەك: بیستنی مردوو بۆ دەنگی زیندوان، سزادرانی مردوو بە گریانی کەس و کارەکەی، وە ئەوەی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش وەفاتیی خوای بینیبێ، ئەم ڕاجیاییانەیان هەبوون لەگەڵ مانەوەی کۆمەڵبوون و ئولفەت و خۆشەویستیشدا. وە دەربارەی ئیجتیهاد لە مەسەلە عەقیدەیی و فیقهی یەکاندا بە گواستنەوەی ڕا جیاوازەکان دەڵێ: لە (عبيدالله بن الحسن العنبرى) گێڕدراوەتەوە کە ئەمە ماناکەیەتی: کە ئەو موجتەهیدانەی لە مەسەلە عەقیدەیی و فیقهییە کردارییەکان دا ئیجتیهاد دەکەن و دەکەونە هەڵەوە گوناهبار نابن، دیارە زۆربەی ئەهلی کەلام رەخنەیان لە قسەکەی (عبيدالله) گرتوە، بەڵام زانایان جگە لەوان دەڵێن: ئەوە قسەی پێشین و پێشەوایانی فتوان، وەك: (أبو حنيفة و شافعي و ثوري و داود بن علي) کە موجتەهید بە گوناهبار نازانن ئەگەر ئیجتیهاد بکا و هەڵە بکات لە مەسەلە عەقیدەیی و فیقهیی یە کردارییەکاندا،

---

(١) مجموع الفتاوى ١٩/ ١٢٣.



هەر بۆیە (أبو حنيفة و شافعي) و غەیری وانیش شەهادەتی تاقمە لادەرەکان جگە لە (الخطابية) وەردەگرن و نوێژکردن لە دوایانەوە بە دروست دەزانن، وە زانایان دەڵێن: وە جیاوازیی خستنە نێوان مەسەلەی عەقیدە و فیقهیی کردەیی لە ئیجتهاددا، شتێکە پەیدا کراوە لە ئیسلام دا و هیچ کام لە قورئان و سوننەت و ئیجماعیش دەلالەتی لەسەر ناکەن، بەڵکو هیچ کەس لە پێشین و پێشەوایان ئەوەی نەگوتوە[1].

هەر لەو بارەوە (شيخ الإسلام) دەڵێ: ئەمە قسەی کۆتاییە کە هەر موجتەهیدێك ئیجتیهاد بکا و بەپێی توانا پارێز لە خوا بکا و دەلیل بێنێتەوە، ئەوە ئەوەی خوا لەسەری پێویست کردوە بەجێی هێناوە و فەرمانی خوای جێبەجێ کردوە و شایانی پاداشتە و، لەسەر ئەوە خوای دادگەر سزای نادا، بە پێچەوانەوە ڕای ئەو جەهمییانەی کە دەڵێن ئینسان ئیختیاری نیە و هەرچی دەیکا پێی دەکرێ.

ئەوەی بەو شێوەیەی باسمان کرد ئیجتهاد بکات فەرمانی خوای بەجێ هێناوە، بەڵام جاری وا هەیە هەق دەزانێ و دەیپێکێ، جاری واش هەیە نایزانێ و نایپێکێ، بە پێچەوانەوە (قەدەریی و موعتەزیلە)کان دەڵێن: هەر کەسێك ئەو پەڕی توانای خۆی بەکار بێنێ ئەوە هەقی زانیوە و پێکاویەتی، کە ئەوە پووچ و هەڵەیە وەك باسمان کرد، بەڵکو هەرکەسێکك ئەوپەڕی توانای خۆی بەکار بێنێ، شایستەی پاداشتە نەك لە هەموو حاڵەتاندا هەقی پێکابێ[2].

---

(١) مجموع الفتاوى ١٩/٢٠٦ - ٢٠٧.

(٢) مجموع الفتاوى ١٩/ ٢١٦ - ٢١٧.



چەند نموونەیەك لەوبارەوە :

(شیخ الإسلام) لەو بارەوە چەند نموونەیەك دێنێتەوە و دەڵێ: (هەڵەی بوردراو لە ئیجتهاددا لە هەردوو مەسەلەی (الخبرية والعملية) وەك لە شوێنی دیکەش باسمان کردوە، وەك یەکێك باوەڕی بە شتێك بێ لەبەر ئەوەی ئایەتێك یان حەدیسێك دەلالەتی لەسەر دەکات، بەڵام دەق هەیە پێچەوانەی ئەو رایەیە و ئاگای لێ ی نیە.

١- وەك ئەوەی باوەڕی وابێ کە لە دوو کوڕەکەی ئیبراهیم (علیهم السلام)، (إسحاق) ئامادەکرا بۆ سەربڕین نەك (إسماعیل) بە پێی حەدیسێك کە وادەزانێ - لە رووی سەنەدو مەتنەوە - چەسپاوە.

٢- یان بڕوای وایە کە خوا نابینرێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴾الانعام (١٠٣).

وە دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ ﴾الشورى (٥١).

کە (عائیشە) (رەزای خوای لێبێت)، بەڵگەی بەو دوو ئایەتانە دێنایەوە لەسەر نەبینرانی خوا، لەلایەن پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) -لە دنیادا لە شەوی میعراج دا.

وەك لە هێندێك لە تابیعین گێڕدراوەتەوە کە خوا قەت نابینرێ، وە ئایەتی:

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴾ القیامە(٢٢-٢٣).

بەوە تەفسیر دەکەن کە چاوەڕوانی پاداشتی خوا دەکەن، کە ئەمە لە (مجاهد و أبي صالح) گێڕدراوەتەوە.

٣- یان یەکێك بڕوای وایە کە مردوو بە گریانی زیندوان سزا نادرێ، چونکە وای دەزانی فەرموودەی خوا کە دەفەرموێ:



﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾ فاطر(١٨).

ئەوە دەگەیەنێ وە ئەمە پێش ریوایەتی ئینسان دەخرێ چونکە بیستن هەڵە دەکات، کە ئەمە بڕوای خەڵکێکە لە پێشین و پاشین.

٤- یان بڕوا بوون بەوەی مردوو گوێی لە قسەی زیندوو نابێ و قەناعەتی وایە ئایەتی:

﴿ إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ النمل(٨٠). دەلالەت لەسە ئەوە دەكات.

٥- یان باوەڕی وایە خوا سەرسام نابێ، وەك (شریح) قەناعەتی وابووە چونکە سەرسام بوون لە نەزانین بە هۆكارەكانەوە دروست دەبێ، خواش لەوە بەرییە.

٦- یان باوەڕی وایە (علي) گەورەترین کەسە لە یارانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بەوەی باوەڕی بە ڕاست بوونی ئەو حەدیسەیە لە (سەنەد و مەتن) کە باس لەوە دەكات.

٧- یان باوەڕی وابێ کە هەر کەسێك جاسووسی بۆ دوژمن بکات و غەزا و هێرشی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ی بۆ ئاشکرا بکات، ئەوە موونافیقە، وەك قەناعەتی (عومەر) کە بەرانبەر (حاطب) گوتی: (لێم گەڕێن با لە گەردەنی ئەو موونافیقە بدەم).

٨- یان باوەڕی وابێ هەر کەسێك بەرگریی لە موونافیقان بکاو لەسەر ئەوان تووڕە بێ، ئەوە ئەویش موونافیقە وەك(أسید بن خضیر)بە(سعد بن عبادة)ی گوت: تۆ موونافیقی و دیفاع لە موونافیقان دەكەی.



## چوارەم: (شيخ الاسلام) و تەزکیەی نەفس

(ابن تيمية) (رەحمەتی خوای لێبێت)، یەکێکە لە سوارچاکانی مەیدانی ئامۆژگاری و بواری تەزکیەو پاك بوونەوەو گەشەکردنی نەفس، وەك لە کتێب ونووسراوەکانیدا دەردەکەوێ،وەك پزیشکێکی شارەزاو کارامە نەخۆشیەکانی نەفسی دەست نیشان کردوون و دەرمان و چارەسەری پێویستی بۆ داناون و بۆ خۆ پاراستن لە کەوتنە چاڵی خراپەکارییەوە ڕێ و شوێنی پێویستی دیاری کردوون.

بە دەلیل و بەڵگەی بەهێزو شێوازی جوان و پشت بەستوو بە ئایەت و حەدیسی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، پاك بوونەوەی نەفسەکان لە نەخۆشی و سیفەتە خراپ و شەیتانییەکان و گەشەکردن و پێهەڵچوونی نەفسی ئینسان باس دەکا و بابەتەکانی روون کردوونەوەو ڕاو بۆچوونی هەڵەی بیدعەتچی و بیرو باوەڕە نادروستەکانیانی بەرپەرچداونەوە.

وەك لە ژیان و نووسراوەکانی (شيخ الاسلام) دا دەردەکەوێ ئەو زۆر گرنگی بە لایەنی تەزکیەی نەفس و دوور کەوتنەوەو خۆبژارکردن لە گوناهە ئاشکراو پەنهانەکان و سیفەتە خراپ و پەستەکان داوەو ویستویەتی خۆی بە ئیمانی بەهێزو تەقواو ئیحسان و سیفەتە بەرزو پەسەندەکان بڕازێنێتەوەو بە کردەوە لە خۆیاندا بێنێتە دی، کە ئەمەش بە شوێنکەوتنی قورئان وسوننەت دەبێ.

سەبارەت بە چاك بوونی دڵەکان (ابن تيمية) دەڵێ: تەنیا بە عیبادەت و خۆشەویستی و گەڕانەوە بۆ لای خوا دڵەکان شادو چاك و گەشاوە دەبن و ئارامی و ئۆخژنی ڕاستەقینە ڕوویان تێ دەکا، ئەوەش تەنیا بە یارمەتیی خوا دێتەدی، کە هەر خوا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هەرچەندە ئینسان بەو مەبەستەش ڕێ بکات، بەڵام یارمەتی لەو نەخوازێ و پشت بەو نەبەستێ بە مەرامی خۆی ناگا.

بنچینەی خێرو چاکەش لای (شيخ الاسلام) وەك پێشتر باسمان کرد، بریتیە لەو دڵسۆزی و یەك لابوونەوەیەی ئینسان بۆ خوای پەروەردگار لە ڕووی (هەر



ئەو پەرستن و داوای یارمەتی هەر لەو کردنەوە وەك خوا دەفەرمویٚت:
﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ (الفاتحە: ٥).[١]

وە دەڵێ: (هیچ خۆشەویستیەك لە خۆشویستنی مسوڵمان بۆ خوای خۆی گەورەتر و خۆشتر و تەواوتر نیە، هیچ شتێك نیە جگە لە خوا لەبەر زاتی خۆی لە هەموو ڕوونکەوە شیاوی بە گەورەگرتن و خۆشویستن بێت، جگە لەو هەر شتیك خۆشبویستریٚ لەبەر خوایە، پێغەمبەریش(صلی الله علیه وسلم) لەبەر خوا خۆشدەویستریٚ و گویٚ ڕایەڵی بۆ دەکریٚ و دەکرێتە پێشەنگ.[٢]

هەرکەسێك ئاشنای بەرهەم و کەلەپووری (شیخ الاسلام) بیٚ، بۆی دەردەکەویٚ کە ناوبراو راو بۆچوونی جوانی هەن لەسەر تەزکیەی نەفس - گەشەپێدانی و پاککردنەوەی - و پەروەردەکردنی و چارەسەری نەخۆشییەکانی دڵ و زانینی هۆکارەکان و، لە ریزی پێشەوەی پەروەردەکارانی دادەنیٚ، وە ئەوەی بیەویٚ لیٚ ی بەهرەمەند بیٚ با ئەو کتێب و نووسراوانەی بخوێنێتەوە کە سەبارەت بەو مەسەلەیە نووسیونی وەك: (التحفة العراقیة، امراض القلوب و شفاؤها، الاستقامة)، وە هەموو ئەو نامانەی لەو بارەوە نووسیونی و لەبەرگی دەیەمی (مجموع الفتاوی) دان، لێرەدا هەندێك لە راو سەرنجەکانی دەخەینە روو:

## ١- دل بنچینەیە:

شێخ الاسلام دەڵیٚ: (هەر زانین و ویستێك لە دڵدا هەبیٚ لەسەر لاشە رەنگ دەداتەوە و جەستە ناتوانیٚ پێچەوانەی ویستی دڵ بیٚ، هەربۆیە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرمویٚ:
(الا وإنّ في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله الا وهى القلب) رواه البخاري برقم (٥٢).

واتە: ئاگادارین لە جەستەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەو چاك بوو،

---

(١) مجموع الفتاوی ج١٠ ص٦٥٩.

(٢) مجموع الفتاوی ج١٠ ص٦٤٨.

تێکڕای جەستە چاکە، وەئەگەر ئەو خراپ بوو، ئەوا هەموو جەستە خراپ دەبێ، ئەویش دڵە.

کەواتە ئەگەر دڵ چاك بێ بەهۆی ئیمان و زانیاری و کردەوەی دڵەوە ئەوە لاشەش چاك دەبێ. هەروەك پێشەوایانی حەدیس دەڵێن : ئیمان بریتیە لە (قول و عمل, قول باطن و ظاهر و عمل باطن و ظاهر) واتە: ئیمان بریتیە لە : قسە و کردەوە، قسەی ناوەوە - دڵ - وئاشکرا - زمان - وە کردەوەی ناوەوە - دڵ - و ئاشکرا - ئەندامەکان -.

کردەوەی ڕواڵەت و ئاشکراش بەدوای ناوەوە - دڵ - دا دێ و پەیوەستە پێیەوە، هەرکاتێك دیوی ناوەوەی مرۆڤ چاك بوو، دەرەوەشی چاك دەبێ، کە خراپیش بوو دەرەوەشی خراپ دەبێ. بۆیە یەکێك لە هاوەڵان بە نوێژکەرێکی گوتوە: (لوخشع قلب هذا, خشعت جوارحه)، واتە: ئەگەر دڵی ئەو نوێژ کەرە گەردن کەچ و ئارامگر بوایە ئەندامەکانی جەستەشی گەردن کەچ دەبوون. دیارە ئەو کەسە جوڵە جووڵی زۆر و زیادە ڕۆیی کردوە لەناو نوێژدا[1].

## ٢- خۆشەویستی و هۆکارەکانی چاکبوونی دڵ:

(شیخ الاسلام) دەڵێ: دڵ چاك و شاد نابێ و چێژ وەرناگرێ و ناگەشێتەوە و ڕازاوە نابێ و ئارام و ئۆقرە ناگرێ بە پەرستن و ملکەچی نەبێ بۆ پەروەردگاری و خۆشویستنی و گەڕانەوە نەبێ بۆ لای ئەو.ئەگەر ئینسان هەموو چێژ و خۆشیەکی لە درووستکراوەکانەوە بۆ مەیسەر بێ، دڵی ئارام و ئۆخژن ناگرێ و هەر هەژارە و موحتاجی پەروەردگاریەتی، لەو ڕووەوە کە پەرستراو و خۆشەویست و داواکراویەتی، بەوە شادی و چێژ و نیعمەت و ئارامی دەست دەکەوێ، ئەوەش بە یارمەتی خوا نەبێ نایەتە دی و جگە لە خوا کەس ناتوانێ بۆی مەیسەر بکات.... خۆ ئەگەرهەوڵبدا بەوە بگات بەبێ پشت بەخوا بەستن و لالانەوە و داوا کردنی لەخوا ئەوە دەستی ناکەوێ، چونکە هەرچی خوا بیەوێ ئەو دێتە دی و ئەوەی نەیەوێ نابێ.[2]

---

(١) مجموع الفتاوى ١٨٦/٧ - ١٧٨

(٢) مجموع الفتاوى ٧ / ١٨٦ - ١٨٧



### ٣- سەرچاوە و بنچینەی خێر و چاکە:

لە روانگەی (شیخ الاسلام)ەوە سەرچاوە و بنچینەی خێر و چاکە بریتیە لە دڵسۆزیی و یەکلابوونەوەی بەندە بۆ پەروەردگاری لەرووی ملکەچی و تەنیا ئەو پەرستن و داوای یارمەتی تەنیا لەو کردنەوە، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ الفاتحه (٥).

واتە: هەرتۆ دەپەرستین و داوای یارمەتی هەر لەتۆ دەکەین. وە دەفەرموێ:

﴿فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ﴾ هود ١٢٣ .

واتە: تەنیا ئەو بپەرستە و پشت هەر بەو ببەستە. وە دەفەرموێ:

﴿عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود ٨٨ .

واتە: تەنیا پشتم بەخوا بەستوە و بۆلای ئەو دەگەڕێمەوە. وە دەفەرموێ:

﴿فَابْتَغُوا عِندَ اللَّهِ الرِّزْقَ وَاعْبُدُوهُ وَاشْكُرُوا لَهُ ﴾ العنكبوت ١٧.

واتە: هەر لەخوا داوای رۆزی بکەن و هەر ئەو بپەرستن و سوپاسگوزاربن بۆی. بەشێوەیەك بەندە پەیوەست بوونی دڵی بپچڕێ بە دروستکراوەکانیەوە بەوەی سوودمەند دەبێ لێیان یان کردەوەیەك لەبەرخاتری ئەوان بکات. بەڵکو هەموو مەبەستێکی خوایە و هیچی دیکە. ئەویش بە پاڕانەوە لێ ی بۆ هەر داواکراوێك و هەرپێویستیەك و رزگاربوون لە هەرترس و ناخۆشیەك[1].

### ٤-مانای (تقوی) پارێزکاری:

تەقوا ئەوەیە بەندە بە ئومێدی رەحمەت و بەزەیی خوا، بەپێی رۆشنایی و فەرمانی خوا، فەرمانبەری خوا دەکات و، لەبەر ترسان لەخوا بە پێی رۆشنایی و فەرمانی خوا واز لە گوناهو تاوان دێنێ.

---

(١) مجموع الفتاوى ١٠/١٩٤ - ١٩٥

وە بەندە نزیك نابێتەوە لە پەروەردگاری بەکردنی فەرزەکان نەبێ، دوای ئەوە بەکردنی سوننەت و کارە پەسندەکان، وەك لە حەدیس داهاتوە کە خوا دەفەرموێ: (وما تقرب اليّ عبدي بشيءٍ أحبَّ اليّ مما افترَضته عليه ومايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى أحبه...)[1] رواه البخاري (٦٥٠١).

## ٥- شیرنایەتی ئیمان:

شيخ الاسلام دەڵێ: (ئیمان کە چۆ ناو دڵەوە و شەوق و رووناکیەکەی تێکەڵی بوو، دڵ پێی نارەحەت نابێ، بەڵکو خۆشی دەوێ و پێی رازیە، چونکە ئیمان شیرنایەتی و چێژ و خۆشی و ئۆخژن دەبەخشێ بەدڵ بە شێوەیەك ئەوەی نەیچێژتبێ نازانێ باسی بکات، خەڵکیش لە ئەندازەی ئەو چێژ وەرگرتنە لە یەکتری جیاوازن، خوا دەفەرموێ:

﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾ التوبه ١٢٤.

واتە: خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ئیمانداران مژدەدەن بەوەی لە قورئان بۆیان هاتۆتە خوار ئەو مژدەدانەش شادی و بەختەوەرییە، لە ئەنجامی ئەو شیرنایەتی و چێژ و خۆشیەی لە دڵیاندایە بەوەی خوا ناردوویەتیە خوار.

چێژ و خۆشی بەدوای خۆشویستن دادێ، هەرکەسێك شتێکی خۆشویست و پێی گەیشت بەو بەیەك گەیشتنە چێژ و خۆشی وەردەگرێ، هیچ خۆشویستنێك لە خۆشەویستی بڕواداران بۆ پەروەردگاریان گەورەتر و تەواوتر نیە، هیچ شتێك نیە لە بوندا شایستەی خۆشویتران بێ لەبەر زاتی خۆی لە هەموو روێکەوە جگە لە خوای گەورە، وە هەر شتێك خۆشبویسترێ لەبەر خۆشویستنی خوایە، بۆ نموونە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبەر خوا خۆشدەویسترێ و فەرمانبەری بۆ دەکرێ و دەکرێتە پێشەنگ و رێ و شوێنی دەگیرێتە بەر.[2]

---

(١) مجموع الفتاوى ٦٥٩/١٠ - ٦٦٠

(٢) مجموع الفتاوى ٦٤٨/١٠ - ٦٤٩



## ٦- الافتقار الى الله (لاوازیی بەرانبەر خوا):

هەروەك چۆن بەندە هەموو كاتێك پێویستی بە پەرستنی خوایە، بەهەمان شێوەش بەردەوام لاوازە و پێویستی بە پشت بەستن بەخوا و داوای یارمەتی كردنە لێ ی، بۆیە دەبێ بەردەوام لاوازی و پێویستی خۆی بۆ خوا دەربخات، بەوەی كە پەرستراو و یارمەتی دەریەتی چونكە (لاحول ولاقوة الا بالله) لادان لە خراپە و بەردەوامی لەسەرچاكە بە یارمەتی خوا نەبێ، نایەتە دی.[1]

بەندە تا ملكەچتر بێ بۆ خوا و زیاتر لاوازی و موحتاجی خۆی دەربڕێ بۆی و بیپەرستێ ئەوە نزیكتر و بەرێزتر دەبێ لای خوا. بەڵام ئەو شتە لای ئینسانەكان جیاوازە و پێچەوانەیە، چونكە ئەو كەسە لای خەڵكی زۆر رێزدارە كە پێویستی پێیان نیە، خۆ ئەگەر چاكەیان لەگەڵدا بكەی و بێ نیازیش بی لێیان ئەوە لە هەموو كەس لەلایان بەرێزتری. وە هەركاتێك پێویستیت پێیان بوو- ئەگەر قومە ئاوێكیش بێ - بە پێی پێویستیەكە رێزت لایان كەمتر دەبێ .[2]

## ٧- بەسوودترین شت بۆ هەموو خەڵكی:

ئەوەی بەسوودترین شتە بۆ هەموان بریتیە لە زانیاری بەوەی نەفسەكان لە هەڵەو تاوان دەپارێزێ و لە گرفت رزگاریان دەكات، كە بریتیە لەوەی چاكە بەدوای خراپەدا بێنێ. چاكەكانیش ئەوانەن كە خوای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لە كردەوە و خوو رەوشت و سیفەتەكان ناردوونی. وە لەوشتانەی هێندێك لە گوناهان لادەبات بەڵا و مصیبەت و گرفتاریەكانن وەك هەموو ئەو شتانەی بە ئێشن لە خەم و پەژارە و ئەزیەت و ئازار لە ماڵ و نەفس و ناموس و جەستە و... بەڵام ئەو رەشكەرەوەی گوناهانە لە كردەوەی ئینسانەكان نین[3].

---

(١) مجموع الفتاوى ١٠ / ٤٣٣

(٢) مجموع الفتاوى ٣٩/١

(٣) مجموع الفتاتوى ١٠ /٦٥٧



## ٨- کۆکەرەوەی رەوشتە جوانەکان لەگەڵ خەڵکی:

(شیخ الاسلام) دەڵێ: ئەوەی کۆکەرەوەی رەوشتە جوانەکانە لەگەڵ خەڵکی بریتیە لەوەی : ئەو کەسەی پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندووی تۆ بەسەلام لێکردن و رێز و دوعا بۆکردنی و داوای لێخۆشبون بۆی و باسکردنی بە چاکە و چوونە لای دروستی بکەیەوە، ئەوەی ئەو ناتداتێ لە زانیاری و سوودپێ گەیاندن و هاوکاری ماڵ و سامان تۆ بیدەیەی و خۆشبی لەو کەسەی ستەمی لێ کردووی لە خوێن، و ماڵ و ... کە هێندێك لەوانە واجب و هێندێکیان سوننەت و پەسندن.

ئەو خوورەوشتە مەزنەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ی پێ وەسف کراوە ئەو دینەیە کە هەموو ئەو شتانەی خوا فەرمانی پێ کردوون کۆی کردوونەوە ئەوە موجاهد و کەسانی دیکەش وایان گوتووە، وەك (عائیشە)ش (رەزای خوای لێ بێت) دەربارەی خوو رەوشتی پێغەمبەر وتویەتی (کان خلقه القران) کاکڵەکەشی بریتیە لەوەی بەرەزامەندی و ئەوپەڕی تامەزرۆییەوە ئەوەی خوا پێی خۆشە جێبەجێی بکەی.[1]

## ٩-ئارامگرتنی جوان و تەواو:

ئارامگرتنی جوان، ئارامگرتنێکە گازندەی تێدا نیە، یەعقوب (علیه السلام) دەڵێ وەك خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ یوسف ٨٦.

واتە: من باسی خەم و پەژارەی خۆم هەر لای خوا دەکەم. وە دەفەرموێ:

﴿فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ﴾ یوسف ١٨ .

سکاڵا بۆلای خوا و داوای بەهانا هاتن دژایەتی نیە لەگەڵ ئارامگرتنی جوان، یەکێك لە دوعاکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بریتیە لە:



(اللهم اليك اشكو ضعف قوتى وقلة حيلتي وهوانى على الناس, انت رب المستضعفين وأنت ربى اللهم الى من تكلنى, الى بعيد يتجهمنى, أو الى عدو ملكته أمرى؟ ان لم يكن بك على غضب فلا ابالى, غير أن عافيتك هى اوسع لي اعوذ بنور وجهك الذى أشرقت له الظلمات, وصلح عليه امر الدنيا والاخرة ان ينزل بى سخطك او يحل على غضبك, لك العتبى حتى ترضى) السيرة النبوية لأبن هشام (ج۲ ص٢١٦)

عومەری کوری خطاب (رەزای خوای لیٚ بیٚت) لە نوێژی بەیانیدا:

﴿إِنَّمَآ أَشْكُواْ بَثِّى وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ یوسف ٨٦.

دەخوێند وە دەگریا تا کۆتایی ریزی نوێژکەران گوێیان لیٚ دەبوو، بە پێچەوانەی هانابردن بۆ درووستکراوەکان.

لە نەخۆشی سەرەمەرگدا بە ئیمام (احمد)یان گوت کە (طاووس) نالاَندنی نەخۆشی پێناخۆش بووە و گوتویەتی ئەوە گازندەیە، بۆیە نەینالاَند تا وەفاتی کرد.

سکالاَ و داوای بەهانا هاتن بە زمانی حالْ یان بۆ لاچوونی نارەحەتیەکە یان بەدەست هاتنی قازانجێك، بەندەش فەرمانی پیٚ کراوە تەنها داوا لەخوا بکات نەك لە خەلْکی. خوا دەفەرمویٚ:

﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝٧ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب﴾ الشراح ٧ - ٨.

وە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسم) بە (ابن عباس)ی فەرموو :

( اذا سألت فاسأل الله. واذا استعنت فاستعن بالله) رواه الترمذي، وقال حديث حسن صحيح[1] .

## ١٠- بنچینەکانی خواپەرستی:

خواپەرستی و فەرمانبەری و بەردەوامی و پەیوەست بوون بەڕێی ڕاست و .. چەند ناوێکن کە مەبەست لێیان یەك شتە، کە دوو بنچینەی هەن:- یەکەم:هەر خوا بپەرسترێ، دووەم: بەپێی فەرمانی خوا، بپەرسترێ نەك بەشێوەیەکی داهێنراو. خوا دەفەرموێ:

﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾ الکهف ١١٠.

وە دەفەرموێ:

﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ البقرة ١١٢.

کردەوەی باش چاکەکاری (احسان)ە، کە بریتیە لە ئەنجامدانی چاکەکان، چاکەکانیش ئەوانەن کە خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیە وسلم) خۆشیان دەوێ و فەرمان بە واجب بوون یان پەسەند بوونی کراوە، بەڵام ئەوەی داهێنراو (بدعة)یە و ڕەوا نیە، خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان ناوێ و لە کردەوە باشەکانین، هەر وەک یەکێک کردەوەی ناشیرن و ناقۆڵا بکات بەکردەوەی باش ناژمێردرێ. وەك دەفەرموێ : (ولایشرك بعبادە ربە احدا) و (أسلم وجهه لله) ئەوە یەکلابوونەوەی ملکەچی یە بە تەنیا بۆ خوا و تەنها ئەو مەبەست بوونە. عومەری کوری خطاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیگوت: (اللهم اجعل عملی کله صالحا، واجعله لوجهك ولا تجعل لأحد فیه شیئا) واتە: خوایە هەموو کردەوەکانم چاك بکەی، وای لێ بکەی بە تەنیا بۆ تۆبێ، بەشی کەسی دیکەی پێوە نەبێ.

(فضیل کوری عیاض) لە تەفسیری - أحسن عملا - لە ئایەتی:

﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك ٢.

دەڵێ: (ای اخلصه واصوبه) واتە: تەنیا مەبەست پێ خوا و بەپێی دینی خوا بێ. لێیان پرسی ئەی (ئەبا عەلی) ئەوە مانای چیە؟ وتی: هەرچەندە کردەوە



بەتەنیا بۆ خوا و مەبەست ئەوبێ، بەڵام بەپێی فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەبێ ئەوە قبوڵ نیە، بەڵکو کاتێك تەواوە کە بەتەنیا بۆ خوا و بەپێی فەرمانی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بێ.[1]

## ١١- زوهد و دنیا بەکەمگرتنی دروست:

بە کەمگرتن و لێگرتنەوەی دروست و بەسوود ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆشیان بوێ و لە شتێکدابێ کە سوودی نەبێ لە دوارۆژدا، بەڵام زوهد و لێگرتنەوەیەك لە شتێکدا بکرێ کە سوودی بۆ قیامەت هەبێ و پشتی پێ ببەسترێ بۆ ئەوێ، ئەو زوهد و لێگرتنەوەیە خراپ و نادروستە بەڵکو پێویستە زوهد لە شتێکدا بکرێ کە کردنی زیانی هەیە، یان لانی کەم سوودی نەبێ، بەڵام زوهد لە شتی باشدا نەزانی و سەرلێشێواویە، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

(احرص علی ماینفعك واستعن بالله ولا تعجز) رواه مسلم (٦٧٧٤).

واتە: داکۆکی بکە لەسەر ئەوەی سودت پێ دەگەیەنێ - لەدوارۆژدا- و داوای یارمەتی هەر لە خوا بکە و دەستە پاچە مەبە.

ئەوەی بەسوودە بۆ بەندە بریتیە لە خواپەرستی و فەرمانبەری خوا و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) وە هەرشتێك لەوە لای بدا زیانە و سوودی نیە، کە باشتر بۆ وی ئەوەیە هەموو کردەوەکانی خواپەرستی و فەرمانبەری بن بۆ پەروەردگار.

## ١٢- بەلا و گرفتە نەفسیەکان و خۆپاراستن لێیان:

شیخ الاسلام دەڵێ: بەهەمان شێوە سەبر گرتن لەسەر ئەو ئازار و ناخۆشیانەی تووشی ئینسان دەبن بەهۆی کردنی تاعەتەکان وەك: نوێژ، فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە، وەدەستخستنی زانیاری و... گەورەترە لەو سەبر گرتنەی لەسەر

---

(١) مجموع الفتاوی ١٠/ ١٧٢ - ١٧٤

شتی کەمتر دەیگرێ، بە هەمان شێوە ئەگەر نەفسی بانگی کرد بۆ شتی حەرام لە داواکردنی پلە و پایە و ماڵ وەسەریەکنان و کردنی شتی دزێو و ناقۆڵا و داوێن پیسی و... سەبر گرتن لە بەگوێ نەکردنی نەفس و دوورکەوتنەوە لێیان گەورەتر و باشترە لەسەبرگرتن لەسەر ئەو شتانەی لەخوار ئەوانەوەن، هەموو کارێکی باش تا گەورەتر بێ سەبرگرتن لەسەری گەورەترە.

## سەبر و ئارامگرتن لەگەڵ هەبوونی تواناد‌ا جیهادە بەڵکو لەسێ لاوە گەورەترین جیهادە:

أ- ئارامگرتن لەسەر تووش نەبوونی گوناهو تاوانەکان گەورەترە لە ئارامگرتن لەسەر بەڵا و مصیبەتەکان.

ب- نەکردنی شتە حەرامەکان لە کاتێکدا نەفس داوای بکات و توانای کردنیشی هەبێ گەورەترە لەوەی بەو شێوەیە نەبێ.

ج- ئەگەر نەفس مەیلی حەرامی کرد بەهۆی کارێکی دینییەوە، وەك یەکێك بۆ نوێژ یان جیهاد یان وەدەستخستنی زانیاری دەربچێ و لە میانی ئەوەدا خەریکبێ تووشی گوناح بێ. لەوکاتەدا سەبر گرتن، ئەنجامدانی کاری باش و وازهێنانە لە خراپە.

بەڵام ئەوەی لەمیانی کردەوەی باشدا نیە کە مەیلی خراپە دەکات و سەبر دەگرێ، ئەوە پاداشتی کەمترە.[1]

---

(١) مجموع الفتاوى ١٠/٥٧٥.

## پێنجەم: شارەزایی (شیخ الإسلام) لە سیرە و مێژوودا

هەرچەندە زانستی مێژوو لە تایبەتمەندیی (شیخ الإسلام) نەبووە و ئەو گرنگییەی بە زانستەکانی دیکەی داوە و بۆی لواوە بیانخوێنێ، ئەوەندە خەریکی مێژوو نەبووە و بۆی نەگونجاوە، بەڵام ئیمام (ذهبي) کە یەکێك بووە لە مێژوونووسانی شارەزا، لەو بارەوە باسی (شیخ الإسلام) دەکا و دەڵێ: (وأما معرفته بالتاريخ والسير فعجب عجيب)[1]. واتە: بەڵام شارەزایی نابراو بە سیرەو مێژوو جێی سەرسوڕمان بووە.

(ابن قيم الجوزية) بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنەر لە کتێبی (زاد المعاد) سەبارەت بە زانیاری (شیخ الإسلام) بە مێژوو دەگێڕێتەوە و دەڵێ: دوای ئەوەی لە هێندێك لە وڵاتان سوننەت و کەسانی شارەزا لەوبارەوە، دژایەتی کران و دەنگیان خامۆشکرا، کۆمەڵێك لە (یەهود) کتابێکیان دەرکرد و وەك نووسراوێکی کۆن دەریانخست کە پڕیانکردبوو لە درۆ و شتی هەڵبەستراو ئەوەی تێدابوو کە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەرانە (جزية)ی لەسەر یەهودی خەیبەر هەڵگرتوە، بە شایەدیی (علی کوڕی ئەبی طالب) و (سەعدی کوڕی موعاذ) و چەند هاوەڵێکی دیکە (رەزای خوایان لێبێت) لای کەسانێکی نەشارەزا بە سوننەت و غەزا و ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو شتەیان رەواج پێ دا و وایان دەزانی ئەوە راستە، بەڵام (شیخ الإسلام) بە چەند بەڵگەیەك درۆکانی ئەو کتێبەی دەرخست لەوانە:

أ- باس لە شایەدیی (سەعدی کوڕی موعاذ) دەکات کە پێش (خیبر) وەفاتی کردوە.

ب- ئەو کاتەی ئەو کتێبە باسی دەکات، حوکمی سەرانە (جزیة) نەهاتبووە خوارێ و هاوەڵانیش نەیاندەزانی، چونکە دابەزینی لەساڵی (تبوك) دا بە سێ ساڵ دوای خەیبەر بووە.

ج- ئەو کتێبە هیچ کام لە زانایان بە جیاوازیی پسپۆڕییان و پسپۆڕانی بواری ژیاننامە و زانایانی حەدیس و سوننەت و، هیچ کام لە شارەزایانی فیقهو فتوا و زانایانی تەفسیر باسیان نەکردوە و لە سەردەمی پێشینیش دەریاننەخستوە..[1].





بەشی دەیەم

# کۆچی دوایی (شیخ الإسلام)

(ابن فضل الله العمري) لە باسکردنی (شیخ الإسلام) دا دەڵێ: دوای ئەوەی لە ناو بەندیخانە کتێب و پەڕ و کاغەز و قەڵەمیان لێ سەند، (شیخ الإسلام) خۆی بە قورئان خوێندن و عیبادەتی دیکەی شەخسی یەوە خەریک کرد، بەڵام لێ سەندرانی ئەو شتانەی زۆر لەسەر دڵ قورس بوو، دوای ئەوە تووشی نەخۆشی هات و زۆری نەبرد وەفاتی کرد...[1].

لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا (نائیبی دیمەشق) ویستی لە بەندیخانە سەردانی بکا و داوای کرد رێی بدات بچێتە لای، ئەویش رێی پێدا، چوو بۆلای و لە تەنیشتیەوە دانیشت، عوزری بۆ (شیخ الإسلام) هێنایەوە و داوای عەفووی لێ کرد لە هەر کەمو کورییەک کە لە لایەن ئەوەوە رووی دابێ، (شیخ الإسلام) یش وەڵامی دایەوە و گوتی: (اني قد أحللتك وجميع من عاداني، وهو لايعلم أني على الحق، واحللت السلطان المعظم الملك الناصر من حبسه اياي، لكونه فعل ذلك مقلدا معذورا، ولم يفعله لحظ نفسه، وقد أحللت كل أحد مما بيني وبينه الا من كان عدوا لله ورسوله)[2].

واتە: من گەردنی تۆو هەموو ئەوانەم ئازاد کردوە کەدژایەتییان کردووم، کە نەیانزانیوە من لەسەر حەقم، وە گەردنی سوڵتانی گەورە مەلیك (ناصر)یشم ئازادکردوە کە منی حەپس کردوە، چونکە عوزری هەیە و تەقلیدی فتوای گیرانی منی کردوە و، ئەوەی کردوویەتی بەشی نەفسی تێدا نەبووە، گەردنی هەموو کەسم ئازاد کردوە، لەوەی لە نێوان من و ئەودایە، مەگەر یەکێك دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەی بێت (صلی الله علیه وسلم).

## مێژووی کۆچی دوایی (شیخ الاسلام):

ماوەی نەخۆشی سەرەمەرگی (شیخ الإسلام) بیست و چەند رۆژێك بوو، زۆربەی خەڵکی بە نەخۆشیەکەیان نەزانیبوو، ئەو نەخۆشییەی تووشی بوو بەردەوام بوو تا وەفاتی کرد[1]، تێکڕای مێژوو نووسان دەڵێن ناوبراو لە (٢٠)ی (ذي القعدة) ساڵی (٧٢٨)ی کۆچیدا وەفاتی کردوە، تەنیا (المقریزی) و (ابن حجر) دەڵێن لە (٢٢)ی (ذي القعدة) وەفاتی کردوە.

## هەواڵی وەفاتکردنی (شیخ الإسلام) بڵاوبۆوە:

کە (شیخ الإسلام) لە بەرەبەیانی شەوی دووشەممە وەفاتی کرد بانگدەری سجنی (قەلعە) خەبەرەکەی لەسەر منارە راگەیاند، پاسەوانەکانی سەر بورجەکان خۆبەخۆ باسیان دەکرد، کە رۆژ بۆوە وردە وردە ئەو هەواڵە بڵاو بۆوە کە بۆ خەڵکی هەواڵێکی زۆر ناخۆش و لەسەر دڵان قورس بوو، بۆیە دوای بیستنی ئەو هەواڵە، خەڵکی بە هەر رێیەك بۆیان گونجا کشان بەرەو (قەلعە)، قەڵەباڵغییەکی زۆر لە (قەڵعە) درووست بوو، دەرگای (قەلعە) بۆ دۆست و



نزیك و خۆشەویستانی کرایەوە، پۆل پۆل دەچوونە لای جەنازەکەی، هێندێك لە خەڵکەکە ئەو سەر و نێو چاوانەیان ماچ دەکرد کە بۆ خوا دەیخستە سەر زەوی و بۆ ماوەیەکی زۆر بەرزی نەدەکردەوە.

پێش شۆردنی خەڵکەکە خەتمی قورئانیان لەسەر کرد، دوای پیاوان مۆڵەتی ئافرەتانیش درا بچنە لای، لە کاتی شۆردنی دا جگە لەو کەسانەی دەیانشۆرد کەسی دیکە لای نەمان، لەوانەی مانەوە زانای گەورە (المزي) و کۆمەڵێك لە زانا و پیاوچاکانی هەڵبژاردە بوون[١]. خەڵکی لە دەوری قەلعە و سەر رێی نێوان قەلعە و مزگەوتی ئەمەوی دیمەشق کۆبوونەوە، مزگەوتیش پڕبوو لە خەڵك وێڕای حەوشەکەی و (باب البريد) و (باب الساعات)[٢].

## بردنی جەنازەکەی بۆ مزگەوت:

سەرەتا لە (قەلعە) نوێژی مردووی لەسەر کراو (محمد بن تمام) پێش نوێژیی کرد، دوای ئەوە تەرمەکەیان هەڵگرت و بەرەو مزگەوتی ئەمەوی کەوتنە ڕێ، ڕێی نێوان قەلعە و مزگەوت بە خەڵك داپۆشرابوو، جەنازەکە پێش نوێژی نیوەڕۆ گەیشتە مزگەوت لەوێ دانرا، تا دەهات قەڵەباڵغی زیادی دەکرد، خەڵك لە هەموو لایەکەوە هاتبوون، یەکێك لە نێو قەڵەباڵغیەکەدا هاواری کرد و گوتی: مردنی پێشەوایانی ئەهلی سوننەت بەم شێوەیە قەڵەباڵغی دروست دەکا، بە بیستنی ئەو دەنگە خەڵکەکە زیاتر خرۆشا و گریانیان هاتێ، مزگەوت ودەوروبەر بە ئەندازەیەك قەڵەباڵغ بوون کە خەڵك نوێژی دەکرد بە زەحمەت سەجدەیان بۆ دەبرا، قەڵەباڵغی لەم شێوەیە کەم بینرابوو، زۆر لە خەڵکەکە نیەتی ڕۆژوویان هێنا، چونکە لەبەر زۆری خەڵکەکە نانیان چنگ نەدەکەوت.

---

(١) البداية والنهاية ١٤/ ١٣٥ - ١٤٠.

(٢) الشهادة الزكية ٦٤.

دوای نوێژی نیوەڕۆ لەمزگەوتی (ئەمەویی) نوێژی مردووی لەسەر کرایەوە، ئەمجارە (شيخ علاءالدين الخراط) نوێژی لەسەر کرد، دوای نوێژی مردوو، خەڵکەکە لە مزگەوت هاتنە دەرێ، رێ و کووچە و کۆڵانەکان جمەیان دەهات و پڕبوون لە خەڵك، دووکان و بازاڕ و چێشتخانەکان داخرابوون، خەڵکی (الله اکبر) یان دەکرد و چاو بە گریان بوون، ژنان بە درێژایی رێی مزگەوت تا قەبرەستان لە سەربانەکان راوەستابوون و بۆی دەگریان و دووعایان بۆی دەکرد، دەیانگوت ئەو زانا گەورەشمان وەفاتی کرد.

تەرمی (شيخ الإسلام) لەسەر شان و سەری خەڵك و لە نێو هەنسك و گریان و پەرۆشییدا، بەرەو قەبرستان برا، لەبەر خەم و پەژارە و سەیرکردنی جەنازەی (شیخ)، مێزەر لە سەران بەردەبۆوە و هەڵییان نەدەگرتەوە هێندێك جار جەنازەکە پێش دەکەوت و هێندێك جاریش جەنازەکە ڕادەگیرا تا خەڵکەکە تێپەڕ دەبوو، بردیان بۆ قەبرستانی (الصوفية) و لەوێ لە تەنیشت (شرف الدين عبدالله)ی برای ناشتیان، لەبەر ئەوەی خەڵکێکی زۆر دەهات و نوێژیان لەسەر دەکرد ناشتنەکەی دوا کەوت تا کەمێکی مابوو بۆ نوێژی عەسر.

(ژمارەی ئامادەبووانی جەنازەکەی و تا ناشتنی لە(٦٠٠٠٠) شەست هەزار کەس زیاتر بوو، ئافرەتانیش ژمارەیان دەگەیشتە (١٥٠٠٠) پازدە هەزار کەس، جگە لەو ئافرەتانەی لە سەربان و ژوورەکاندا بەیادی ئەوەوە هەناسەیان هەڵدەکێشا، مێژووی دیمەشق قەڵەباڵغی ئاوای بەخۆوە نەدیبوو، مەگەر لە سەردەمی (بني امية) کە خەڵك زۆر بوو، دیمەشقیش پایتەختی خیلافەت بوو)[1].

(لە زانایان ژمارەیەکی کەم نەبێ هەموویان ئامادەی جەنازە و نوێژ لەسەرکردنی و ناشتنی بوون، ئەوانەی ئامادە نەبوون ئەم سێ کەسە بوون: (ابن جملة، الصدر، القحفازي) کە هەرسێکیان ناویان دەرکردبوو لە زۆر دژایەتی کردنی (شيخ الإسلام) دا، هەربۆیە لە خۆیان دەترسان ئەگەر بێنە نێو خەڵکی، خەڵکەکە بیان کوژن، یان لێیان بدەن، زانا و پێشەوای گەورە (برهان الدين الفزاري) سێ رۆژان



لەسەر یەك دوای ناشتنی دەچۆ سەر قەبرەکەی وێڕای کۆمەڵێك لە زانایانی شافیعی مەزهەب، (برهان الدين) بە سواری گوێ درێژێك دەهات و ڕێز و شکۆ و هەیبەتی پێوە دیاربوو)[١].

(ابن رجب) دەڵێ: لە زۆربەی وڵات و شار و نێوەندەکانی نزیك و دوور، نوێژی مردووی بە غائیبی لەسەر کرا لە (یەمەن و چین)یش بەهەمان شێوە، ئەوانەی هاتوچۆی (چین)یان دەکرد، گێڕاویانەتەوە کە لەوپەڕی (چین) لە ڕۆژی جومعەدا بانگهێشتی خەڵکی کراوە کە نوێژی مردوو لەسەر توێژەرەوەی قورئان بکەن[٢].

(ابو حفص البزار) دەڵێ: هەواڵی مردن گەیشتبێتە هەر شار و ئاوەدانییەك، لە هەموو مزگەوتەکان نوێژی غائیبیان لەسەر کردوە بە تایبەتی لە (مصر و شام و عیراق و تبریز و بصرة و ..)[٣].

ئەو هەیبەتەی جەنازەی ئەو هەیبووە و، ئەو ڕێزەی لەو گیراوە کەم وێنە بووە، ئەوەش لەبەر ئەوەی خاوەنی چەندین سیفەتی بەرز بووە.



## ئەوانەی پێیان هەڵاگوتوە لە زانایان:

زۆر لە زانایان بە کۆپلە شیعری جیاواز باسیان کردوە و پێیان هەڵاگوتوە، لەوانە:

١- الحافظ شمس الدين الذهبي.

٢- ابن فضل الله العمري.

٣- ابن الوردي الشافعي.

٤- شيخ علاء الدين بن غانم.

٥- الحافظ ابن عبدالهادي.

٦- المحدث تقي الدين أبو عبدالله محمد بن سليمان الجعبري.

بەو شێوەیە (شيخ الإسلام) لە تەمەنی (٦٧) ساڵی دا کۆچی دوایی کرد و لە ماوەی ژیانی دا توانی خزمەتێکی زۆری ئیسلام و مسوڵمانان بکات و، لە زۆر بواردا وەك سوارچاکی مەیدان دیاربێ و، تەمەنێکی بە بەرەکەت بەرێ بکات و خەڵکێکی زۆر پێ بگەیەنێ، بەهۆی نووسراوەکانیشی لە دوای خۆی لە زۆربەی جیهانی ئیسلامیی دا سوود بە مسوڵمانان بگەیەنێ و، خەڵکی لە زانست و شارەزاییەکەی بەهرەمەندبن.

## هەڵوێستمان بەرانبەر زانایان:

زانایان ئەوانەی لە دین و ژین شارەزان و بە ساغی و بەپێی قورئان و سوننەت هەنگاو دەنێن خاوەن چاکەن، هەر بۆیە خوای بەخشەر ڕێزو پلەو پایەی تایبەتی پێ بەخشیون و بە چاکە باسی کردوون بۆیە پێویستە ئێمەش بەڕێزەوە سەیریان بکەین و ئەو خزمەتە گەورەی کردوویانە ببینین ودوعای خێریان بۆ بکەین، بەڵام پێویستە لەوەش ئاگاداربین و بزانین کە ئەوانیش ئینسانن و ئەگەری لەبیرچوونەوە و کەوتنە هەڵەیان هەیە، بۆیە دوای ئەوەی بە بەڵگە بۆی



دەردەکەوێ و دەزانێ، نابێ هیچ کەس لە هەڵەدا شوێن هیچ زانایەك بکەوێ، وەك (ابن القیم) لەو بارەوە دەڵێ: (اما العالم فلا ینبغي ان یقلد فیما زل فیه، واذ ان الدین لا یؤخذ بالخطا، وان العالم قد یزل ولابد، اذ لیس بمعصوم فلا یجوز قبول کل مایقوله، وینزل قوله منزلة المعصوم)[١].

واتە: (زانا لەو شتەدا کە لێی دەکەوێتە هەڵەوە نابێ کەس شوێنی بکەوێ، چونکە دین بە هەڵە وەرناگیرێ، بێگومان زانا جاروبار دەکەوێتە هەڵەوە جا مادام پارێزراو نیە لە هەڵە، دروست نیە هەرچی دەیڵێ - قسەی هەڵەو بێ هێزیش- لێی وەربگیرێ و قسەکانی بە پارێزراو لە هەڵە دابنرێن) .

بەڵام ئەوەی وتمان پاساوی ئەوە نیە کە زانایان ڕێزیان لێ نەگیرێ و زانیاری و فتوایان لێ وەرنەگیرێ و پلەوپایەی بەرزی زانینیان لەبەر چاو نەگیرێ! چونکە بەوە خەڵك بەگشتی بێ بەش دەبێ لەو هەموو زانیاریە زۆرەی لای زانایانی پێشین و پاشین هەبووە، (الحافظ الذهبي) چەند جارێك لەو بارەوە قسەیەکی (ابو موسی المدیني) دووبارە کردۆتەوە کە گوتویەتی: هەموو زانایەك دەکەوێتە هەڵەوە جا ئەگەر لەبەر ئەو هەڵەیە بە یەکجاری وازی لێ بهێنرێ، ئەوە دەبێ زۆر لە پێشەوایان وازیان لێ بهێنرێ، کە ئەوەش هەڵەیەو نابێ بکرێ[٢].

حیکمەتی کەوتنە هەڵەی زانایانیش ئەوەیە کە هیچ زانایەك وا نەزانێ تێرو تەواوە و کەموکوڕی نیە، بەوە کە ئەگەری کەوتنە هەڵەی هەیە، خۆی لێ نەگۆڕێ و، زانیاری بە تەنیا لە زانایەك وەرنەگیرێ و سەرەنجام دەمارگیریی دروست نەبێ و کەس بەپیرۆز سەیر نەکرێ، وە بۆ ئەوەی مسوڵمانان لە هەموو کاتێکدا بەرەو سەرچاوەی بێ گەرد (قورئان و سوننەت) بگەڕێنەوە و هەنگاو بنێین، کە بەکەڵکی هەموو کات و شوێنێك دێ و قسەی زانایان لە کەس نەبێتە دین.

وەك پێشتریش باسمان کرد زاناو پێشەوایان کە لە ئەنجامی تێفکرین و تێکۆشان بۆ گەیشتن بە حوکمی ڕاستی شەرعی تووشی هەڵە دەبن پاداشتێکیان هەیە - پاداشتی هەوڵ و ماندوو بون و گەڕان بەدوای ڕاستی دا- وئەگەر لە هەوڵ و تێکۆشانەکەشیاندا پێکایان ئەوە دوو پاداشتیان هەن.

لە هەموو حاڵەتەکانیشدا پێویستە زانایان بە هۆی هەقەوە بناسرێن نەك هەق بە ئەوانەوە بناسرێ، کەواتە ڕێزو گەورەیی هەرکەسێك لە نزیکیی وپابەندیی بە شەریعەتەوەیە و هەرشتێك بگوترێ و بکرێ دەبێ بە تەرازووی قورئان وسوننەت هەڵبسەنگێنرێ.

خوای بەخشندە پاداشتی خێروچاکەی (شیخ الاسلام) و سەرجەم زانایانی دیکەی ئیسلام بەچاکترین شێوە بداتەوە،کە لەماوەی ژیانیاندا توانیویانە خزمەتێکی ڕاست وساغی ئیسلام ومسوڵمانان بکەن و لە دوای خۆشیان بە بەرهەمەکانیان خەڵکیان بەهرەمەند کردوە - ئامین -.





# نـــاوەڕۆك



## بـەشـی یـەکـەم





## بەشی دووەم



## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم





## بەشی پێنجەم

## بەشی شەشەم



## بەشی حەوتەم



## بەشی هەشتەم



## بەشی نۆیەم





## بەشی دەیەم

# ئیبنو تەیمییە

ئیبنو تەیمیەی حەڕڕانی، کە لە سەدەکانی حەوت و هەشتی کۆچی ژیاوە، زانایەکی شارەزاو پایەبەرزی ئیسلام و موجتەهیدێکی ڕەهابووە، ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتگیر ڕانواندووە، ئاڵا هەڵگری چاکسازیی و داهێنان و نوێ بوونەوە بووە، لە بەرانبەر بیروراو تێڕوانینی پێڕ و تاقم و مەزهەبە لادەرەکان و ستەم و داگیرکاری تەتاردا، هەڵوێستی شیاوو مەردانەی هەبووە، فەرمانی بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە کردووەو ئەوەی بەڕاستی زانیبێ، بێ سڵەمینەوە لە چوارچێوەی قورئان و سوننەتدا گووتوویەتی و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترساوە.

زانیاریی ناوبراو بە ئەندازەیەك فراوان و جێی متمانەبووە، کە مسوڵمانان لە زۆر شوێنی ئەم زەمینە، بەجیاوازی ڕەنگ و ڕەگەز و زمان و نەتەوەو مەزهەبە فیقهیەکانەوە، سوودیان لە بەرهەمەکانی بینیووە و بەڕێزەوە سەیریان کردووە.

بەڵام بە داخەوە کەسانێکی نەشارەزا بەکەسایەتی ئەو زانا گەورەیە هەن، لە نزیك و دوور، قسەی ناشایستە بەرانبەری دەڵێن، کە لەبری ئەوە دەبوایە لە ڕووی زانیاری و شارەزاییەوە، کەسەکان هەڵبسەنگێنین و بەرانبەریان هەڵوێست بنوێنین و تفەنگ بە تاریکیەوە نەنێین، چونکە هەموو کەسێك لە قیامەتدا بارمتەی قسەو کردەوەکانیەتی.




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice
8000 دینار